# سەردەم

78-79

خاوەنی ئیمتیاز
شێرکۆبەکەس



ساڵی پانزەهەم هاوینی ٢٠١٤
گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕان و کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

سەرنوسەر
ڕێبین هەردی
سکرتێری نوسین
هەورامان وریا قانع
دیزاین
ئارام عەلی
تایپ و هەڵەچنی
ڕێبوار سەدرەدین

www.sardem.org
govarysardsm@yahoo.com

## فیکر و فەلسەفە



## وتارو لێکۆڵینەوە



## ئەدەب و هونەر



## چاوپێکەوتن



## وێستگەکانی سەردەم



## بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم



# چەمکی (ئازادی)

د. مەنسور میرئەحمەدی

**لە فارسییەوە: کارزان محەمەد**

دەروازەیەک

چەمکی ئازادی کە هەندێ لە نوسەران پێیانوایە لە زاراوەی (ئەزاتە)ی ئاڤێستایی وەرگیراوە، بە مانای جۆراوجۆری وەک (سەربەستی، دەسەڵاتی کار یاخود نەکردنی کارێک، دەسەڵاتیهەڵبژاردن، ڕەهایی، شادی، بەختەوەری...) بەکارهێنراوە.

ئەم چەمکە لە زمانە جۆراوجۆرەکاندا بە شێوازی جیاواز بەکاردەهێنرێت. هاوماناکەی لە زمانی عەرەبیدا چەمکی (حر) و لە زمانی عیبریدا (حور) و لە سریانیدا (حیر) و لە زمانی لاتینیدا (libertas) و لە زمانی فەرەنسیدا چەمکی (librete)ە. لە زمانی ئینگلیزیشدا هاومانای بۆ چەمکی ئازادی،

هەردوو زاراوەی (Freedom) و (liberty) بەکاردێت. وێڕای تێگەیشتنی جیاواز، (ئازادی) چەمکێکی یەکگرتووی هەیە کە لە سەرجەم تێگەیشتنەکانی پێشوودا خۆی نواندووە. بەم چەشنە، (ئازادی) سێ بنەمای بنەڕەتی هەیە کە ماناکەی پێکدەهێنن:

١- بکەر: ئازادبوونی کێ؟.

٢- لەمپەر: ئازادبوون لە چ شتێک یاخود لە کێ؟.

٣- ئامانج: ئازادی لەپێناو چ ئامانجێکدا؟.

بەگوێرەی ئەم سێ بنەمایە، دەتوانین ئەم چەمکە بەو چەشنە پێناس بکەین: «ئازادی کەسێک یاخود کۆمەڵێک کەسە لە کۆتوبەندی کەسێک یاخود کۆمەڵێک کەسیتر لەپێناو ئەنجامدانی کار و ڕەفتارێکی تایبەتی».

ئەم بنەمایانە لەلایەن (مەک کالۆم)ی نووسەری خۆرئاواییەوە بەم چەشنە بە گوزارشتێکی پوخت خراوەتەڕوو:» X free Y to do or be Z». بەپێی ئەم گوزارشتە، بنەمای (X) بریتییە لە (بکەر)، (Y) لەمپەرەکەیە و (Z) ئامانجە. لەم دیدگایەوە، تێگەیشتنی جۆراوجۆر بۆ چەمکی ئازادی بە جەختکردنەوە لەسەر یەکێک لەم بنەمایانە هەیە، کە گرنگترینیان پۆلێنکردنی ئازادییە لەلایەن (ئەیزایا بەرلین) ەوە بۆ هەردوو ئازادی پۆزەتیڤ و نیگەتیڤ.

لە ڕوانگەی (بەرلین)ەوە، ئازادی نیگەتیڤ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەدرێتەوە: «ئەو چوارچێوەیە چییە و هەتا کوێیە کە لەناو ئەو سنورەدا کەسێک یاخود کۆمەڵە کەسێک بە کردەوە تیایدا ئازادن یاخود پێویستە ئازادییان هەبێت تا بەبێ دەستوەردانی کەسانیتر، ئەوەی دەیانەوێ ئەنجامی بدەن و بەو چەشنە بن کە خۆیان دەیانەوێ؟». لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەوترێت: «مرۆڤ تا ئەو شوێنە ئازادە کە کەسانیتر دەست لە کارەکانی وەرنەدەن».

لەکاتێکدا لە ڕوانگەی ئەیزایا بەرلینەوە، ئازادی پۆزەتیڤ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دێتەئارا: «سەرچاوەی کۆنترۆڵ یاخود چاودێری کە کەسێک ناچار بکات بە شێوازی تایبەتی کار بکات یاخود بەشێوازێکی دیاریکراو بزانرێ چییە و کێیە؟». لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا، ئازادی پۆزەتیڤ دێتەئاراوە کە بەمانای (خاوەندارێتی لە بڕیاردان و خاوەندارێتی خود) دێت.

هەروەک دەبینرێت لەم دوو بەشەی ئازادیدا بە جەختکردنەوە لەسەر یەکێک لەم بنچینانەی سەرەوە، تێگەیشتنێکی تایبەتی فۆرمەڵە بووە. جەختکردنەوە لەسەر بنەمای (Y) واتا لەمپەری بەردەم فۆرمەڵەبوونی ئازادیی نیگەتیڤ و جەختکردنەوە لەسەر بنەمای (Z) واتا ئامانج، دەبێتەمایەی لەدایکبوونی ئازادییەکی پۆزەتیڤ.

چەمکی (ئازادی) بە شێوازی هەمەچەشن و بە مانای جۆراوجۆر بەکارهێنراوە کە گرنگترینیان بریتین لە: ڕەهەندی فەلسەفی، ڕەهەندی سیاسی، ڕەهەندی یاسایی و ڕەهەندی ئاکاری (ئیتیکی).

لە ڕوانگەی فەلسەفییەوە، ئازادی بە مانای (ئارەزوومەندانەیە) لەهەمبەر (ناچاری و زۆرەملێ)دا.

لە دیدگای سیاسییەوە، ئازادی بە مانای توانای

تاکەکەسە لەڕووی مافە مەدەنی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانەوە لەهەمبەر دەسەڵات و کۆمەڵگادا.
لە ڕووی یاساییەوە، ئازادی یەکێکە لە مافە بنچینەییەکانی مرۆڤ و گرەنتی وەدیهێنانیشی جێگەی بایەخە.
لە سۆنگەی ئیتیکیشەوە، بەمانای دەربازبوونە لە بەڵێن و کۆتوبەندی ژیانی ڕۆژانە و وازهێنانە لە حەز و ئارەزوو.

## * شرۆڤەیەکی مێژوویی

ئازادی یەکێکە لە کۆنترین ئەو چەمکانەی لە فەرهەنگی هزری مرۆییەوە هاتۆتەئارا. ئەم زاراوەیەش لە بواری هزری خۆرئاوا و هەم لە بواری فکری خۆرهەڵاتدا، یەکێکە لە پرەنسیپە بنچینەییەکانی بیری مرۆیی کە جێگەی بایەخی بیرمەندان و تیۆریستەکانە.

## – ئازادی لە بیرو وهزری خۆرئاوادا:

هەرچەندە ئازادی لە مەیدانە جۆراوجۆرەکانی بیر و هزری خۆرئاوادا خراوەتەڕوو، بەڵام لە بواری فەلسەفەی سیاسی بایەخی زۆری پێدراوە. بەتایبەتی لە مۆدیلە جۆراوجۆرەکانی لیبراڵیزمدا، ئازادیی سیاسی گرنگترین بنچینە و تایبەتمەندییە.
یەکێک لە پرسیارە بنەڕەتییەکان لە فەلسەفەی سیاسی خۆرئاوا لە چاخە کۆنەکانەوە تا ئەمڕۆ، پەیوەندی نێوان تاکەکەس و کۆمەڵگایە یاخود تاکەکەس و دەوڵەت بووە. هەرکام لە فەیلەسوفانی سیاسی لە دیدێکی تایبەتییەوە لەم پرسیارە بنەڕەتییە دەنۆڕن و وەڵامێکی تایبەتیان داوەتەوە.
بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین بەرلە (تۆماس هۆبز)، کۆمەڵێک چەمکی گرنگی فەلسەفەی سیاسی وەک (فەزیلەت) و (دادپەروەری) و پەیوەندیان بە چەمکێکی گرنگیتر واتا (دەسەڵات) بووە، بەڵام بەهۆی (تۆماس هۆبز)ەوە چەمکە بایەخدارەکەی فەلسەفەی سیاسی لە (فەزیلەت)ەوە بەرەو (ئازادی) گوازرایەوە، تائێستاش هەر لەسەر ئەم ڕەوتە ماوەتەوە.
بەمشێوەیە لە سەردەمی (هۆبز)ەوە تائێستا، (ئازادی) وەک چەمکێکی چارەنووسساز لە فەلسەفەی سیاسی خۆرئاوادا، وەڵامی هەمەچەشنەی دراوەتەوە. خاڵی بایەخداری ئەم قۆناغە، بەرجەستەبوونی ڕووخساری سیاسی چەمکی ئازادییە لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەر مەیدانە جۆراوجۆرەکانی هزری خۆرئاوادا هاتووە.
بەناوبانگترین تیۆریستی ئازادی لە فەلسەفەی سیاسی خۆرئاوادا (جۆن ستیوارت میل)ە کە لە ئاقاری نەریتی فکریی شەپۆلی یەکەمی مۆدێرنێتەدا، جەختی لەسەر ئازادیی تاکەکەس کردەوە، بەڵام فەلسەفەی سیاسی خۆرئاوا کە لەڕێگەی خستنەڕووی چەمکی ئازادییەوە دەیویست وەڵامی مەسەلەی پەیوەندی نێوان هاوڵاتی و کۆمەڵگا یاخود هاوڵاتی و دەوڵەت بداتەوە، بەهۆی کۆمەڵێک فاکتەرەوە نەک تەنها نەیتوانی ئازادیی هاوڵاتی لەهەمبەر دەسەڵاتی کۆمەڵگا و دەوڵەتدا بپارێزێ، بەڵکو

دەسەڵاتێکی سەرتاپاگیری لە چوارچێوەی (تۆتالیتاریزم)دا هێنایە ئارا کە تیایدا هاوڵاتی بەتەواوەتی لە دەوڵەتدا توایەوە، شەپۆلی دووەمی مۆدێرنێتەش لەدایک بوو.
شەپۆلی سێیەمی مۆدێرنێتە کە بە (نیچە) دەست پێدەکات، بە وەرچەرخانیشی بەرەو ڕەوتی فکریی پۆست مۆدێرنیزم، چەمکی چارەنووسسازی فەلسەفەی سیاسی لە (ئازادی) یەوە بەرەو (مەرگی بابەت) گۆڕی. لەسەر بنەمای ئەم دیدگا نوێیە، قۆناغی ڕەسەنایەتی تاکەکەس و دوالیزم و جیابوونەوەی بابەت لە خود لە فەلسەفەی سیاسی خۆرئاوادا کۆتایهات و قۆناغی مەرگی بابەت دەستی پێکرد.
لە ڕوانگەی بیرمەندە ناسراوەکانی ئەم قۆناغە وەک (نیچە، هایدگەر، فۆکۆ، لیوتار) لە شارستانییەتی خۆرئاوادا، تاکەکەس ناسنامەی کەسێتی خۆی و ئازادی و سەربەخۆییەکەی لە کۆمەڵگا و دەوڵەتدا لەدەست داوە و بۆتە قوربانی دەسەڵاتی دەوڵەت و کۆمەڵگا.

### – ئازادی لە ئەندێشە وهزری خۆرهەڵاتدا:

لە وڵاتانی خۆرهەڵاتیشدا، ئازادی جێگەی بایەخی بیرمەندان و تیۆریستان بووە.
بە گوتەی فرانس رۆزنتاڵ: «دێرینترین پێناسی ئازادی لە خۆرهەڵاتی نزیکدا، لە بەرهەمێکی سریانی لە نوسینی میشیل یاخود بازوز ناوێکدا بەرچاو دەکەوێت کە نزیکەی (٨٠٠) ساڵ لەمەوپێش نووسراوە. لەو قۆناغەدا بیرمەندانی مەزهەبی بایەخیان بە ئازادی وەک یەکێک لە مەسەلە بنەڕەتییەکانی ئیتیکی مرۆیی داوە. بۆ نمونە (ئەفریمی مەزن) ئازادی بە دیارییەکی مەزنی خوداوەند دادەنێ کە وەک مەزنترین شانازی بە حەزرەتی ئادەم بەخشراوە.
لە بواری هزری ئیسلامیدا لەڕووە فەلسەفی و کەلامییەکەیەوە، بۆ یەکەمینجار باسوخواسی ئازادی لە چوارچێوەی هەردوو چەمکی (ئارەزوومەندانە و ئیرادە)دا لەلایەن موعتەزیلەوە خرایەڕوو. موعتەزیلە لەهەمبەر ئەشاعیرەدا[1] بە جەختکردنەوە لەسەر ئەقڵانییەت و کاری ئارەزوومەندانە، بڕوایان بە سەربەخۆیی مرۆڤ لە کارەکانی و کاریگەرێتییەکەی و سپاردنەوەی هەموو شتێ بە مرۆڤ هەبوو.
لە فەلسەفەی ئیسلامی کۆندا، (ئازادی) پتر لە ڕەهەندە فەلسەفی و کەلامییەکەیەوە بایەخی پێدەدرا، بەڵام لە قۆناغی هاوچەرخدا بەهۆی هەلومەرج و پێداویستییە نوێیەکانەوە، ڕەهەندی سیاسیانەی ئازادی لە فەلسەفەی سیاسی ئیسلامدا بەرجەستەتر دەبێت و بایەخێکی تایبەتی بە پێوەرەکانی ئازادیی سیاسی دەدرێت.

## *ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی ئازادی

### ١–ئازادی فەلسەفی:

هەروەک ئاماژەمان بۆ کرد، چەمکی ئازادی لەم ڕەهەندەیەوە لە چوارچێوەی مشتومڕی

1 ئەشاعیرە ئاماژەیە بۆ قوتابخانەی ئەشاعیرەی ئەبولحەسەنی ئەشعەری، بەمانا گشتییەکەی بە ئەهلی سوننەت دەوترێ کە لەهەمبەر عەقڵگەراکانی موعتەزیلەدا، زیاتر جەختیان لەسەر نەقڵ (واتا قورئان و سوننەت) دەکردەوە. خودی ئەبولحەسەنی ئەشعەریش دەیویست لەنێوان ئەقڵ و نەقڵدا، ڕێگایەکی مامناوەند بگرێتەبەر (و-ک).

(ناچاری و ئارەزوومەندانە[2] و ئیرادە)دا دێتەئارا. ئازادی لە چەمکی (ئارەزوومەندانە)دا بەم مانایەیە کە مرۆڤ لە ئەنجامدانی کار و ڕەفتارەکانی خۆیدا ئارەزوومەندە و ناچار نییە. بە گوتەی مورتەزا موتەهەهری: «لێکۆڵیاران و زانایانی ئیسلامی لەو بڕوایەدان گەردوون مەسەلەیەکی ناچارییە و ئاورتە نییە، لەهەمانکاتدا مرۆڤ لە کار و کاریگەرییەکانی خۆیدا سەربەخۆ و ئازادە و ئەوپەڕی ئازادیی بۆ مرۆڤ هەیە، ئەم ئارەزوومەندی و ئازادییە لەگەڵ زەروورەتی گەردووندا ناتەبا نییە».
لەهزری ئیسلامیدا، مرۆڤ هەر لە پەیدابوونییەوە بوونەوەرێکی ئارەزوومەندە لە بڕیاردا و خاوەنی ئیرادەیەکی ئازادە، واتا لە پێگە و هەلومەرج و بارودۆخە جۆراوجۆرەکاندا، توانای هەڵبژاردنێکی ئازادانەی هەیە و دەتوانێ هەرچۆنێک خۆی دەیەوێت، ڕەفتار بکات».
لە هزری فەلسەفی خۆرئاواشدا، ئەم ڕەهەندە وەک بنەمایەکی مەعریفی ئازادی مرۆیی لە هزری زۆرینەی بیرمەندەکاندا هەیە، بۆ نمونە هیگڵ ئەوەی خستۆتەڕوو کە ئازادی بریتییە لە زەروورەتی پرۆسەی مێژوویی، هەرکەسێک لەوە تێبگات چ ڕوودەدات و بۆچی ڕوودەدات، ئەوا بەهۆی ئەم تێگەیشتنەیەوە ئازاد دەبێت.

## ٢-ئازادی یاسایی:

ئازادی لەم ڕەهەندەوە وەک یەکێک لە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ هاتۆتەئارا. ئازادی لە مۆدیلە جیاوازەکانیدا (واتا ئازادیی بیروباوەڕ و بیر وهزر و ڕادەربڕین و ئازادی لە کۆبوونەوە و بەشداریی تیایدا، ئازادی قەڵەم و ڕۆژنامەگەری) یەکێکە لە مافە گرنگە مرۆییەکان کە لە جاڕنامەی جیهانی بۆ مافەکانی مرۆڤ و ڕێککەوتنامەی نێودەوڵەتی بۆ مافە مەدەنی و سیاسییەکاندا، جەختی لەسەر کراوەتەوە.
وێڕای ئەو بابەتانەی ئاماژەی بۆ کرا، لە دیدگای یاساییەوە دەشێ کۆمەڵێک پێوەری تر بۆ ئازادی یاسایی بخەینەڕوو وەک ئازادی (کار، نیشتەجێبوون، چالاکی ئابوری) کە سەرجەمیان دەچنە سنوری ئازادییەوە.
لەم ڕەهەندەوە، وێڕای باسکردن لە پێوەرەکانی ئازادی وەک مافێکی بنچینەیی، کۆمەڵێک قەدەغەشی تێدایە وەک ڕێگەگرتن لە دەستدرێژی بۆ سەر سنوری ئازادی و پێشێل کردنی مافی کەسانی تر، گرنگترین ئەم قەدەغانەش لەڕێگەی زیندانی و سزادانەوەیە.

## ٣-ئازادی ئاکاری (ئیتیکی):

لە ڕەهەندی ئاکارییەوە، ئازادی بە مانای خواست و ئیرادەیەکی پەسەندانەیە لەلایەن مرۆڤەوە لە کاری چاکە و کۆنترۆڵی ئارەزووەکانی و خۆپاریزی لە بەرپرسیارێتی و کۆتوبەندی ژیانی ڕۆژانە و حەز و خولیاکانی، دوورکەوتنەوەیە لە شەڕ و خۆپارێزییە لە کاری خراپ، خۆدوورخستنەوەیە لە نەزانی و حەز و ئارەزوو.
حەز و ئارەزوو، مرۆڤ کۆیلە دەکات و

2 ئەم دوو وشەیەم لەبەری (اجباری و اختیاری) بەکارهێناوە، چونکە بەداخەوە لە زمانی کوردیدا گرفتمان لە زاراوە فەلسەفییەکاندا هەیە (و-ک).

خۆپارێزیش مرۆڤ ئازاد دەکات. سوقراتی فەیلەسوف لەمبارەیەوە دەڵێت: «ئازادی واتا مرۆڤ خۆی لە کۆیلایەتی ئەو حەز و ئارەزووە ئاژەڵییانە ڕزگار بکات کە لە دیدی ئەقڵەوە نەشیاون».

٤-ئازادی سیاسی:

تائێستا پێناسی جۆراوجۆر بۆ ئازادی سیاسی خراوەتەڕوو، بۆ نمونە: ئازادی سیاسی واتە تاکەکەس بتوانێ لە ڕێگەی هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران و بەرپرسانی سیاسییەوە، بەشداریی لەژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی وڵاتەکەیدا بکات، دەرفەتی وەرگرتنی بەرپرسیارێتی گشتی و سیاسی و کۆمەڵایەتی وڵاتەکەی بۆ برەخسێ. لەنێو کۆمەڵگاشدا، ئازادانە بۆچوون و بیروڕاکانی خۆی بەشێوازێکی شیاو دەرببڕێت.

هەروەک دێتەبەرچاو، لە ئازادیی سیاسیدا جەخت لەسەر فەراهەمکردنی زەمینەی بەشداریی جەماوەر لە کۆمەڵگادا کراوەتەوە.

بەپێی ئەم پێناسانەی سەرەوە، ئازادیی سیاسی واتا بەکارهێنانی ئەو ئامرازانەی کە لەو ڕێگایەوە جەماوەر بتوانن لە ژیانی سیاسی خۆیاندا کاریگەرییەکی پراکتیکیان هەبێت.

بە گوێرەی ئەو پێناسە گشتییەی بۆ ئازادی خستمانەڕوو و بەپێی گشتاندنیشی بەسەر ئازادیی سیاسیدا، ئەوەمان بۆ ڕۆشن دەبێتەوە کە بنەمای (Y) کە لەمپەرەکەیە، زیاتر دەوڵەت و حکومەتە. بنەمای (Z) کە ئامانجەکەیە، بریتین لەو ئامانجانەی هاوڵاتیان لە ڕەفتاری سیاسیی خۆیاندا دەیانەوێ بیهێننەدی.

هەندێک لە گرنگترین پێوەرەکانی ئازادیی سیاسی بریتین لە:

– ئازادی هەڵبژاردن و مافی دەنگدان: هەڵبژاردنی دەسەڵاتدار و حکومەت و بەشداریی جەماوەری لە پرۆسەی بڕیاردانی سیاسیدا، گرنگترین ئەو ڕەفتارە سیاسیانەن کە لەکاتی نەبوونی لەمپەر لەبەردەم ئەم زەمینەیە، ئەوا ئازادی هەڵبژاردن و دەنگدانیش فۆرمەڵە دەبێت.

– ئازادی ڕادەربڕین: یەکێک لە ڕەفتارە سیاسییەکانی جەماوەر، خوڵقاندنی کاریگەرییە لە ڕێگەی دەربڕینی بیروبۆچوونەکانیان لەسەر بڕیار و میکانیزمی کاری دەوڵەت و حکومڕانان کە بە ئازادی ڕادەربڕین و قەڵەم و ڕۆژنامەگەری ناودەبرێت.

– ئازادی پێکهێنانی کۆبوونەوە و دامەزراندنی پارت: ڕەفتارێکی سیاسیانەی تری جەماوەر، ململانێی سیاسییە کە بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین دامەزراندنی ئەنجومەن و کۆبوونەوە و پارتەکان بە گرنگترین ڕێگای ئۆرگانیزەکردنی ئەم ململانێیە دابنێین.

ئەگەر جەماوەر لە پێکهێنانی ئەم کۆبوونەوە و پارتانەدا ئازاد بن و ڕووبەڕووی لەمپەرنەبنەوە، ئەوا ئەم ئازادییە سیاسییە دێتەئارا.

### *چەند ئاماژەیەک

خاڵی یەکەم: ئازادی لە ڕیزی ئەو چەمکانەدایە کە وێڕای پێناسی جۆراوجۆر، هێشتا

زاراوەیەکی نارۆشنە. نەبوونی کۆدەنگییەک و جیاوازی بیروبۆچوون دەربارەی چەمکەکەی و فرەچەشنی لە پێناسەکەیدا، لە ڕیزی ئەو فاکتەرانەدایە کە بۆتە هۆی ئاڵۆزی ئەم چەمکە و خراپ بەکارهێنانیشی.
لەمڕووەوە لە بەکارهێنانی چەمکی ئازادیدا، پێویستە سەرەتا بایەخ بە چەمک و تێگەیشتن بدرێت.

خاڵی دووەم:
خاڵی گرنگیتر ئەوەیە کە ئازادی ڕەها و بێ سنور دەبێتە مایەی لەناوبردنی خودی ئازادی. لەمڕووەوە ئەو چەمکە لە هیچ قوتابخانەیەکی فکری و هیچ سیستەمێکی سیاسیدا ڕەها نییە، بەڵکو چوارچێوەیەکی تیۆریی تایبەتی لەهەمبەردا کێشراوە. هەریەک لە (ئازادی کەسانیتر) و (یەکسانی) و (ئاسایشی کۆمەڵگا) لە هزر و قوتابخانە جۆراوجۆرەکاندا، لە ڕیزی سنورە تیۆرییەکانی ئازادیدان.

---

**سەرچاوە: د.مصور میراحمدی: درأمدی بر مکاتب و اندیشەای معاصر. تەران چاپ اول ۱۳۹۰. ص (۷۰۱٤).**



# ئایا یەکسانی سیاسی ئامانجێکی مەعقولە؟

## ڕۆبەرت ئەی دال

**لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی**

ئەگەر بمانەوێت سەبارەت بە دوو گریمانە قسە بکەین کە لە وتویژە گشتیە مەعقول و ئازادەکاندا ئەستەمە ڕەدیان بکەینەوە، ئەوا یەکسانی سیاسی و دیموکراسی نمونەیەکی زۆر باش ئەبن. یەکەمیان بە داوەرێکی ئەخلاقی ئەژمێرێت کە بەپێی ئەوە هەموو مرۆڤەکان بەهایەکی یەکسانیان هەیە. هیچ کەسێک خۆبەخۆ لەوی تر بەرزتر نیە و ئەبێت چاکە و بەرژەوەندی تاکەکان، بەیەک ئەندازە ڕەچاو بکرێت. با ئەمە ناوبنێین گریمانەی "یەکسانی زاتی".

هەر ئەوەندەی کە ئەم داوەریە ئەخلاقیەمان قەبوڵکرد، ڕاستەخۆ پرسیارێکی کێشەئامێز دێتە ئاراوە: چ کەس یان گروپێک زۆرترین دەسەڵاتی بۆ دیاریکردنی چاکە یان بەرژەوەندی ڕاستەقینەی تاکەکان هەیە؟ بێگومان وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بەپێی هەلومەرج و جۆری بڕیارەکان و ئەو تاکەکەسانەی دەرگیری مەسەلەکانن، جیاواز ئەبێت. بەڵام گەر باسەکە تەنیا لەسەر یەک وڵات بێت، ئەوکاتە هەستئەکەم دڵنیاترین و وریاترین گریمانە بەمشێوەیە ئەبێت: هیچ تاکەکەسێکی کامڵ بەدیاریکراوی، بە بەراورد بەوانی تر، خاوەنی ئەو سیفەتە باڵاترانە نیە کە بتوانرێت ڕاستەوخۆ و بە تەواوی جڵەوی شتەکانی پێبدرێت.

ئەگەرچی ئەکرێت بە شێوەیەکی مەعقول بە زیادکردنی هەندێک بەند، ئەم حوکمە بگۆڕێت و چاکبکرێت، بەڵام لەبەر سێ هۆ بەرگریکردن لە حوکمی لەبنەڕەتەوە جیاواز لەم حوکمە، زۆر کاریکی ئەستەمە: لە پلەی یەکەمدا ئەبێت ئاماژە بۆ ئەو وتە بەناوبانگەی لۆرد ئەکتن بکەین کە دەسەڵات، گەندەڵی ئەهێنێت و دەسەڵاتی ڕەها، بە ڕەهای گەندەڵە. ئەم وتەیەی ئەکتن چەندانجار هێنراوەتەوە و ئاشکراکەری هەقیقەتێکی ڕاستەقینەیە لەبارەی ڕەگەزی مرۆڤەوە. مەبەست و نیەتی فەرمانڕەوایان لە سەرەتای حکومەتدا هەرچیەک بێت، پابەندبونیان بە "ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی گشتی" هێواش هێواش بەجۆریک ئەتوێتەوە کە دواجار "بەرژەوەندی گشتی" لەگەڵ پاراستنی ئیمتیازات و دەسەڵاتی خۆیاندا بەیەک شت ئەزانن. دوهەم، بوونی ئازادی لێکۆڵینەوە و ململانێ بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی هەقیقەت – یان گەر پێتان باشە بۆ دەستگەیشتن بە هەڵسنەگاندنی بەڵگەدار و پاساودار – پێویستە. ئەرگۆمێنەتەکانی جۆن ستیوارت میل لەمبارەیەوە زۆر بەناوبانگە. لەگەڵ ئەمەشدا گەر هاوڵاتیان چاودێریان بەسەر دەوڵەتەوە نەبێت، نەتوانن بە ئازادانە لەبارەی سیاسەتی ڕابەرەکانی خۆیانەوە باسوخواس بکەن، و هەندێکجار دژی ئەو سیاسەتانە بن، ئەگەری زۆر هەیە ئەمجۆرە حکومەتە هەندیکجار زیانی کارەساتئامیز دروست بکات. زۆرێک لە ڕژێمە دەسەڵاتخوازەکانی مۆدێرن، چەندان جار ئەم حاڵەتەیان سەلماندووە. دواجار ئەو نمونە مێژوویە هەستیارانە لەبەرچاو بگرن کە تیاییدا بەشێکی زۆری خەڵک لە مافی هاوڵاتیبوون بێبەش بوون: بەڕاستی ئەمڕۆ کەسێک هەیە بڕوا بەوە بکات کە کاتێک چینەکانی کرێکاران ژنان، کەمایەتیە ڕەگەزی و نەتەوەییەکان لە بەشداریکردنی سیاسی بێبەش ئەکرێن، ئایا دیسان ئەو کەسانەی ئیمتیازی حکومەتکردنیان هەیە، بە ئەندازەی پێویست ڕەچاوی بەرژەوەندیان ئەکەن و پارێزگاریان لێئەکەن؟

دیارە نامەوێ بڵێم ئەو کەسانەی بوونە هۆی زیادکردنی ئاستی یەکسانی سیاسی، ئەم ئەرگۆمێنتانەیان لە خەیاڵدا بووە، بەڵکو تەنیا مەبەستمئەوەیەداوەریەئەخلاقیەکان،پشتگیریەکی زیندوانەتر لە یەکسانی سیاسی ئەکەن، وەک هیوا یان ئامانجێکی خوازراو و مەعقول.

## یەکسانی سیاسی و دیموکراسی

ئەگەر ئەو ئەنجامگیریە بکەین کە یەکسانی سیاسی بۆ بەڕێوەبردنی حکومەت (نەک بە ناچار بۆ هەموو ئەنجومەنە مرۆییەکان) شتێکی خوازراو و داواکراوە، ئەوا هەر ئەبێت وەڵامی ئەو پرسیارە بدرێتەوە کە چۆن ئەکرێت بە یەکسانی سیاسی بگەین؟ بێگومان تەنیا ئەو ڕژێمە سیاسیەی بۆ بەڕێوەبردنی حوکمەت، بە دیموکراسی ناوئەبرێت کە ڕەوایەتی و دەزگا سیاسیەکانی خۆی لەسەر بنەمای بیرۆکەی یەکسانی سیاسی دامەزراندبێت. بۆ ئەوەی ڕژێمێکی سیاسی بە دیموکراسی ئەژمار بکەین، پێویستە چ خەسڵەتێکی سیاسی هەبێت؟

## ئایدیال لەبەرامبەر واقیعدا

هەستئەکەم بە بێ هەڵبژاردنی تێگەیشتنێک بۆ دیموکراسی ئایدیالی، ناتوانین وەڵامێکی قانعپێکەر بەم پرسیارانە بدەینەوە. لەبەرئەوە ئەرستۆ وەسفی سێ شێوە ئایدیالی دەستوری، بۆ پۆلێنکردنی ڕژێمە واقعیەکان بە سودمەند ئەزانی. بەهەرحاڵ وەسفی دیموکراسیەکی ئایدیال، مۆدێلێک بۆ بەراوردکردنی ڕژێمە واقعیە جیاوازەکان ئەخاتە بەردەستمان.
ئەگەر ئێمە وێنەیەکی ئایدیالیامان لەبەردەستا نەبێت کە بەراوردی بکەین بە شتە واقعیەکان، ئەوا توشی بازنەی پوچ یان پێشداوەری پەتی ئەبین. بۆ نمونە لە لایەکەوە لەبەرئەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکان، ئینگلتەرا، فەڕەنسا و نەرویج هەمویان وەک ڕژێمی دیموکراسی ئەناسرێن، ئەوا دەزگا سیاسیە هاوبەشەکانیان، بە دەزگای پێویست و بنەڕەتی بۆ دیموکراسی دائەنرێن، لەلایەکی ترەوە لەبەرئەوەی خاوەنی ئەمجۆرە دەزگایانەن، هەر لەبەر ئەمە بە دیموکراسی ئەژمێرێن.
نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت کە وەسفکردنی ڕژێمێکی ئایدیالی یارمەتی دوو مەبەستی جیاواز و لەهەمانکاتدا پێکەوە، ئەدات. یەکەمیان یارمەتی تیورەی ئەزمونی یان زانستی ئەدات، دوهەمیشیان بە دروستکردنی ئامانجێکی ئایدیالی، یارمەتی داوەریە ئەخلاقیەکان ئەدات. دیارە ڕەنگە ئەمە جۆرێک ئاڵۆزی دروست بکات. چونکە "ئایدیالی بوون" لەشێوەی یەکەمیدا، بەناچار دەلالەت لە "ئایدیالی بوون" لە شێوەی دوهەمیدا ناکات.
لە چوارچێوەی تیورەی ئەزمونیدا، سیستەمێکی ئایدیالی ئەم کاریگەریانەی هەیە: وەسفی شتە دیارەکان یان شێوازی کارکردنی سیستەمی ناوبراو لەژێر ڕۆشنای کۆمەڵێک مەرجی ئایدیالی پڕاوپڕدا. گالیلۆ بە ئەندازەگیری خێرایی گۆیەکی جوڵاو لەسەر ڕوبەرێکی لار، چەند ئەنجامگیریەکی لەبارەی خێرای کەوتنی تەنەکان لە بۆشاییدا (واتە لە هەلومەرجێکی ئایدیالدا) پێشکەشکرد. دیارە ئەوە ڕونە کە ئەو نەیئەتوانی و نەیتوانی ئەندازەگیری خێرایی کەوتنی تەنەکان لە بۆشاییدا بکات. لەگەڵ ئەوەشدا یاسای گالیلۆ لەبارەی کەوتنی تەنەکانەوە تا هەنوکە بایەخی خۆی پاراستووە.

لە لێکۆڵینەوە فیزیایەکانیشدا تۆمارکردنی چەند گریمانەیەک لەبارەی شێوەی ڕەفتاری شت یان هێزێکەوە، لە هەلومەرجی ئایدیالدا شتیکی نامۆ نیە. دیارە لەکاتی تاقیکردنەوە واقعیەکاندا، ناکرێت بەشێوەیەکی کامڵ ئەم هەلومەرجە ئایدیالیە دەستەبەر بکرێت، بەڵام ئەکرێت بەشێوەیەکی قابیلی قەبوڵکردن لێی نزیک بیتەوە. هەر لەبەر ئەمە کاتێک ماکس فیبەری کۆمەڵناسی ئەڵمانی "سێ نمونەی پەتی دەسەڵاتی ڕەوا"ی وەسف ئەکرد "تەنیا ئەتوانین سودمەندی پۆلێنکردنی سەرەوە، لەسەر بناغەی هەڵسەنگاندنی دەستکەوتەکانی لە بواری پێشخستنی ئاستی شیکردنەوەی سیستماتیکدا هەڵسەنگێنین. لە پێدراوە مێژوویەکاندا هیچ کات ناتوانرێت ئەم سێ نمونە ئایدیالیە بەشێوەیەکی پەتی بدۆزرێتەوە".

مانای دوهەمی ئایدیالیی بە ئامانجێکی خوازراو ئەزانرێت کە ڕەنگە لە کرداردا بەشێوەیەکی کامڵ و تەواو دەستنەکەوێت، بەڵکو ئەبێت وەک ستاندارتێک ڕەچاوی بکەین کە ئەمانەوێت دەستمانکەوێت و بیکەینە بنەمایەک بۆ هەڵسەنگاندنی ڕادەی سودمەندی ئەوەی بەدەستهاتووە و ئەوە بەڕاستی هەیە.

پێشکەشکردنی وەسف و پێناسێک بۆ دیموکراسی، ئەتوانێت یارمەتی بەدیهاتنی مەبەستی یەکەم بدات. پێشکەشکردنی تێگەیشنێک بۆ دیموکراسی بۆ یارمەتیدانی تیورەی ئەزمونی، هەندێکجار لەلایەن ڕەخنەگرێکی دیموکراسیەوە، نەک لەلایەن بەرگریکارێکی دیموکراسیەوە، پێشکەش ئەکرێت. ڕەنگە دۆخی ئایدیالی لە دیدی ئەم ڕەخنەگرەوە قانعپێکەر نەبێت، یان بە سادەیی پەیوەندی بە ئەزمونە مرۆییەکانەوە نەبێت، چونکە درزێکی قوڵ لەنێوان ئامانج و هەموو جۆرە ئەگەرێک بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی جێی ڕەزامەندی هەیە.

## دیموکراسی ئایدیالی

ئەکرێت بەشێوەی جیاواز وێنای دیموکراسی ئایدیالی بکەین. ئەکرێت تاوتوێکردنی ڕەگوریشەی زمانەوانی وشەی دیموکراسی، خاڵی دەرچونێکی باش بێت. دمۆس+کراسی یان حکومەت بەهۆی خەڵکەوە. من وشەی "دمۆس" بەشێوەیەکی بێلایانانە بەکار ئەهێنم بۆ ئەوەی ئەو پرسیارە لەجێی خۆی بمێنێتەوە کە کام "خەڵک" خاوەن یەکسانی سیاسی کامڵن. لێرەدا چەمکی "خەڵک" نەک بە مانایەکی تایبەت، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتیەکەی واتە "دمۆس" بەکار ئەهێنم.

هەستئەکەم دیموکراسی ئایدیالی، لانیکەم ئەبێت خاوەن ئەم خەسڵەتانە بێت:

- بەشداری کاریگەرانە و واقعی. پاش دەنگدان لەسەر سیاسەتێک بەهۆی ئەنجومەنەوە، هەموو ئەندامانی خەڵک ئەبێت هەلی یەکسان و واقعیان بۆ ئاشکراکردنی بیروبۆچونەکانی خۆیان لەبارەی چۆنیتی ئەو سیاسەتەوە کە ناومان هێنا، بۆ کەسانی دی هەبێت.
- یەکسانی ڕاکان. کاتێک سەرەی بڕیاردانی

کۆتای دێت، سەرجەم ئەندامان هەلی یەکسان و واقعیان بۆ دەنگدان هەیە و هەموو ڕاکان بە یەکسان ئەژمێرێن.
- دەستگەیشتن بە تێگەیشتنێکی ڕۆشنگەرانە بۆ بابەتەکە. ئەبێت کاتێکی گونجاو بۆ تاکەکەس هەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت زانیاری پێویست لەبارەی جۆری سیاسەتە هەبووەکان و دەرئەنجامە شیمانەییەکانی وەربگرێت.
- چاودێری کۆتایی بەسەر کارنامەی دانیشتنەوە. خەڵک ئەبێت ئەو هەلەیان لەبەردەستدا بێت بۆ ئەوەی لەبارەی چەندوچونی بابەتەکانی دانیشتنەکانەوە لە کارنامەی دانیشتنەکاندا بڕیاربدەن. لێرەوە ئەو سێ خەسڵەتەی ناومان هێنان ئەوە دەرئەخات کە پرۆسەی دیموکراتی هیچ کاتێک ناگاتە کۆتایی. خەڵک ئەتوانن هەرکاتێک بە باشیان زانی سیاسەتەکانی ئەنجومەن بگۆڕن.
- گشتگیری. یەک بە یەکی ئەندامانی دمۆس شایستەیی پێویستیان بۆ بەشداریکردن لەو شێوانەدا هەیە کە وەسفمان کرد: بەشداری کاریگەر و واقعی، یەکسانی ڕاکان، دەستگەیشتن بە تێگەیشتنی ڕۆشنگەرانە بۆ بابەتەکە و چاودێریکردنی کۆتای کارنامەی دانیشتنەکان.
- مافی بنەڕەتی. هەر یەک لە خەسڵەتە پێویستەکانی دیموکراسی ئایدیالی، خۆی لە خۆیدا ئاشکراکەری مافێکە و ئەم مافەش خۆی بە یەکێک لە بەشە پێویستەکانی سیستەمێکی دیموکراتی ئایدیالی ئەژمێرێت: مافی بەشداریکردن، مافی یەکسان لە ژماردنی ڕاکاندا، مافی هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی زانینی پێویست بۆ تێگەیشتن لە مەسەلەیەک کە لەئارادایە، مافی خاوەندارێتی پێگەیەکی یەکسان بە هاوڵاتیانی دی لەبواری چاودێریکردنی کارنامەی دانیشتنەکاندا، هەروەها بوونی سیستەمێک بۆ مافە بنەڕەتیەکانیش پێویستە.

## سیستەمە دیمکراتیە واقعیەکان

فەیلەسوفانی سیاسی لە ئەرستۆوە تا ڕۆسۆ و پاش ئەوان، بەکردەوە جەختیان لەو خاڵە کردوە کە هیچ سیستەمیکی سیاسی واقعی ناتوانێت دەستی بەو شتانە بگات کە بۆ بەدیهاتنی دۆخی ئایدیالی پێویستە. ئەگەرچی بوونی دەزگا سیاسیە دیموکراسیە واقعیەکان، بۆ پێشکەوتنی ڕێژەیی ئاستی دیموکراسی پێویستە. بەڵام بەدڵنیایەوە ئەتوانرێت بگوترێت کە ئەم دەزگا سیاسیانە بۆ بەدەستهێنانی دیموکراسیەکی ئایدیالانە یان بێ کەموکوڕ، بەس نیە.
تا ئێستا بوونی ئەم دەزگایانە بە هەنگاوێکی گەورە بەرەو دیموکراسی ئایدیالی ئەزانن. لە ئەسینا بەمشێوەیە بوو. هەر لەبەر ئەوە هاوڵاتیان، ڕابەران و فەیلەسوفانی سیاسی ئەسینا، سیستەمی سیاسی خۆیان بە دیموکراسی ناو ئەبرد. دیارە مەبەستیان دیموکراسی واقعی بوو، نەک ئایدیالی. بەهەمانشێوە تۆکڤیلیش وەک زۆرێک لە ئەمریکیەکان و کەسانی تر، بێ هیچ دوودڵیەک ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکای بە دیموکراسی ناونا.
ئەگەر یەکەیەک لەڕوی فراوانی و سەرژمێرەوە بچوک بێت، ئەوا ئەکرێت بە ئاسانی سەقامگیری

ئەو دەزگا سیاسیانەی پەیوەندیان بە دیموکراسی ڕاستەوخۆوە هەیە، وەک مەرجی ئامادەکاری پێویست بۆ دروستکردنی حکومەتێک لەڕێی خەڵکەوە ڕەچاو بکەین. لەم حاڵەتەدا هاوڵاتیان بۆ بەدەستهێنانی بەرزترین فێرکاری شیاو لەبارەی پرۆژە پێشنیارکراوەکانەوە، ئازاد ئەکرین. ئەوان ئەتوانن لەبارەی ئەم پرۆژانە و نەخشە ڕێگاکانەوە، لەگەڵ هاوڵاتیانی تردا گفتوگۆ بکەن و لە کەسانی ئاگادار زانیاری وەربگرن و بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەکان، چ سەرچاوەی نوسین بێت یان شتی تر. ئەوان لە جێگەی گونجاو وەک "پنیکس هیڵ" لە ئەسینا، "فرۆم" لە رۆما، "پالازۆ دۆکالێ" لە ڤینیسیا و تەلاری شار لە دێی نیوئینگلەند کۆببنەوە و دانیشتنیان هەبێت و بە ڕێنمای سەرۆکێکی بێلایەنی دانیشتنەکە، لەماوەیەکی دیاریکراودا پێشنیارەکانیان بخەنە ڕوو. لەبارەی شتەکانەوە ڕاوێژ و گفتوگۆ بکەن و چاکی بکەن و بیگۆڕن. دواجار ئەوان لەبارەی شتەکانەوە دەنگ ئەدەن. هەموو دەنگەکان بەیەک شێوە ئەژمێرێن و ڕای زۆرینە باڵادەست ئەبێت.

بە ئاسانی ئەتوانین ئەوە ببینین کە بۆچی زۆرجار ئەو تێڕوانینە دێتە پێشێ کە دیموکراسی ڕاستەوخۆ، زۆر زیاتر لە دیموکراسی نوینەرایەتی لە دیموکراسی ئایدیالیەوە نزیکە. و بۆچی هەندێک لە لایەنگرە سەرسەختەکانی دیموکراسی ڕاستەوخۆ، وەک رۆسۆ لە کتێبی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا بڕوایان وایە کە زاراوەی دیموکراسی نوێنەرایەتی، زاراوەیەکە دژایەتی تێدایە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەمجۆرە ڕوانینانە نەیانتوانیوە سەرنجی خەڵکێکی زۆر ڕابکێشن.

دەزگا سیاسیەکانی دیموکراسی نوێنەرایەتی

کۆمەڵێک دەزگای سیاسی پێویست بۆ حکومەتەکانی دیموکراسی نوێنەرایەتی لە ئەوروپا و وڵاتە ئینگلیزی زمانەکاندا بە درێژای سەدەی هەژدە و نۆزدەی دوای زایینیدا کامڵ بوون. ئەم دیاردەیە بەگشتی بەدیاردەیەکی زۆر تازە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ئەژمێرێت. ئەگەچی هەندێک جیاوازی گرنگ لە بونیادی دەستوری ئەم کۆمەڵگایانەدا ئەبینرێت، بەڵام دەزگا سیاسیە سەرەکیەکانیان، هێڵی سیاسی لێکچوییان هەبووە، گرنگترینی ئەم لێکچونانە بریتین لە:

١) ئەو گروپە لە پایە و پلەی فەرمی کە بەشێوەی ڕاستەخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەشدارن لە دیاریکردنی نەخشەڕێگە گرنگەکانی حکومەتدا، ئەبێت لەڕێگەی هەڵبژاردنی گشتیەوە هەڵبژێرێن و وەڵامدەرەوەی خەڵکی بن.

٢) مافی بەشداریکردنی ئازادانە لە هەڵبژاردنێکی دوور لە ناچارکردندا بە هاوڵاتیان ئەدرێت. ئەم هەڵبژاردنانە ئەبێت بەشێوەیەکی دادپەروەرانە و بازنەی ئەنجام بدرێت.

٣) مافی کاندید بوون بە هەموو هاوڵاتیان ئەدرێت بۆ وەرگرتنی کورسی هەڵبژاردن و وەرگرتنی پۆستەکان.

٤) هاوڵاتیان ئەتوانن تێڕوانینی خۆیان لەبارەی زۆرێک لەو بابەتانەی کە پەیوەندیان بە مەسەلە سیاسیەکانەوە هەیە، بەشێوەیەکی ئاشکرا

دەربڕن، بێ ئەوەی ڕوبەڕووی مەترسی هیچ جۆرە سزادانێک ببنەوە.
٥) هەموو هاولاتیان مافی ئەوەیان هەیە سەرچاوەی زانیاری سەربەخۆیان لەناو هاولاتیانی تر، ڕۆژنامەکان و سەرچاوەکانی تری زانیاری لەبەردەستا بێت. جگە لەمەش نابێت ئەم سەرچاوانە لە ژێر کۆنترۆلی حکومەت یان هیچ گروپێکی تایبەتدا بێت. یاسا ئەبێت بەشێوەیەکی کاریگەر و واقعی بەرگری لەم سەرچاوەی زانیاریانە بکات.
٦) لە کۆمار ودیموکراسیە کۆنترەکاندا بوونی پیشەکان و (بالی) سیاسی جیاواز بە مەترسی ئەژمێررا کە ئەبوو لێی دور کەویتەوە. هەنوکە بە پێچەوانەوە چ لە تیورە و چ لە کرداردا جەخت لەوە ئەکرێت کە هاولاتیان ئەبێت بۆ دەستگەیشتن بە مافە جیاوازەکانی خۆیان، مافی پێکهێنان و بەشدارکردنیان لە دەزگا و ئەنجومەنە نیمچە سەربەخۆکاندا هەبێت، لەوانە کۆمەڵە و حیزبە سیاسیەکان.
دەزگای سیاسی لەمجۆرە لە هەلومەرجی سیاسی و مێژوویی جیاوازدا، لە وڵاتە جیاجیاکاندا گەشەیان کرد و ئەم گۆڕانکاریانەش تەنها بەهۆی ئەو فشارانەوە نەبوو کە بە پاڵنەری دیموکراسی ئەنجام ئەدران. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم خاڵە لە هەموو کاتێک زیاتر ڕونبۆتەوە کە بوونی ئەم دەزگایانە بۆ گەیشتن بە ئاستێکی قەبوڵکراوی دیموکراسی لەناو یەکەیەکی سیاسیدا - بۆ نمونە وڵاتێک کە گەورەترە لەوەی بتوانرێت دیموکراسی ڕاستەوخۆی تیا پیادە بکرێت - پێویستە.
ئەکرێت ڕێژەی نێوان دەزگا واقعیەکان (گەورەکان)ی دیموکراسی و پێداویستیەکانی دیموکراسیەکی ئایدیالی لەم خشتەیەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

| لە یەکەیەکدا بە گەورەی وڵاتیک، بوونی ئەم دەزگایانە پێویستە | بۆ ئەوەی ئەم پێوەرانەی دیموکراسی ئایدیالی جێبەجێ بکرێت |
|---|---|
| ١) نوێنەرانی هەڵبژێراو | بەشداری واقعی و کاریگەرانە، چاودیری بەرنامەی کار |
| ٢) ئەنجامدانی هەڵبژاردنی دادپەروەرانە و بازنەیی | یەکسانی ڕاکان، بەشداری کاریگەر و واقعی |
| ٣) ئازادی ڕا دەربڕین | بەشداری کاریگەر و واقعی، تێگەیشتنی ڕۆشنگەرانە، چاودێری بەرنامەی کار |
| ٤)بوونی سەرچاوەی زانیاری | بەشداری کاریگەر و واقعی، تێگەیشتنی ڕۆشنگەرانە، چاودێری بەرنامەی کار |
| ٥) سەربەخۆی ئەنجومەنی | بەشداری کاریگەر و واقعی، یەکسانی ڕاکان، تێگەیشتنی ڕۆشنگەرانە |
| ٦) جێکردنەوەی هەموو خەڵک | بەشداری کاریگەر و واقعی، یەکسانی ڕاکان، تێگەیشتنی ڕۆشنگەرانە، چاودێری بەرنامەی کار |

## سنوردارێتی ڕەوای دەسەڵاتی خەڵک

لە حاڵەتی جیاوازی بیروبۆچون لە نێوان هاوڵاتیاندا لەبارەی سیاسەتەکانەوە، چ دیدێک ئەبێت باڵادەست بێت؟ لە سیستەمە دیموکراسیەکاندا وەڵامی ئەم پرسیارە باوە بەم شێوەیە ئەدرێتەوە: بڕیاری کۆتایی ئەبێت پەیڕەوی ئیرادەی زۆرینە بکات، یان لە سیستەمی نوێنەرایەتدا، ڕوانینی زۆرینە ئەکەن بە پێوەر. لەبەرئەوەی بنەمای حکومەتی زۆرینە و پاساوەکانی لەسەردەمی لۆکەوە تا ئەمرۆ زۆر بە وردی تاوتوێ کراوە، لەبەرئەوە من مەبەستم سەلماندنی ڕاستی حکومەتی زۆرینە نیە، بەڵکو تەنها بە وتنی ئەو خاڵە واز ئەهێنم کە هیچ ڕێسایەکی تر جگە لەمە، لەگەڵ ئەو بنەمایەدا نایەتەوە کە هەموو هاوڵاتیان شایستەی ئەوەن لە ڕوی سیاسیەوە یەکسان بن. دیارە حکومەتی زۆرینە گرفتی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان باسکردنی ئەم گرفتانە نیە.
ئێستا بگەڕینەوە بۆ پرسیارەکەی خۆمان: ئەگەر وای دابنێین تاکەکەس بەشێکە لە تاکەکانی کۆمەڵگا و پێگەی دەزگا سیاسیە پێویستەکانیش (بۆ دیموکراسی) بەشێوەیەکی گونجاو سەقامگیر بوبێت، ئەوکاتە ئەکریت چ سنوردارێتیەک بۆ دەسەڵاتی خەڵک لە دارشتنی یاساکان، یان بەشێوەیەکی دیاریکراوتر بۆ دەسەڵاتی زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگا دابنرێت؟

## مافە دیموکراتیە ئەبێتیەکان

ئەگەر بڕوامان بە داخوازی و ئەگەری دیموکراسی بۆ سیستەمە سیاسیە گەورەکان هەبێت، ئەگەر دەزگا ناوبراوەکان هاوکات لەگەڵ ئەو مافانەی پەیوەستە پێیانەوە، شتیکی ناچارانە بێت بۆ دیموکراسی نوێنەرایەتی، لەم حاڵەتەدا ئەو کارانەی کە ئەم مافانە بە توندی لاواز ئەکەن یان پێشێلی ئەکەن، ناتوانن رەوا بن و بە مانای وردی وشە بچنە دەرەوەی هەڵبژاردنی دەستوری و یاسایی زۆرینە. ئەگەرچی باسکردنی فراوانی ئەم مەسەلەیە لە بابەتی سەرەکی دورمان ئەخاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەڕوی لۆژیکیەوە زۆر ڕونە کە ناکرێت مافە بنەرەتیەکانی دیموکراسی بە هۆی زۆرینەوە بەشیوەیەکی ڕەوا بریندار بکرێت. ئەبێت سەرنجی ئەوە بدەین کە کاروکردەوەی ئەم زۆرینەیە تەنیا بەهۆی بنەمای یەکسانی سیاسیەوە ئاڕاستە ئەکرێت. بە دەربڕینێکی تر گەر ئەم حاڵەتانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرین:

١) دەستگەیشتن بە دیموکراسی ئامانجێکی مومکین و داواکراوە.

٢)حکومەتی زۆرینە تەنها لەبەرئەوەی ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە یەکسانی سیاسی، پاساوی هەیە.

٣) بوونی سیستەمیکی دیموکراسی مەرجی پێویستە (نەک ناچاری) بۆ گەیشتن بە یەکسانی سیاسی.

٤) بۆ دەستگەیشتنی تەواو بە سیستەمێکی دیموکراسی، بوونی هەندێک ماف پێویستە (بەڵام بەس نیە).

ئەکرێت لەم گریمانانەوە ئەم ئەنجامگیریە بکرێت:

١) نکوڵیکردن یان بازدان بەسەر ئەم مافە ئەبێتیانەدا، زیان بە سیستەمی دیموکراسی ئەگەیەنێت.

٢) ئەم بازادان و نکوڵیکردنە لە مافە ئەبێتیەکان، بە هۆی ئەو زیانەی کە بە سیستەمی سیاسی ئەگەیەنێت، زیانیشی بۆ یەکسانی سیاسی ئەبێت.

٣) ئەگەر حکومەتی زۆرینە وەک ئامرازێک بۆ گەیشتن بە یەکسانی سیاسی پاساو بدرێت (گریمانەی دوهەم لەسەرەوە) کەوابوو مەعقول نیە بنەمای حکومەتی زۆرینە پاساو بۆ ئەو کردەوانە بهێنێتەوە کە زیان بە مافە دیموکراسیە ئەبێتیەکان ئەگەیەنێت.

لێرەوە کاتێک کردەوەی زۆرینە ئەو دەزگا پێویستانە لەناوببات کە بۆ بەردەوامی دیموکراسی پێویستن، بۆ نمونە ئازادی بیروڕا، ئەوسا دانانی هەندیک سنورداریێتی بۆ دەسەڵات و هەڵبژاردنەکانی زۆرینە، لەگەڵ بڕوا دیموکراسیەکاندا نەگونجاو نابێت. هەر لەبەرئەمە مەرجەکانیان بەشێوەیەک داناوە کە نەتوانرێت بە زۆرینەیەکی ئاسایی پەنجا زائید یەک، لیستی ئەم مافانەی لە دەستوردا هاتووە، دەستکاری بکرێت، بەڵکو پیاچونەوە بەم مافانە، پێویستی بە زۆرینەیەکی زۆر بەهێز هەیە.

دیارە لەڕوی لۆژیکیەوە ئەشێت وێنای ئەوە بکەین کە تەنانەت ئەم زۆرینە بەهێزە بۆ گۆڕینی دەستور، دیموکراسی بەشتێکی خوازراو و داواکراو نەزانێت و هەروەها پشتیوانی لە پاشکۆیەکی دەستور بکات کە ئەمە لە دواجاردا زیانێکی گەورە بە پێداویستیەکانی دیموکراسی ئەگەیەنێت یان پێشێلی ئەکات، وەک ئازادی بیروڕا، ئازادی هەڵبژاردن و دادپەروەرانە و هەندێک خاڵی تر کە پیشتر ئاماژەمان بۆ کرد.

لێرەدا ئێمە لە سنوری ئەبێکان تیپەڕیوین و چوینەتە ناو سنوری هەبوەکانەوە. لە دنیای واقعی ئەزمونگەریدا ئەگەر زۆرینەیەکی چالاکی هاوڵاتیان، لە وڵاتێکی دیموکراتیدا پێداگری لەسەر ئەو بابەتە بکەن کە فڵان مافی پێویست (بۆ سەقامگیری و بەردەوامی) دیموکراسی کارێکی نەخوازراوە و ئەبێت بە توندی لاببرێت یان سنوردار بکرێت، لەم حاڵەتەدا زۆر ئەگەری ئەوە هەیە ئەو مافە بخەسێنرێت. تەنانەت دەزگایەکی دادوەری سەربەخۆش ناتوانێت ڕێگە لە ڕەوتی بەردەوامی دژایەتی مافە دیموکراتیەکان بگرێت. کاتێک خەڵک بروایان بە خوازراوی مافە دیموکراتیەکان لەدەستدا، دیموکراسیەکەیان بەخێرایی ئەبێت بە ئولیگارشی یان حکومەتیکی ستەمکاری.

لەگەڵ ئەوەشدا فیلێکی شاراوەتر هەیە بۆ گواستنەوە لە دیموکراسیەوە بەرەو ئولیگارشی. کاتێک زۆرینەی خەڵک ئەم مافە بنەڕەتیانە بە خوازراو بزانن، بەڵام بەهەرحاڵ توانای ئەنجامی ئەو کارە سیاسیانەیان نەبێت کە بۆ پاراستن و پارێزگاریکردن لەم مافانە پێویستە، ئەتوانێت ڕێگری لە بریندارکردنی ئەم مافە بنەڕەتیانە بەهۆی ڕابەرانی سیاسیەوە بکات کە بەهەرحاڵ بۆ گەیشتن بە مەبەستە سیاسیەکان، سەرچاوەی زیاتریان لەبەردەستدایە.

## ئایا یەکسانی سیاسی ئامانجاێکە کە بەدەست نایەت؟

بە سەرنجدان لەم تێبینیانە پرسیارێکی سیاسی و گرفتئامێز دێتە پێشەوە. تەنانەت گەر یەکسانی سیاسی بە ئامانجێکی زۆر خوازراو بزانین و هەروەها قەبوڵیبکەین کە ئەم ئامانجە لە سیستەمێکی سیاسی دیموکراسیدا، بە باشترین شێوە ئەتوانرێت بەدەست بهێنرێت، دیسان ئەو پرسیارە ئەمێنێتەوە کە ئایا بەڕاستی ئامانجیکی وا، تەنانەت لە سیستەمێکی دیموکراسیدا بەدی دێت؟ یان هەندێک ڕەهەندی سەرەکی کە پەیوەندی بە ڕەگەزی مرۆڤ و کۆمەڵگای مرۆڤایەتیەوە هەیە، ڕێگرێکی وا گەورەی لەبەردەم گەیشتن بە یەکسانی سیاسیدا داناوە، کە سەرەڕای هەموو پێداویستیە پراکتیکیەکان، ئەم ئامانجە دوردەست ماوەتەوە و ئەمێنێتەوە و لەبەرئەوە ئەبێت دەست لەهەر جۆرە هەوڵێک بۆ بەدیهاتنی بشۆین؟

ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا یەکێکە لە نمونە دیارەکانی درز لەنێوان واقعی یەکسانی سیاسی و باسکردنیدا. لە بەندی دوهەمی بەڵگەیەکدا کە بە دەربرینێک لیستی هەنگاوە زیانبەخشەکانی پاشای ئینگلتەرا بوو، ئێمە ڕوبەڕووی تێڕوانینێکی بەناوبانگ لەبارەی هەقیقەتێکی ئاشکرا ئەبینەوە: هەموو مرۆڤەکان بە یەکسانی لەدایکبوون. نوسەرانی سەربەخۆیی ئەمەریکا و پەنجا نوینەری نێرراو بۆ دوهەمین کۆنگرەی کیشوەرەکان لە تەموزی ١٧٧٦ میلادی، ئەم بەڵگەیەیان دانا، دیارە هەمویان پیاو بوون و هیچ کامیان بچوکترین مەبەستیان ئەوە نەبوو فراوانکردنی مافی ڕا، یان سپاردنی زۆر مافی مەدەنی و سیاسی بنەرەتی تر بە ژنان ببەخشن. لە هەمانکاتدا ئەوان لە بیرکردنەوەی خۆیاندا ژنانیان لەڕوی مافەوە بە بەشێک لە سامانی باوکان و مێردەکانیان ئەزانی.

ڕاجر سمیت لە بەرهەمەکەی خۆیدا بەناوی هاوڵاتی ئەمریکی ئەو خاڵە بەبیر ئەهێنێتەوە کە "دەستوری ئەمەریکی هیچ ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ ژنان ناکات، لەکاتێکدا بۆ وەسفی سەناتورکان، ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا، سەرکۆمار و یاریدەدەری سەرکۆمار، ٣٠ جار سودی لە زاراوە پیاوانەکان وەرگرتووە". مەسەلەی سەرەکی ئەوەیە دەستوری ئەمەریکا دیدی دەستوری هەرێمەکانی لەبارەی مەحرومکردنی ژنانەوە لە مافی دەنگدان و ئیمتیازە سیاسیەکانی دی نەگۆڕی و وەک خۆی هێشتیەوە.

هەروەها پارێزەرانی بەڕێزی بەیانی سەربەخۆی ئەمەریکا، مەبەستیان نەبوو ئەم مافانە کۆیلەکان یان گەر ڕاستان بوێت ئەو کەسانەی بەرەگەز ئەفەریقین، بگرێتەوە. لەکاتێکدا لەهەموو ئەو کۆلۆنانەی کە داوای مافی سەربەخۆیان ئەکرد، ئەم بەرەگەز ئەفریقیانە بەشێکی گەورەی ژمارەی دانیشتوانی ئەو شوێنانەی پێکئەهێنا. تۆماس جفرسۆنی نووسەری بەیانی سەربەخۆی ئەمەریکا خۆی خاوەنی سێ سەد کۆیلە بوو، لە سەردەمی ژیانیشیدا ئازادی بە هیچ یەک لەم کۆیلانە نەدرا. جفرسۆن تەنها

لە سەرەمەرگدا چوار کەسیانی ئازاد کرد. بۆ ئەوەی کۆیلایەتی لە ویلایەتە یەکگرتوەکاندا بەشێوەیەکی یاسای هەڵوەشێنرێتەوە (بە دەربرینی شاعیرانەی لینکلن لە وتاری گتیسبۆرگدا) ئەبوو زیاد لە چوار بیست ساڵی و یەک حەوت ساڵی تێپەڕیایە. تازە ئەمەش بە زۆری چەک و بە دانانی یاسا ئەنجامدرا. سەرەڕای ئەمە یەک سەدە پێویست بوو بۆ ئەوەی مافی کەسانی بە ڕەگەز ئەفەریقی لە بەشداریکردن لە ژیانی سیاسیدا بەشیوەیەکی کاریگەر لە باشوری ئەمەریکدا جێبەجێ بکرێت. هەنوکە بە تێپەڕبوونی دوو نەوە ئەمەریکیە سپی پێست و ڕەنگاوڕەنگەکان هێشتا هەست بە برینێکی قوڵ لە پەیکەری یەکسانی مرۆڤەکان و ئازادی و شەرەف و عیزەتی نەفسی مرۆیی ئەکەن کە دەرئەنجامی سەردەمی کۆیلایەتی و دوای ئەوە.

بەمشێوەیە بەیاننامەی شکۆداری سەربەخۆی ئەمەریکا لە بێدەنگیەکی تەواو و بێ هەراو هوریادا، دانیشتوانی چەند هەزار ساڵەی ئەم سەرزەمینەشی خستە لاوە، کە وڵاتەکەیان لەلایەن ئەوروپیەکانەوە داگیرکرا و بوو بوو بە کۆلۆنەیەک. هەستئەکەم هەموو بەو چیرۆکە ئاشناین کە چۆن کۆچبەرەکان دانیشتوانی سەرەکی ئەمەریکایان لەمافی هەبوونی خانوو، زەوی، جێگە، ئازادی، و مرۆڤایەتی مەحروم کردبوو. پاشماوەکانی ئەم خەڵکە تا ئێستاش لە دەرئەنجامەکانی ئەمجۆرە ڕەفتارە ئەناڵێنن. بە درێژای چەند سەدەی ڕابردوو داواکاریە سەرەتاییەکانی ئەم خەڵکە بۆ ئەوەی وەک مرۆڤی یەکسان لەگەڵ ئەوانی دیدا خاوەن پێگەی یاسایی، ئابوری و سیاسی - نەک کۆمەڵایەتی - بن، نکوڵی لێکراوە. ماوەیەکی زۆر ئەم نکوڵیکردنە هاوکات بوو لەگەڵ توندوتیژیدا و بەم دوایانەش هاوکاتە لەگەڵ لێکبوردن و بێ دەربەستی.

هەموو ئەم ڕوداوانە لە وڵاتێکدا ڕویدا کە گەشتیارانی ئەوروپی وەک "تۆکڤیل" - بە بڕوای من بە دروستی - هەست و سۆزێکی زیاتریان بۆ یەکسانی بە بەراورد بە وڵاتانی دی تیا دیووە.

دیارە لێرەدا ئەتوانرێت نمونەی زۆر لە وڵاتە دیموکراتیەکانی تر بهێنرێتەوە. ڕەنگە زوربەی ئەوروپیەکان لەمبارەوەیەوە هاوڕا بن کە بە درێژای چەندان سەدە خەڵکی یەکێک لە پێشکەوتوترین وڵاتە دیموکراتیەکانی دنیا، واتە ئینگلتەرا، بە تامەزرۆیەکی زیاتر لە وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاواوە، بەدوای پاراستنی نایەکسانی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی چینایەتیدا بوون. ئەم نایەکسانیانە بە ڕادەی خۆیان کاریگەریەکی زۆری کردە سەر خوێندنی باڵا، دەزگای خزمەتگوزاری وڵات کە دەزگایەکی جێی ستایشە، کارەکان و هەروەها ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە ماف و دادپەروەری و بازرگانیەوە هەیە. بە پێچەوانەی وڵاتانی تری دیموکراتەوە تا چەند ساڵ پێشیش، یەکێک لە بەشەکانی ئەنجومەنی نیشتیمانی ئەم وڵاتە لە ئەنجومەنی پیران پێکئەهات. زۆرینەی ئەم ئەنجومەنە لە نەوەی ئەرستۆکراتەکان پێکئەهات.

بوونی درزێکی مێژوویی لەنێوان قسەکردن بۆ خەڵک و واقعی سیاسی، بە هیچ شێوەیەک هەر تایبەت نیە بە ویلایەتە یەکگرتوەکان و ئینگلتەرا. بەشێکی زۆر لە خەڵکی تەمەن گەورەی پیاو، لە زۆرێک لە وڵاتە "دیموکراتیەکان" دا تا کۆتایەکانی سەدەی نۆزدە و تەنانەت سەرەتای سەدەی بیستیش مافی دەنگدانیان نەبوو. تەنیا دوو وڵاتی دیموکراتی نیوزلەندا و ئۆستراليا پیش دەیەکانی ١٩٢٠ م مافی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنیان بە ژنان بەخشی. لە سویسرا مافی دەنگدانی گشتی پیاوان لە ساڵی ١٩٤٨م دا بەخشرا، بەڵام مافی دەنگدانی ژنان لە ساڵی ١٩٧١دا زامنکرا.
لەگەڵ ئەمەشدا ڕابەران و زۆرێک لە هاوڵاتیان (ئەڵبەتە پیاوان) زۆرجار لەبارەی یەکسانی سیاسیەوە بە توندی قسە ئەکەن.

## گەشەکردنی یەکسانی سیاسی

تەنانەت گەر ئەوە ڕاستیە ئاشکرایە ڕەچاو بکەین کە یەکسانی سیاسی لەڕوی پراکتیکیەوە لە شوێنی جیاوازدا نەفیکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا دیسان ئەتوانرێت بگوترێت لەبەر بوونی کۆمەڵێک دەزگا، شێوەی کار و ڕەفتارەکان، زۆرێک لە بانگەشەکانی لەبارەی یەکسانیەوە، لەوانە یەکسانی سیاسی، بەدرێژایی چەند سەدەی دوایی بەهێز بووە. گەرچی ئەم بزوتنەوە مێژوویە لە هەندێک ڕووەوە ڕەهەندێکی جیهانی هەیە، بەڵام لەهەندێک وڵاتی دیموکراتی وەک ئینگلتەرا، فەڕەنسا، ویلایەتە یەکگرتوەکان و وڵاتە ئەسکەندناڤیەکان و هۆڵەندا و زۆرێک لە وڵاتانی تر بەرچاتر بووە.
تۆکڤیل لەیەکەم لاپەڕەکانی بەرگی یەکەمی "دیموکراسی لە ئەمەریکا"دا، ئاماژە بۆ زیادبوونی بێ پاساوی نایەکسانی مەرجەکان لەناو هاوڵاتیانی فەڕەنسی خۆیدا بەدرێژایی پەنجا ساڵ ئەکات. بە بڕوای تۆکڤیل "ئەم ڕەوتە لە سەدەی یازدەی میلادیەوە دەستی پێکردووە". دیارە ئەم شۆڕشە لە وڵاتی تۆکڤیلدا ڕوی نەدا. بە قسەی خۆی "گەر چاومان بکەینەوە، سەرنج ئەدەین کە شۆڕشی لەمچەشنە، بە شێوەیەکی بەردەوام لە سەرتاسەری دنیای مەسیحیدا بوونی هەبووە".
تۆکڤیل لە درێژەی ئەم باسەدا ئەو خاڵەش باس ئەکات کە "گەشەکردنی یەکسانی هەلومەرجەکان، ڕاستیەکی خوازراو و لە هەموو ڕویەکەوە خواستی خودایە: لەبەرئەوەی گەردونیی و سەقامگیرە و دەوری دەستێوەردانی مرۆڤ لە بەرپاکردنیدا بەردەوام کەمتر و کەمتر ئەبێتەوە و هەر ڕوداوێکی تر بە ئەندازەی مرۆڤەکان، دەوری لە پیشکەوتنیدا بینیووە".
ڕەنگە ئەم ڕستانەی تۆکڤیل بە زیادەڕەوی بزانین یان ڕەنگە بمانەوێت ئەو خاڵە بە بیر بهێنینەوە کە چەند ساڵ دوای ئەوە کاتێک "تۆکڤیل" بەرگی دوهەمی کتێبەکەی خۆی ئەنوسی، لە بینینی دەرئەنجامە ناخۆشەکانی دیموکراسی و یەکسانی، هەستی بە ناخۆشی ئەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تۆکڤیل گومانی لە ڕاستی ئەو خاڵە نەئەکرد کە گەشەکردنی دیموکراسی و یەکسانی ڕێگەی لێ ناگیرێت.

ئەگەر ئەمڕۆ ئەو گۆرانکاریانە تاوتوێ بکەین کە پاش سەردەمی تۆکڤیل ڕویداوە، وەک تۆکڤیل لەسەردەمی خۆیدا، سەرمان ئەسوڕمێت لە پێشکەوتنی بیروڕاکان و شێوە پراکتیکیەکان کە ئەبێتە هۆی ڕەچاوکردن و گەشەکردنی یەکسانی و هەروەها لە بوونی چەند لایەنێکی یەکسانی سیاسی بەرفراوانتر لە بەشێکی گەورەی جیهاندا.

ئەکرێت لەبارەی یەکسانی سیاسیەوە ئاماژە بۆ شێوەی کاری دەزگا و بیروڕا دیموکراتیەکان بە درێژای سەدەی بیست بکەین. لە ساڵی ١٩٠٠ی م ٣٥ وڵات، کەمتازۆر سەربەخۆ یان خاوەن سەربەخۆی کامڵ بوون. لە نێوان ئەم وڵاتانەدا تەنها هەشت وڵات خاوەنی هەموو ئەو دەزگا سەرەکیەکان بوون کە پەیوەندیان بە دیموکراسی نوێنەرایەتیەوە هەیە و تەنها لە یەک وڵاتیشدا نیوزلەندا، ژنان مافی دەنگدانیان هەبوو. سەرەڕای ئەمە سەرژمێری ئەم هەشت وڵاتە، لە ١٠٪ تا ١٢٪ سەرژمێری هەموو جیهان تێنەئەپەڕی. لەسەرەتای سەدەی بیستویەکدا لە نێوان نزیک ١٩٠ وڵات، ٨٥ وڵات خاوەنی دەزگا سیاسیەکان و شێوەی کارکردنی دیموکراسی نوێنەرایەتی بوون، لەوانە مافی دەنگدانی گشتی. دیارە ئەم وڵاتانە لە ئاستیکدا بوون کە ئەکرا بە ئینگلتەرا و ئەوروپای ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتوەکان بەراورد بکرێن. ئەمڕۆ لەهەر دە کەسی خەڵکی دنیا، شەش کەسیان لەم وڵاتانەدا ئەژین.

هەموو ئەزانین لە ئینگلتەرا چینی کرێکار و ژنان مافی دەنگدانیان هەبوو. بەڵام گۆڕانکاری تریش ڕویدا. ژنان و پیاوان لە چینی ناوەڕاست، چینی ناوەڕاستی خوارەوە، چینی کرێکار، نەک هەر ئەیانتوانی لە دانیشتنەکانی ئەنجومەی گشتیدا بەشداری بکەن و سود لە ئاسانکاریەکانی وەربگرن، بەڵکو ئەیانتوانی ببنە ئەندامی کابینە و بگەنە پۆستی سەرۆک وەزیران. لانیکەم زۆربەی ئەندامانی ئەرستۆکراتزادەی میراتگری ئەنجومەنی پیران، چیدی بوونیان نەبوو. هەروەها لە ویلایەتە یەکگرتوەکان ژنان مافی دەنگدانیان بەدەستهێنا. بە تێپەڕاندنی یاسایەک لەبارەی مافی دەنگدانەوە لە ساڵی ١٩٦٥ی م، مافی ئەو ئەمەریکیانەی بە ڕەگەز ئەفریقی بوون بۆ بەشداریکردن لە هەڵبژاردندا، شێوەیەکی یاسایی وەرگرت. یاسای ناوبراو بەڕاستی جێبەجێکرا و ئەمەریکیە بەڕەگەز ئەفریقیەکانی لە ژیانی سیاسی ئەمەریکادا، گۆڕی بۆ هێزێکی سیاسی کاریگەر. لێرەدا حەزئەکەم ئاماژە بۆ ئەو خاڵە بکەم کە هەرچەندە هەلومەرجی کارەساتئامێزی خەڵکی سەرەتایی ئەمەریکیەکان تاڕادەیەک باشتر بووە. لەگەڵ ئەمەشدا میراتی خەمناکی ئەو بێدادیەی بەرەو ڕویان بۆتەوە، بۆ ئێمە هەر وا ماوەتەوە.

ئەگەر ئێمە تەنها ناکامی و مەسەلەی لەم شێوەیە لەبەرچاو بگرین و ئەوەی کە وا بزانین لەکاتی شەڕکردن لەگەڵ هێزە بەهێزەکانی نایەکسانیدا، بڕوابوون بە یەکەسانی بەشێوەیەکی نائومێدانە نەیارێکی بێ دەسەڵات و لاوازە، ئەوکاتە چۆن ئەتوانرێت دەستکەوتە مەزنەکانی ئەم دوو سەدەیەی دوای لە بواری دروستکردنی

زەمینەدا بۆ یەکسانی ڕونبکرێتەوە؟ یان بە بوونی ئەم هەموو ڕێگرە لەبەرامبەر یەکسانی سیاسیدا، چۆن ئەکرێت ئەم دەستکەوتانە ڕون بکرێتەوە؟

ڕونکردنەوەی گشتی ئەو بزوتنەوانەی بە ئاراستەی یەکسانی سیاسی بوون

لێرەدا ئەمانەوێت ئەوە دەرخەین چۆن لەگەڵ ئەوەشدا کە سەرچاوەی زۆرتر لەبەردەست چینە باڵادەستەکانی کۆمەڵگادایە، گۆڕانکاری بە ئاراستەی دروستکردنی یەکسانی سیاسی ڕویداوە. بۆ ئەم مەبەستە وێنەیەکی گشتی ئەم پرۆسەیە ئەخەینە بەردەست.

## پاساوی ئیمتیازات بەهۆی تێزەوە

کەسانی خاوەن ئیمتیازاتی باڵا (بە دەربڕینێک دەستەبژێری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری) بەرگری لە بیروڕا و تێزێک ئەکەن کە پاساو بۆ باڵاتربوونی خۆیان بهێنێتەوە. ئەوان هەندیکجار تەنانەت ئەم بیروڕایانە بە زۆر ئەسەپێنن. ئەو گروپە مەزهەبیەی کە سەر بە چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵگان، پشتگیری ئەمجۆرە بیروڕایانە ئەکەن و ڕەنگە خۆشیان ئەم تێڕوانینانە دروستبکەن. بۆ نمونە ئەکرێت ئاماژە بۆ "مافی خوایی پاشا" بکرێت کە چەندان سەدە پاساوی بۆ دەسەڵاتدارە ئەوروپیەکان ئەهێنایەوە. فەیلەسوفانیش لە پارێزگاریکردن لە دەستەبژێرە حوکمڕانەکان بەشدار بوون. نمونەی بەناوبانگ و نەمری ئەمە ئەفلاتونە. لەگەڵ ئەمەشدا تەنانەت ئەرستۆش کە لە ئەفلاتون میانڕەوتر بوو، هیچ حەزی بە بیرۆکەی سیاسی نەئەکرد. لەهەندێک دۆخدا فەلسەفەی فەرمی ڕەوایەتی بە زنجیرە پلە و ئیمتیازاتەکان داوە. نمونەکەی بیروڕاکانی کنفۆشیۆسە. ئەم بیروڕایانە چەندان هەزار ساڵ لە ئیمپڕاتۆری چیندا باڵادەست بوو. لە ڕژێمە تۆتالیتارە هاوچەرخەکاندا ئایدۆلۆژیایەکی دۆگمایی و بێ چەندوچون لە خزمەتی ڕەوایەتی بەخشین بەدەسەڵات و ئیمتیازاتدا بوو. بۆ نمونە ئەکرێت ئاماژە بۆ مارکسیزم – لینینیزم لە یەکێتی سۆڤیەت، تێزی فاشیزم لە ئیتاڵیا و بنەماکانی بیروڕای نازیزم لە سەردەمی حکومەتی هیتلەر لە ئەڵمانیادا بکرێت.

## گومانی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا بەرامبەر بە دەسەڵاتی دەستەبژێرەکان

زۆرجار وا دەرئەکەوێت کە دەستەبژێرە باڵادەستەتەکان وا ئەزانن چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا، ئەو تێزانەیان قەبوڵکردوە کە ڕەوایەتی بۆ دروستکردوون. چینەکانی سەرەوە بڕوایان وایە کە چینەکانی خوارەوە مافەکانی چینی سەرەوەیان بە تەواوی قەبوڵکردووە و ملی بۆ ئەدەن. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵە گەرموگوڕانەی لەلایەن دەستەبژێرەکانەوە ئەدرێت بۆ باڵادەستی ئەو تێڕوانینانەی

ڕەوایەتی بە دەسەڵات و پێگەی باڵاتر و دروستکردنی بیروڕای بێ چەندوچون بە هەقانیەتی ئەو مافانەی پێیان سپێراوە، بەڵام دیسان هەر زۆرێک لە گروپە ژێر دەستەکان لەبارەی ئەوەی بۆچی ئەبێت لە هەلومەرجێکی خراپتردا بن یان لەبارەی ئەوەی بانگەشەکانی باڵاتر بوون بەڕاستی ڕاستە، گومانیان هەیە.

"جیمز سکات" بەشێوەیەکی قانعپێکەر ئەوەی پیشاندا کە ئەو گروپەی خەڵک کە بەهۆکاری مێژوویی یان بە هۆی کارکردنی بونیاد یان سیستەمی بیروڕاکانی دەستەبژێرەکان، لە پێگەیەکی خوارتردا ڕاوەستاون، کەمتر لەوەی چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵگا حەزئەکەن وێنای بکەن، ئایدۆلۆژیای باڵادەستیان قەبوڵکردووە. سکات بۆئەمە نمونەیەک ئەهێنێتەوە. بەپێی هەندێک بەڵگە ناپاکەکانی هندستان ڕەوایەتی تێزەکانی هندویزمیان بۆ پاساوی دەسەڵاتی کاستەکان قەبوڵنەئەکرد و ڕەدیان ئەکردەوە و نادیدەیان ئەگرت. کاستە پۆلبەند کراوەکان چەندانجار کەمتر لە براهمنەکان بڕوایان بە تێزی کارما لەبارەی هەلومەرجی خۆیانەوە هەیە ولەبری ئەمە فەقیری و کارکردنی سەرەتایی و ئەفسانەی بێدادی بە هۆکاری هەلومەرجی خۆیان ئەزانن.

## هەلومەرجی لەبارتر

بەسەرنجدان لەوەی ئەندامانی گروپەکانی خوارەوە بە ئاشکرا یان نهێنی ئایدۆلۆژیای دەسەتبژێرەکان ڕەد ئەکەنەوە، ئەوا گۆڕانی هەلومەرج جا بە شێوەی دروستکردنی گۆڕانکاری لە ئایدیا، باوەڕەکان، بونیادەکان، گۆڕانی نەوەکان یان بەهەر شێوازێکی تری گۆڕانکاری، هەموو ئەمانە هەلی تازە بۆ دەربڕینی گلەیی و ڕەخنەکان ئەخاتە بەردەست چینەکانی خوارەوە. ئینگلیزەکان بە هۆکاری جیاواز نەیانتوانی بە درێژایی سەدەی ١٧ و ١٨ی میلادی بونیادە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانی خۆیان بەسەر کۆچبەرانی کۆلۆنەی ئەمەریکادا بسەپێنن. ماوەی نێوان دوو ئۆقیانوسی ئەتڵەس، ئەوەی لە کۆلۆنەکاندا زەوی بۆ دەسبەسەراگرتن و موڵکایەتی بە ئاسانی لەبەردەستا بوو، بوونی هەلی تازە لەبواری بازرگانی و دارایدا، پەرەسەندنی چینێکی گەورەی جوتیارانی سەربەخۆ، بازرگانان و پیشەوەران و بوونی جیاوازی تر لەنێوان ئەمەریکای کۆلنیالیکراو و وڵاتی دایکدا، هەموو ئەمانە هەلی چەندانجار زیاتری ئەخستە بەردەم دانیشتوانی کۆلۆنە، بۆ ئەوەی بە بەراورد بە مانەوەیان لە ئینگلتەرا، بەشداریەکی چالاکانەتر لە ژیانی سیاسیدا بکەن.

## زیادبوونی گوشارەکان بۆ گۆڕانکاری

کاتێک هەلی تازە دروست ئەبێت و هاوکات لەگەڵیدا توڕەیی، بێزاری و هەستی بێدادی، پاڵ بە تاک و گروپەوە بەو ئاراستەیە ئەنێت کە ڕوانگەی هەلی باشتر، وەفاداری گروپی یان پاڵنەری تر لەبەرچاو بگرێت، ئەوکاتە ئەندامانی گروپی خوارەوە سود لەهەر هەلێک وەرئەگرن

بۆ ئەوەی گۆڕانکاری دروستبکەن. بۆ نمونە بە هاتنی دیموکراسی بۆ هندستان تاکەکانی سەر بە کاستەکانی خوارەوە بە خێرایی سودیان لەو هەلە تازانە وەرگرت کە بۆ باشترکردنی پێگەی خۆیان بەدەست هاتبوو.

## بوونی پشتگیری لەلایەن چینی باڵادەستەوە

هەندێک گروپی باڵادەست بژاردەی پشتگیری لە داواکاریەکانی چینەکانی خوارەوەیان هەڵگرتووە. خۆییەکان لەگەڵ بێگانەکاندا یەک ئەگرن. شۆڕشگێرانی چینەکانی سەرەوە، پشتگیری چینە نارازیەکانی خوارەوە ئەکەن. ڕەنگە ئەم هەنگاوەی ئەوان هۆکاری جیاوازی هەبێت: بیروڕا ئەخلاقیە دۆگمەکان، بەزەیی و دڵسۆزی، چاوچنۆکی، ترس لە پێشهاتەکانی ئاژاوە، بوونی هەڕەشە لەسەر سامانەکانیان، و ڕەوایەتی ڕژێم. تەنانەت ئەگەری ڕاستی یان خەیاڵی ڕودانی شۆرشیش، ئەتوانێت ئەمجۆرە هەڵوێستانە لەگەڵ خۆیدا بێنێت.

## چینەکانی خواروە شتێکیان دەست ئەکەوێت

کاریگەری ئەم هۆکارانە کاتێک بە لوتکەی خۆی ئەگات کە چینەکانی پێشتر لە خوارەوە بوون، دەسەڵات، نفوز، پێگە، پەروەردە، دەرامەت یان بەرژەوەندیەکی بەرچاوتر بەدەست ئەهێنن. دیارە ڕودانی هەموو ئەم شتانە ئەشێت. بۆ نمونە ١٪ زیاتر لە پیاوانی سپی پێست لە کۆلۆنەی ئەمەریکادا بە بەرواری لەگەڵ وڵاتی دایکی خۆیاندا، مافی دەنگدانیان لە هەڵبژاردنی ناوچەیی یاساداندا هەبوو. لەهەندێک کاتدا ئەم بەرژەوەندیانە تاڕادەیەک لەڕێگەی شۆڕشی توندوتیژەوە بەدەست دێت. لەکاتی شۆڕشدا چینەکانی خوارەوە دەسەڵاتی چینەکانی سەرەوە لائەبەن. ئەم دۆخە دواجار بۆ ئەمەریکا ڕاست دەرچوو. بەڵام لە زۆر حاڵەتی تردا ئەم گۆڕانکاریانە بە هێواشی و بەشیوەیەکی ئاشتیخوازانە ڕویدا. بۆ نمونە ئەکرێت ئاماژە بۆ هەنگاوەکانی ئەنجومەنی یاسادانانی ئینگلتەرا، سوید و وڵاتە ئەوروپیەکانی تر یان هەنگاوی یاسادانەران لە ویلایەتە یەکگرتوەکان بۆتێپەراندنی تەواوکاری دەستور و چالاکیەکانی کۆنگرە بکرێت.
ئەگەر بمانەوێت بەدیاریکراوی ئەو شتانە بژمێرین کە بە ئاراسەتی یەکسانی سیاسی لە زۆرێک لە وڵاتەکاندا بەدرێژایی چەند سەدەی دوایی ڕویداوە، ئەم حاڵەتانە هەمەڕەنگیەکی سەرسوڕهێنەریان ئەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا هەستێکەم لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئەم هۆکارانە زۆر دەوریان هەبووە.

---

**سەرچاوە:**

**وەرگێرانی فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەی خوارەوە**

**رابرت ای. دال : درباره برابری سیاسی. ترجمه: جهانگیر معینی علمداری. تهران. فرهنگ صبا. چاپ اول ١٣٨٧.**



# یەکسانی سیاسی، سروشتی مرۆڤ و کۆمەڵگا

## ڕۆبەرت ئەی دال
**لە فارسییەوە: ب. ئاران**

بەردەوام ڕێگری سەخت لەبەردەم یەکسانی سیاسیدا هەبوە، لەڕاستیدا ئەم ڕێگرانە پەشێوی وا دروست ئەکەن کە تەنانەت کاتێک پاڵنەرە دەرونیە سەرەکیەکانی مرۆڤ لە هەلومەرجێکی گونجاودا ئەوروژێن، ئەوا دیسان بەدیهاتنی ڕاستەقینەی یەکسانی سیاسی سنورداره. ڕەنگە گەر لە ڕوانگەیەکی مێژوویەوە سەیری ئەم بابەتە بکەین، دەستکەوتەکانی گەورە بێتە بەرچاو، بەڵام

بە سەرنجدان لە پێوەرە ئایدیالیەکان، ئاسایی بێتە بەرچاو.
لەم فەسڵەدا ئەمەوێت ئەوە ڕونبکەمەوە کە کام ڕێگرە بونیادیانە بونەتە هۆی ئەوەی لە ئاستێکی دیاریکراوی (یەکسانی سیاسیدا) بمێنینەوە و تەنەنات لە وڵاتە دیموکراتیەکانیشدا نەتوانین لەم ئاستە زیاتر بڕۆین. حەزئەکەم بە کورتی ئەو ڕێگرانە ڕونبکەمەوە کە لەبەردەم یەکسانی سیاسیدا ڕائەوەستن:
١- شێوەی دابەشکردنی سەرچاوە، لێهاتووی و پاڵنەرەکان.
٢- سنورداریێتی زەمەنی
٣- ئەندازەی ڕژێمی سیاسی
٤- باڵادەستی ئابوری بازاڕ
٥-بونی ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیە نا دیموکراتەکان
٦- قەیرانەکان

## ١- شێوەی دابەشکردنی سەرچاوە، لێهاتووی و پاڵنەرەکان

یاسایەکی بنەرەتی هەیە کە باڵادەستە بەسەر سروشتی مرۆڤ و کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا، کە ڕێک دژی یەکسانی سیاسی کار ئەکات: سەرچاوە سیاسی، زانین، لێهاتوویی و پاڵنەرەکان بەردەوام و لە هەموو شوێنیک بە نایەکسانی دابەشبون.
سەرچاوەیەکی سیاسی بریتیە لە هەرجۆرە ئامرازێک کە تاک بتوانێت بۆ نفوزکردن لە ڕەفتاری کەسانی دیدا سودی لێوەربگرێت. لەبەرئەوە ئەکرێت پارە، زانیاری، زەمەن، تێگەیشتن، خواردن، هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی زۆر، پیشەکان، هاوڕێیەتی، پێگەی کۆمەڵایەتی، مافە کاریگەر و واقعیەکان، بیروڕا و زۆرێک لە شتەکانی دی بگرێتەوە. لەناو هەموو ئەم سەرچاوانەدا - مافی بنەڕەتی پێویست بۆ بەدەستهێنانی دیموکراسی- ڕەنگە تاکە سەرچاوەیەکی سیاسی بێت کە لە ڕێکخراوە دیموکراتیەکاندا بەشێوەیەکی یەکسان دابەشئەکرێت. لەناو ئەمانەدا ڕەنگە مافی دەنگدان لە هەمویان بەرچاوتر بێت. بۆ ئەوەی هاوڵاتیان لە ڕووی سیاسیەوە یەکسان بە یەک دابنرێن، ئەبێت دەنگیان وەک یەک ئەژمێر بکرێت. هەروەها لە بواری یاسادانانیشدا ئەگەر نوێنەرانی هەڵبژێراو لەگەڵ یەکدا یەکسان بن، ڕای یەکسانیان ئەبێت.
بۆئەوەی هاوڵاتیان بتوانن بەشێوەیەکی کاریگەر و واقعی سود لە مافی دەنگدانی خۆیان وەربگرن، ڕژێمە سیاسیە دیموکراتیەکان ئەبێت بەرپرسیارە فەرمیەکان و هاوڵاتیانی تر ڕاسپێرن کە ڕێز لە مافی ڕای یەکسان بگرن، و بە کردەوە جێبەجێی بکەن و زامنی ئەوە بکەن کە هەموو هاوڵاتیان بە پێی پێویست خاوەنی هەلی دەنگدانن.
لەگەڵ ئەمەشدا گەر مافەکان، ئەرکەکان، و هەلەکان بە ڕادەیەک بێت کە یەکسانی ڕاکان زامن بکات، دیسان سەرچاوە سیاسیەکانی تر کە ناوم بردن، لە هەموو ڕێکخراوە دیموکراتیەکاندا بە نایەکسانی دابەشبون. بەڵام ئایا نایەکسانی دابەشبونی ئەم سەرچاوانە، کار لە توانای هاوڵاتیان بۆ بەڕێخستنی کاریگەری

ڕاکانیان ناکات بە مەبەستی بەرەوپێشبردنی ئامانج و هیوا و بەرژەوەندیەکانیان و نایەکسانی بەرهەم ناهێنێت؟
نەک تەنها سەرچاوە سیاسیەکان بە نایەکسانی دابەشبون، بەڵکو توانای هاوڵاتیان بۆ سودوەرگرتنی کاریگەر و پێویست بۆ دەستگەیشتن بە ئامانجەکانی خۆشیان نایەکسانە. دیارە لێرەدا مەبەستمان زانینی سیاسی و لێهاتووی و ئەم شتانەیە.

## زانین

ئاڵۆزی داڕشتنی سیاسەتی گشتی بە جۆرێکە کە زۆربەی هاوڵاتیان بە ئەستەم ئەتوانن تێیبگەن. هەندێکجار هەرگیز لەم سیاسەتانە ناگەن و لە ئەنجامدا توانای ئەوەیان نیە بزانن بەرژوەندیان لەچیدایە. ئەوان نازانن کام سیاسەتی پێشکەشکراو باشتر بەرگری لە بەرژەوەندیەکانیان ئەکات و بەرەو پێشەوەی ئەبات؟ و کامیان بە زیانیان تەواو ئەبێت؟ یان کاتێک سود و قازانج هەردوکیان لەئارادا بن، ئایا ئەکرێت بە لەبەرچاوگرتنی هەموو لایەنەکان، سود زیاتر بکرێت یان بە پێچەوانەوە ڕوو ئەدات؟
مەسەلەکە ئەوەیە ئایا پێناسێکی دەوڵەمەندمان بۆ بەرژەوەندی هاوڵاتیان پیشکەشکردوە یان پێناسێکی سنوردار. لە دیدێکی کۆن و جێگرتووەوە ئەکرێت پرسیارەکە بەمجۆرە بکەین:

ئایا سیاسەتی جێی باس، خێر و بەرژەوەندی گشتی دابین ئەکات؟ دیارە هەرکەسێک ئەتوانێت پێناسی خۆی بۆ ئەم چەمکە دژوارانە پێشکەش بکات. لە ڕوانگەیەکی تەواو مۆدێرنەوە ئەکرێت پرسیارەکە بەمشێوەیەوە بکرێت، ئایا سیاسەتی پێشکەشکراو بە قازانج یان زیانی ئەو کەس یان ئەو کەسانە تەواو ئەبێت کە بەجدی نیگەرانی بەرژەوەندیەکانیانە؟
لەسەرەتاکانی دەیەی ١٩٤٠وە ئەندازەگیریەکی ڕێکخراو لەبواری هەڵسەنگاندنی دید و بڕوا گشتیەکاندا ئەنجام دراوە. بەدرێژایی ئەم ماوەیە ژمارەیەکی زۆری بەڵگە کۆکراوەتەوە. لەو بەڵگانەی لەم ئەندازەگیریەوە بەدەستهاتووە ئەوە دەرئەکەوێت کە هاوڵاتیەکی مامناوەندی لە وڵاتە دیموکراتیەکاندا لە ئاستێکی زۆر نزمتردایە لە چاو هاوڵاتیەکی باش کە لە تێکستە کلاسیکی و مۆدیرنەکاندا وێنەکیشراوە. تەنها کەمایەتیەکی بچوکی هاوڵاتیان بە خەستی حەزیان بە سیاسەت هەیە. تەنانەت ژمارەیەکی یەکجار کەمتر جگە لە بەشداریکردن لە هەڵبژاردندا، چالاکیەکی سیاسی تریان نیە. واتە هیچ کەسێک بۆ دەنگدان بە کاندیدێک هان نادەن، لە هیچ حیزبێکی سیاسیدا چالاک نین و لە کۆبونەوە و خۆپیشاندانەکاندا بەشداری ناکەن و ئەندامی هیچ ڕێکخراوێکی سیاسی نین. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەکرێت هەواڵ و زانیاریەکی زۆری لەبەردەستا بێت، بەڵام زانینی ئەم هاوڵاتیە مامناوەندیە لەبارەی مەسەلە سیاسیەکان و کاندیدەکانی هەڵبژاردنە، لاوازە.

## لێهاتووی

هاوڵاتیەکی ئەسینا نەیئەتوانی بە ئەندازەی "پریکلیس" وتاربێژێکی لێهاتوو بێت و تواناکانی پریکلیسی بۆ کاریگەری لە بیروڕای هاوڵاتیان لەکاتی دەنگداندانە لە ئەنجومەنی ئەسینادا نەبوو، هاوڵاتیەکی ئینگلیزی ناتوانیت لێهاتووی وینستۆن چەرچڵی لە وتاربێژیدا هەبێت، وەک چۆن لێهاتووی ئەمەریکیەکیش بە ئەندازەی لێهاتووی "فرانکلین ڕۆزفلت" نیە. و لێهاتویی سیاسی شتی زیاتر لە لێهاتووی لە وتاربێژیدا پێویستە. لیندۆن جانسۆن وتاربێژێکی گەورە نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێهاتویەکی زۆری بۆ سودوەرگرتن لە سەرجەم سەرچاوە هەبوەکان هەبوو. بۆ نمونە ڕێوشوێنەکانی بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری چارەنوسساز دایڕشت کە لەوانە دانان و جێبەجیکردنی یاسای مافە مەدەنیەکان بوو، ئەم لێهاتویەی سەلماند. خەڵکانێک کە خاوەنی لێهاتوی سیاسی زیاترن، نەک هەر ئەتوانن سود لەم لێهاتویانە بۆ قازانج و بەرژەوەندی گشتی وەربگرن، بەڵکو ڕەنگە ئەم لێهاتویانە بە ئاراستەی دابینکردنی ئامانجە شەخسیەکان و بە زیانی هاوڵاتیانی تر بەکار بهێنن.

## پاڵنەرەکان

وەک چۆن لێهاتوی گرنگی بۆ بەدەستهێنانی نفوزی سیاسی هەیە، هەروەها لەدەستابونی پاڵنەرەکان بۆ بەکارهێنانی ئەم لێهاتوویانە، بە مەبەستی دروستکردنی و ئەنجامدانی نفوز لە بڕیارە سیاسیەکانیشدا گرنگە. دوو کەس لەبەرچاو بگرن کە هەمان لێهاتووی سیاسیان هەیە. ڕەنگە یەکێکیان بەرەو ژیانی سیاسی بڕوات، لەکاتێکدا دوهەمیان بە ڕێگەیەکی تەواو جیاوازدا بڕوات. لیندۆن جانسۆن ئەیتوانی پارێزگارێکی سەرکەوتوو بێت، بەڵام بەرز فڕینی لە سەردەمی منداڵیدا دەریئەخست کە سیاسیەکی سەرکەوتوو ئەبێت. ئەو گەیشتە پلەی سەرکۆمار. فرانکلین ڕۆزفلت ئەیتوانی هەموو تەمەنی وەک کەسێکی بەڕێزی لادێ بەسەر بەرێت، یان وینستۆن چەرچڵ ئەیتوانی لەسەر شانۆی کۆمەڵگا وەک ئەرستۆکراتێکی ئینگلیزی ئاسایی دەرکەوێت.

زۆر کەس ڕەنگە سەرچاوەکان، لێهاتووی و پاڵنەری گونجاویان بۆ دروستکردنی نفوز لە بڕیاردانە سیاسیەکاندا هەبێت، بەڵام بە دوای بەدەستهێنانی پلە و پێگەی هەڵبژاردنەوە نەبن، بەڵکو لەبری ئەمە وەک کارمەندی بەڕێوبەرایەتیەک یان وەک سەرپەرشت و بەڕێوبەر، لەڕێگەی دروستکردنی لۆبی، دابینکردنی دارایی، بەرتیلدان و گەندەڵکردنی بەرپرسیارە دەوڵەتیەکان، کارکردن لە بیروڕای گشتی و زۆر شێوازی تر، نفوز دروستبکەن. لەڕاستیدا زۆرێک لە تیورەزانانی بەناوبانگ بڕوایان وایە تەنانەت لە وڵاتە دیموکراتیەکاندا (یان بە وتەی ئەم تیورزانانە نیمچە دیموکراسیەکان) بەردەوام دەستەبژێرەکان (بەتایبەتی دەستەبژێرە ئابوریەکان) باڵادەستیان

بەسەر ژیانی سیاسیدا هەبووە. دیارە پێویست نیە نفوزی ئەم دەستەبژێرانە ئاشکرا بێت و ڕەنگە بەتەواوی شاراوە بێت.
نامەویت لێرەدا تیورەیەکی گشتی لەبارەی چۆنێتی دابەشکردنی نفوزی سیاسی لە وڵاتە دیموکراتیەکاندا پێشکەش بکەم. ئەوەی مەبەستەمە چەندانجار سادەتر و ڕونترە. دیارە ڕونی بابەتەکە لە گرنگی کەم ناکاتەوە. ڕێگەم بدەن جارێکی دی دوبارەی بکەمەوە: سەرچاوە سیاسیەکان، لێهاتوویەکان، پاڵنەرەکان بەردەوام و لە هەموو شوێنێک بە نایەکسانی دابەش ئەبن.

## سنورداری زەمەنی

لە هەموو کۆمەڵگاکاندا بەدرێژایی مێژووی مرۆڤ، زۆربەی خەڵک بەشێکی گرنگی کاتیان بۆ نفوزکردنە سەر بڕیاردانەکانی خەڵکانی تر لەناو ئەنجومەنەکاندا تەرخانکردووە کە بڕوایان وایە بۆ ژیانی ئەوان گرنگە: خیزانەکانیان، خێڵ، شوێنی کار، هاوسێکان، بنکەی بازرگانی، ئەنجومەنی پیشەیی، یەکێتی کرێکاران، یانەکان، کەنیسە و هاوشێوەکانی ئەمانە. لێرەوە سودوەرگرتن لە نفوز، دەسەڵات و بژاردەکان، لە سەرتاسەری ژیانی مرۆڤدا بڵاوبۆتەوە و سیاسەت بووە بە شتیکی هەمەکی.
بەڵام ئەوەی کە خەڵک بەشی سەرەکی کاتی خۆیان بۆ کاریگەری دانان لەسەر حکومەتی وڵات تەرخانبکەن، شتێکی جیایە. بێگومان لە بەشێکی گەورەی مێژووی مرۆڤدا، خەڵک زۆرجار دەرفەتی کەمیان بۆ نفوزکردن لە حکومەتی وڵاتەکەیاندا هەبووە، و ڕەنگە هەندێکجار هیچ دەرفەتێکیشیان دەست نەکەوتبێت. بەڵام بە دروستبونی دەوڵەتە جەماوەریەکان (دیموکراسی) و بڵاوبونەوەی ئەم شێوازی حوکمڕانیە و بڵاوبونەوەی مافی هاوڵاتی بون و مافی دەنگدان لەسەدەکانی ١٩ و ٢٠دا، نیوە یان زیاتر لە کەسانی بەتەمەن و پێگەیشتوو، بونە خاوەنی ماف و هەلی پێویست بۆ ئەوەی بەشداریەکی ئاشتیانە لەو ململانێیەدا بکەن کە لەسەر نفوزکردن لە بڕیاردانی حکومەتی ئەو وڵاتانەی کە سەر بە یاسا و سیاسەتەکانی بوون. ئەمە ڕاستیەکی دیار و ئاشکرایە کە کەمایەتیەکی بچوک لە وڵاتە دیموکراتیەکاندا، کاتی خۆیان بۆ بەدەستهێنان و ئەنجامدانی نفوزی سیاسی تەرخان ئەکەن، لەکاتێکدا کە زۆرینەی خەڵک وا ناکەن.
بەهەرحاڵ زەمەن سەرچاوەیەکی دەگمەن و نەگۆڕە. ئەگەر تاکەکەس کاتێک بۆ ئەنجامدانی چالاکیەک تەرخان بکات، ئەوکاتە ناچارە کاتێکی کەمتر بۆ چالاکیەکانی تر تەرخانبکات. ئەم هەقیقەتە سادە و سەرەتاییە، دەرئەنجامی ناچاریانەی بۆ یەکسانی سیاسی ئەبێت:
١- ئەو کردارانەی لەبەر بەدەستهێنانی نفوزی سیاسی ئەنجام ئەدریت، کات ئەبڕن. کەسانی جیاواز هەڵسەنگاندنی جیاوازیان بۆ سود و ڕادەی بەکارهێنانی کات بۆ بەدەستهێنانی نفوزی سیاسی هەیە. ئەو کەسانەی حەز ئەکەن کاتێکی زیاتری بۆ تەرخان بکەن، ڕەنگە نفوزێکی

زیاتریان لە بڕیارە سیاسیەکاندا هەبێت. لێرەوە گەر هەموو هۆکارەکانی تریش بە یەکسان دابنێین، ئەوا تەرخانکردنی کاتێک لەلایەن هاوڵاتیانی جیاوازەوە، نفوزیکی نایەکسان بەرهەم دێنێت. ئەمەش خۆبەخۆ ئەبێتە هۆی نایەکسانی سیاسی لەنێوان هاوڵاتیاندا.

٢- تەنانەت لەو یەکە سیاسیانەدا کە ڕەهەندەکانی بچوکی یەکە سیاسیەکە، ڕێگە بە بەشداری ڕاستەوخۆی هاوڵاتیان لە بڕیارە سیاسیەکاندا ئەدات، بۆچونی جیاواز سەبارەت بە سود و ڕادەی سودوەرگرتن لە کات، ئەبێتە هۆی دەرکەوتنی هەندێک نایەکسانی سیاسی لەناو هاوڵاتیاندا. لەکاتی لوتکەی دیموکراسی ئەسینادا لە سەدەی پێنجی پێش میلادی، بەکردەوە تەنها بەشێکی بچوکی هاوڵاتیان لە شانۆکەدا ئامادە بوون. هاوکات لەگەڵ زیادبووی ژمارەی هاوڵاتیان، ماوەی پێویست بۆ ئەوەی هاوڵاتی بتوانێت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشداری لە بڕیارەکانی حکومەتدا بکات، بەخێرای گەیشتە ئاستێک کە تەنانەت گەر هاوڵاتیان توانای ئەوەیان هەبوایە کە لە دانیشتنەکاندا ئامادە بن، دیسان زۆربەیان نەیان ئەتوانی بەشێوەیەکی کامڵ بەشداری لە وتوێژەکاندا بکەن. مافی هاوڵاتیان بۆ قسەکردن لە دانیشتنەکانی شاردا لەبەرچاو بگرن. هەرئەوەندەی ژمارەی ئەو هاوڵاتیانەی ئارەزوو ئەکەن بەشداری لە وتوێژەکاندا بکەن زیاد ئەبێت، ڕادەی بەکارهێنانی کات بە توندی سەرئەکەوێت. یەکەیەک لەبەرچاو بگرن کە لە ٢٠ کەس پێکهاتووە. ئەگەر هەر یەکێک بڕیار بێت تەنها ١٠ خولەک قسەبکات، ئەوا دانیشتنەکە پێویستی بە دوسەد خولەک، واتە زیاد لە سێ کاتژمێر هەیە، لە یەکەیەک کە لە ٥٠ هاوڵاتی پێکهاتووە، ئەگەر هاوڵاتی مافی ١٠ خولەک قسەکردنی هەبێت، پێویستمان بە هەشت کاتژمێر ئەبێت. هەرئەوەندەی ژمارەی هاوڵاتیان لە یەکەیەکی سیاسی دیموکراتدا زیاد ئەبێت، کاتی پێویست بۆ بەشداری ڕاستەوخۆ بەجۆرێک ئەچێتە سەرێ کە تەحەمول ناکرێت. هەر کاتێک ئەندازەی یەکەیەک ئەوەندە گەورە بێت کە هەموو هاوڵاتیان نەتوانن بەشێوەی ڕاستەوخۆ بەشداری لە یاساداناندا بکەن، سێ ڕێگە چارەیان لەبەردەمدایە. لە ڕێگەی یەکەمدا یەکەیەکی سیاسی دیموکراتی زیاتر لە ٢٠ کەس، دابەش ئەبێت بۆ یەکەی سیاسی بچوکتر. لە زوربەی حاڵەتەکاندا ئەم ڕێگە چارەیە پراکتیکی نیە. دوهەم، ژمارەی ئەو کەسانەی لە ئەنجومەنی شاردا بەشداری و قسە ئەکەن، بە ڕەزامەندی فەرمی یان ناوەخنی هاوڵاتیان کەم بکرێتەوە. ئەم ڕێگە چارەیە لە ئاستی یەکەیەکی شاردا، ئەتوانێت تاڕادەیەک یەکسانی سیاسی و ئەگەری بڕیاردانی دیموکراتی لە ئاستێکی بەرێژە بەرزدا دەستەبەر بکات. بەڵام گەر سەرژمێری هەروا زیاد بکات و ڕێژەی ئەو هاوڵاتیانەی کە ئەتوانن بەشێوەی ڕاستەخۆ بەشداری لە بڕیارەکاندا بکەن، بە بەراورد بە کۆی سەرژمێری خەڵک، کەمتر و کەمتر بێتەوە، ئەوا ئەم شێوەیە چیدی پراکتیکی نابێت. لە ئێستادا یەکێک لە شێوازە دیاریکراوەکانی چارەسەری کێشەی سنورداریێتی زەمەن ئەوەیە

که هاوڵاتیان ژمارەیەکی دیاریکراوی نوێنەر هەڵبژێرن و ئەم نوێنەرانە بەشێکی گرنگی کاتی خۆیان بە نوێنەرایەتی کۆی ئەندامانی یەکەکە بۆ بڕیاردان تەرخانبکەن. دیارە ئەم سێهەم ڕێگە چارەیە لە هەموو وڵاتە دیموکراتیەکاندا قەبوڵکراوە. لەڕاستیدا هاوڵاتیان دەسەڵاتی خۆیان لە بواری بڕیرداندا، بەم نوێنەرانە ئەبەخشن.

لێرەوە ئێمە ڕوبەڕوی سنورداریتیەکی تر لە بواری ئەگەرە سیاسیەکاندا ئەبینەوە. یاسای زەمەن و ژمارەی تاکەکان: هەرچەند سەرژمێری یەکەیەکی سیاسی دیموکرات زیاتر بێت، ژمارەیەکی کەمتری هاوڵاتیان ئەتوانن بەشدار لەو بڕیاردانەدا بکەن کە پەیوەندی بە حکومەتەوە هەیە، ئەگەری ئەوەی هەڵبژاردنەکانی خۆیان بەخەڵکی دی بسپێرن زیاتر ئەبێت.

### ٣- کێشەی ئەندازە

کاتێک بیر لە ئەندازەی یەکەیەکی سیاسی ئەکەینەوە، مەسەلەکە لە زیهنی ئێمەدا ڕەهەندی جیاواز وەرئەگرێت. بۆ نمونە ڕەنگە بکرێت لە چەند ڕەهەندێکی جیاوازی وەک کۆی سەرژمێری، ژمارەی هاوڵاتیانی پێگەیشتوو یان سەرجەم پانتای سنورەکە تاوتوێی بکەین. ئەگەر پێوەرەکە بە ڕێکخراوێکی سیاسی تایبەت دابنێین، لەم ڕێکخراوە سیاسیەدا هەموو ئەم مەسەلانە پەیوەندیان بەیەکەوە ئەبێت. ئەگەر پانتایی ئەو ناوچانەی لەژێر کۆنترۆڵی ڕێکخراوێکی سیاسیدان زۆرتر بێت، ژمارەی دانیشتوانیشی ڕەنگە (نەک بە ناچار) زیا ئەکات و ڕەنگیشە بەمشێوەیە ژمارەی دانیشتوانی پێگەیشتووی ڕوو لە زیادبون بکات. لە درێژەی باسەکەدا بە ئەنقەست دوو هۆکاری پانتایی زەوی و کۆی سەرژمێری ئەخەمەلاوە، تەنها سەرنج لە ژمارەی دانیشتوانی پێگەیشتوو ئەدەم (کە بەناوی سادەی هاوڵاتی ناویان ئەهێنم).

کێشەی ئەندازە: هەرچەند یەکەیەکی سیاسی بچوکتر بێت، توانا بەزەبریەکانی بۆ بەشداری هاوڵاتیان زۆرتر و پێویستی هاوڵاتیان بە سپاردنی بڕیاردان لە مەسەلەکانی حوکمڕانیدا بە نوێنەران کەمتر ئەبێتەوە. بەڵام چەند ئەندازەی یەکەیەکی سیاسی گەورەتر بێت، قابیلیەتی بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی چارە بۆ کێشەکانی هاوڵاتی زیاتر و پێویستی هاوڵاتیان بە سپاردنی بڕیاردان بە نوێنەران زیاتر ئەبێت.

پێش ئەوەی باسی کاریگەرە نێگەتیڤیەکانی زیادبونی ئەندازە لەسەر یەکسانی سیاسی بکەم، حەزئەکەم ئاماژە بۆ ئاوارتنێکی یەکجار گرنگ بکەم: ئەگەر زیادبونی ژمارەی هاوڵاتیان دەرئەنجامی زیادبونی ژمارەی کەسە پێگەیشتوەکان بێت کە خاوەنی مافی هاوڵاتی کامڵن (بۆ نمونە مافی دەنگدان بارودۆخێکی وای دروست کردبێت) ئەوکات کاریگەرە پۆزەتیڤەکانی ئەمە بۆ یەکسانی سیاسی شتێکی زیاتر ئەبێت لە دەستکاری دەرئەنجامە نێگەتیڤەکانی زیادبونی ژمارەی هاوڵاتیان. لە فەسڵەکانی دواییدا باسی ئەمە ئەکەم. لە

درێژەی ئەم باسەدا بۆ ئەوەی جەختی زیاتر لەسەر هاوڵاتیانی پێگەیشتوو بکەم، ئەم ئەگەرە بە دور ئەگرم.
جگە لەو حاڵەتانەی سەروکارمان لەگەڵ یەکەی سیاسی زۆر بچوکدا هەیە، لە حاڵەتەکانی تردا هاوڵاتیان ئەبێت بەشێکی جێی سەرنج لە ئیرادە و ویستی خۆیان بە کەسانی دی (لەوانە کارمەندی دەزگاکانی بەڕێوەربردن، بەڕێوبەران، ڕێکخەرانی کۆنوسی دانیشتنەکان، دادوەرەکان و کەسانی دی) بسپێرن. بۆ نمونە لە ئەسینای سەردەمی کلاسیکدا هاوڵاتیان دەسەڵاتی خۆیان بۆ دیاریکردنی کارنامە و بەرنامەی دانیشتنەکانی ئەنجومەنیان بە ئەنجومەنیکی ٥٠٠ کەسی ئەسپارد، و ئەندامانی ئەم ئەنجومەنەش بە تیروپشک هەڵئەبژێران. لە دانیشتنەکانی ئەنجومەنی شاری نیوئینگلەند، دەسەڵاتی جێی سەرنج بە ئەنجومەنی بەڕێوەبردن درابوو. ئەم ئەنجومەنی بەڕێوەبردنە بۆ نمونە لە کانکتیکات Connecticut ناسراو بوو بە ئەنجومەنی هەڵبژێراوان. یەکەم کەسی هەڵبژێراو لەم ئەنجومەنەدا بە عەمەلی ئەبوو بە قایمقامی شارەکە. لە ڕێکخراوەکە گەورەترەکانی وەک شار، پارێزگا، ناوچە، ویلایەتێک لە ئەمەریکا، وڵات یان ڕێکخراوێکی نێونەتەوەیی، تەنانەت بەشێوەیەکی کامڵتر دەسەڵاتی هاوڵاتیان بە مەرجەعەکانی بڕیاردانی ئیداری و دادوەری بەشێوەیەکی کامڵتر سپێردراوە.
نوێنەران بە بەراورد بە هاوڵاتی ئاسایی، هەلی باشتریان بۆ نفوزکردنی ڕاستەخۆ و بڕیاردان لەبەردەستدایە. لێرەوە دەسەڵاتەکانیان ئەتوانێت کێشە بۆ یەکسانی سیاسی دروستبکات. چۆن دەنگدەران ئەتوانن دڵنیابن کە نوێنەرانی هەڵبژێراو و ئەوانەی دایان ئەنێن، ئەو جۆرە سیاسەتانە پەیڕەو ئەکەن کە بە وردی دەربڕی دید و بەرژەوەندیەکانی هەموان یان هیچ نەبێت زۆرینە بێت؟ بەیەک ڕستە نوێنەران چۆن ئەتوانن وەڵامدەرەوەی هاوڵاتیان بن؟
تەنانەت سپاردنی دەسەڵات بە نوێنەرانی هەڵبژێراویش ئەو کاریگەریانە لەناو نابات کە دەرئەنجامی ئەندازەن. کاتێک پانتایی یەکەیەک فراوان ئەبێت، ئەگەری زیادبونی ژمارە و ئاڵۆزی سیاسەتە گشتیەکانیش زیاتر ئەبێت و ئەمەش پێویستی بە زیادبونی بەردەوامی ڕوبەری زانین هەیە. تێگەیشتنی هاوڵاتی بۆ مەسەلەکانی شارێک بە سەرژمیری ٥٠٠ یان ٥٠٠٠ کەس بە بەراورد بە تێگەیشنی مەسەلەکان لە یەکەیەکی سیاسی سەد هەزار کەسیدا یان یەک ملیۆن کەسی یان سەد ملیۆن کەسیدا بەتەوای جیاوازە.
هەروەها پانتایی یەک ڕوبەری سیاسی، لە کرداردا سنورداریێتی بۆ ئەندامانی ئەنجومەنەکانی نوێنەرایەتی دروست ئەکات. ژمارەی نوێنەران لە پەوەیەندیدایە بە زەمەنەوە: هەرچەند ژمارەی ئەو هاوڵاتیانەی نوێنەریک نوێنەرایەتیان ئەکات زیاتر بێت، زەمەنیکی کەمتری بۆ بینینی هاوڵاتیان بەشێوەیەکی ڕاستەخۆ یان دروستکردنی پەیوەندی ناڕاستەخۆ لەڕێگەی پۆست، تەلەفون یان پۆستی ئەلەکترۆنیەوە ئەبێت. دیارە نوێنەری

ناوبراو ئەتوانێت لەڕێگەی ئەندامانی مەکتەبەکەوەیە، پەیوەندی خۆی بە بازنەی هەڵبژاردنی خۆیەوە ئاسان بکات، وەک چۆن هەموو ئەنجومەنەکانی نوێنەرایەتی مۆدێرن وا ئەکەن. لەگەڵ ئەمەشدا کات و ژمارەی تاکەکان سنورداریێتیەکی زۆر بۆ ئاڵوگۆڕی بیروبۆچنی کاریگەرە لە نێوان نوێنەر و خەڵکی بازنەی هەڵبژاردنەکەیدا دروست ئەکات.

ڕێژەی نوێنەران بۆ سەرژمێری لە هەندێک لە وڵاتە دیموکراتیەکاندا

| وڵات | کۆی ژمارەی نوێنەرانی هەڵبژێراوی دەزگای تەشریعی | کۆی ژمارەی هەڵبژێراوان بۆ ئەنجومەنی نوێنەران | سەرژمێری (ملێۆن) | ژمارەی کەسەکان بۆ هەر ئەندامیکی ئەنجومەنی نوێنەران |
|---|---|---|---|---|
| ئوستورالیا | ٢٢٦ | ١٥٠ | ٩/١٩ | ٧٥٤/١٣٢ |
| نەمسا | ٢٤٥ | ١٨٣ | ٢/٨ | ٦٧١/٤٤ |
| بەلجیکا | ٢٢١ | ١٥٠ | ٣/١٠ | ٩٨٩/٦٨ |
| کەنەدا | ٤١٣ | ٣٠٨ | ٥/٣٢ | ٥٤٥/١٠٥ |
| فەڕەنسا | ٩٢٣ | ٥٧٧ | ٤/٦٠ | ٧٢١/١٠٤ |
| ئەڵمانیا | ٦٧٢ | ٦٠٣ | ٤/٨٢ | ٦٩١/١٣٦ |
| هندستان | ٧٩٣ | ٥٤٥ | ١٠٦٥ | ٢٥٨/٩٥٤/١ |
| ئیتاڵیا | ٩٤٥ | ٦٣٠ | ١/٥٨ | ٥٥/٩٢١ |
| ژاپۆن | ٧٢٢ | ٤٨٠ | ٣/١٢٧ | ٢٧٢/٢٦٥ |
| مەکسیک | ٦٢٨ | ٥٠٠ | ١٠٥ | ٩١٩١/٢٠٩ |
| ئیسپانیا | ٦٠٩ | ٢٥٩ | ٢/٤٠ | ٥٢٤/١٥٥ |
| بریتانیا | ١٢٥٩ | ٦٩٥ | ٣/٦٠ | ٤٥٨/٩١ |
| ویلایەتە یەکگرتووەکان | ٥٣٥ | ٤٣٥ | ٢٩٣ | ٦٢٧/٦٧٣ |
| ڕێژەی مامناوەندی | ٦٣٠ | ٤٢١ | ١٥١ | ٤٣٠/٣١٠ |

ئەگەرچی ئەنجومەنی یاسادانان لە وڵاتە دیموکراتیە مۆدێرنەکاندا، لەڕوی ئەندازەوە جیاوازیەکی بەرچاویان لەگەڵ یەکدا هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەرجەم حاڵەتەکاندا هەریەک لە ئەندامانی ئەم ئەنجومەنانە، نوێنەرایەتی ژمارەیەکی بەرچاوی تاکەکان ئەکەن.

بۆ هەر ٦٧٣ هەزار ئەمەریکی، یەک ئەندامی کۆنگرە هەیە. لە ئەڵمانیادا یەک کەس نوێنەری ١٣٧ هەزار ئەڵمانیە. لە دۆخی توندتردا واتە هندستان یەک نوێنەر بۆ دوو ملیۆن هندی هەیە. تەنانەت وڵاتە دیموکراتیە بچوکەکانیش ناتوانن سنورەکانی پەیوەندی بە ژمارەوە هەیە چارەسەر بکەن. لێرەوە ئەندامی ئەنجومەن لە وڵاتێکی دیموکراتیدا تەنانەت بە سودوەرگرتن لە جدیترین تەکنەلۆژیش ناتوانێت جگە لە ڕێژەیەکی زۆر کەم لە دانیشتوانی بازنەی هەڵبژاردنی نەبێت، بچێتە وتوێژیکی جدی و دورودرێژەوە.

لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە بڵێم زیادبونی پانتایی ڕێکخراوێکی سیاسی و تەفویزی دەسەڵات کارێکی باش نیە. بە پێچەوانەوە ئەگەر هەموو ڕەهەندەکان لەبەرچاو بگرین، ئەکرێت زۆر باشیش بێت. لەگەڵ ئەوەشدا چارەسەری کێشەی ئەندازە لەڕێگەی زیادکردنی ژمارەی ئەو کەسانەی ئەخرێنە ناو ڕێکخراوی سیاسیەوە، بە ویست یان ناویست ڕێگر بۆ دەستگەیشتن بە یەکسانی سیاسی لەنێوان هاوڵاتیاندا دروست ئەکات.

### ٤- بونی ئابوریەکی بازاڕ

بونی ئابوریەکی بازاڕ وەک دەزگایەکی سەرەکی لە بواری دابەشکردنی کاڵا و خزمەتکردندا، بە هێزێکی گرنگ ئەژمێرێت بۆ زیادبونی ئەندازەی ڕێکخراوە سیاسیەکان. بە درێژای سەدەی نۆزە و بەشێکی زۆری سەدەی بیست زۆرێک لە ڕۆشنبیران، سیاسەتمەداران، کرێکاران و هەندێک کەسی تر، لەبەرامبەر ئابوری بازاڕدا بەرگریان لە ئەڵتەرناتیڤی تر کردووە. ئەم ئەڵتەرناتیڤانە موڵکایەتی دەوڵەتی بۆ بنکە ئابوریەکان، بەڕێوەبردنیان لەڕێگەی دەوڵەتەوە، هەروەوەزی بونی بنەکە ئابوریەکان و ئەوەی کە موڵکایەتی و بەڕێوەبردنیان بگوێزرێتەوە بۆ کرێکاران و مەسرەفکەران، ئەگرێتەوە. لە ڕێکخراوە سەرمایەداریەکاندا بڕیاردان بە شێوەیەکی سەرەکی لەسەر بناغەی بازاڕ (بۆ نمونە لەسەر بناغەی نرخەکان. موچەکان) دیاری ئەکرێت، لەکاتێکدا بە پێی دیدی سۆشیالیستی، ئەم بڕیاردانە بە شێوەیەکی لاوەکی یان سەرەکی، لەلایەن پلەدارەکانی حکومەتەوە یان هەندێک ئەلتەرناتیڤی تر بۆ بازاڕ دیاری ئەکرێت. دیارە من پێشنیارەکانی بەرنامەکانی سوشیالیستەکان و ڕەخنەگرانی تری سەرمایەداریم بەشێوەیەکی سادە پێشکەش کرد. بەهەرحاڵ لێرەدا ئەبێت ئەو خاڵە بڵێم کە ڕێک پێش کۆتایی سەدەی بیستی میلادی ئەم ئەڵتەرناتیڤانەی سەرمایەداری بازاڕ، بابەتیبونی خۆی لە وتوێژە گشتیەکاندا لەدەستدا و درێژەی بە ژیانی خۆی تەنها وەک پاشماوەیەکی مێژوویی لە ژێر ناونیشانی حیزبەکانی چەپدا (سوسیالیست و سوسیال دیموکرات)دا و وازی لە هەموو خەونەکانی پێشوی خۆی بۆ کۆمەڵگایەکی سوشیالیستی یان کۆمنیستی هێنا. هەنوکە هیچ یەک لە حیزبە سەرەکیەکان لە وڵاتە پێشکەوتوە سەرمایەداریەکاندا بەرگری لە ڕۆیشتن بەرەو

بەدیهاتنی ئامانجی موڵکایەتی کۆمەڵایەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان ناکەن.
بە پێچەوانەی دیدی لایەنگرانی تیۆرانینە سوشیالیستی و بەرگریکارانی بەرنامەڕێژی ناوەندی و ڕەخنەگرانی تر کە بڕوایان بە جێگرتنەوەی کامڵ یان بنەڕەتی بازاڕەکان بە هۆی جۆرێک ئابوری نابازاڕیەوە هەیە، ئەزمونی سەدەی بیست بەشێوەیەکی کامڵ سەلماندی کە ئابوریەکی نابازاڕی زۆر ناکارایە و لەوڕووەوە کە جڵەوی مەسەلەی بڕیاردانی ئابوری، بەناچار لەدەست دەوڵەتدایە، کەوابوو ئەمە لەگەڵ بنەمای بونی چاودێری بەسەر ڕابەراندا ناکۆکە. لەلایەکی دیەوە لە ئابوریەکی مۆدێرندا کە لەسەر بناغەی بازاڕ دامەزراوە، کارەکتەری بێئەژمار بەشداری لە بڕیارە بێ ئەژمارەکاندا ئەکەن. هەریەک لەم بڕیارانە بە سەربەخۆ لە بڕیارەکانی تر ئەدرێن و خاڵی دەرچونیان بەرژەوندی تەسکی شەخسیە. زانیاریەکانی لە بازاڕەوە بەدەست دێن، ڕێنمای ئەم پرۆسەیە ئەکەن و لە ئەنجامدا بەرهەمهێنانی کاڵا و خزمەتگوزاری بەشێوەیەکی چەندان جار کاراتر لە ئەڵتەرناتیڤە ناسراوەکان بۆ ئابوری بازاڕ ئەنجام ئەدرێت. بەرهەمی ئەمە ڕێکخستن و دیسپلینێکی سەرسوڕهێنەرە.
جگە لەمە داماڵینی ناوەندێتی لە بڕیاردانداو بڵاوکردنەوەی لەناو ژمارەیەکی زۆری بنکەدا، ڕێگری لە زیادبونی زیاد لە سنوری چڕبونەوەی دەسەڵات ئەکات کە تایبەتە بەو ڕێکخراوانەی لەژێر چاودێری ناوەندیدان. ئەم خەسڵەتە و هەندێک مەسەلەی تر ئەبێتە هۆی ئەوەی کە ئابوری بازاڕ بە بەراورد بە ئابوریە ناوەندیەکان و ئابوریەک کە لەژێر بەڕێوبەرایەتی دەوڵەتدایە، زۆرتر لەگەڵ دیموکراسیدا بگونجێت. لەهەمانکاتدا ئابورەیە ناوەندیەکان و ئەو ئابوریانەی لەژێر بەڕێوبەرایەتی دەوڵەتدان، بەشێوەیەکی سەرەکی بە خەسڵەتە دیارەکانی دەوڵەتە دەسەلاتگەر و تۆتالیتارەکان ئەژمێرێن.
لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئابوری بازاڕ لەگەڵ هەموو باشیەکانیدا دوو دەرئەنجامی نێگەتیڤی لەگەڵ خۆیدا هەیە. ئەم دەرئەنجامانە کێشەی نەگۆڕ بۆ ڕێکخراویکی دیموکراسی دروستئەکەن.
یەکەم ئابوری بازاڕ کە ڕێسای نیە تەنانەت ڕێساشی هەبێت- بەناچار و بەردەوام زیان بە کۆمەڵێک ئەگەیەنێت، و هەندێکجار ژمارەی ئەوانەی زیانیان پێ ئەگات یەکجار زۆر ئەبێت. لەبەر ئەو گۆڕانە دینامیکیانەی بەردەوام لەناو دڵی ئابوری بازاڕدا ڕوو ئەدات، ئەم زیانانە چەندان ئەوەندەیان لێدێت. بۆ نمونە ئەکرێت ئاماژە بۆ ئەم حاڵەتانە بکرێت: بێکاری، سنورداربونی بەکارهێنانی تاکەکان بە لێهاتوی کەمتر. فەقیربونی تاکەکان، فەقیری نەگۆڕ، بەس نەبونی پەناگاکان کە ئەتوانێت لەدەستدانی خانوی تایبەتیش بگرێتەوە تا نوستن لەناو شەقامدا، نالەباری هەلومەرجی فەزای کار کە ئەتوانێت ببێتە هۆی نەخۆشی، بێ تواناى جەستەی و مردن، بریندار بونی کەرامەت و بڕوابون بەخۆ و هەستی ڕێز، دورکەوتنەوە لە جێگە و شوێنی ژیان کە ئەبێتە هۆی لەدەستدانی

دراوسێ و هاوڕێکان.
دوهەم: ئابوری بازاڕ (ئابوری سەرمایەداری لەسەر بناغەی بازاڕ لە شکڵی جیاوازدا) بەناچار نایەکسانی لەنێوان هاوڵاتیاندا لە ئاستی سەرچاوەکاندا دروستئەکات. ئەم نایەکسانیانە تەنها دەرامەت و سامان ناگرێتەوە، بەڵکو بەشێوەی ڕاستەخۆ یان ناڕاستەوخۆ، نایەکسانی لەبواری زانیاری، پێگەی کۆمەڵایەتی، پەرەوەردە، ئەگەری دەستگەیشتن بە دەستەبژێرە سیاسیەکان و زۆر شتی تریش ئەگرێتەوە. ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد کە ئەم سەرچاوانە بە خێرایی ئەبن بە سەرچاوەی سیاسی. ئەکرێت سود لەم سەرچاوانە بۆ بەکارهێنانی نفوز، دەسەڵات و دەسەڵاتکردن بەسەر ئەوانی دیدا وەربگیرێت. کاتێک نایەکسانی لە سەرچاوە سیاسیەکان بەو نایەکسانیانە موتربە بکرێت کە لە ئابوری بازاڕەوە دێت، نایەکسانی زیاتر ئەبێت.
لەو ڕووەوە کە دەزگا سیاسیە دیموکراتیەکان، ئەو توانایە بە زەرەرمەندانی بازاڕ ئەبەخشن کە بەدوای گۆڕانەوە بن و هەندێکجاریش لەمەدا سەرکەوتوو ئەبن، لێرەوە سنورداریتی نێوان دەوری ڕێکخەری دەوڵەت و بازاڕ، بەردەوام لە جوڵەدایە. جگە لەمەش چەندان هەنگاو بە ئاراستەی کەمکردنەوەی کردارە خراپەکان، سەختی و تاڵی خودی سەرمایەداری بازاڕی بێ ڕێسا نراوە. ئەم هەنگاوانە سەرەتا لە سەردەمی ڕابەرایەتی بیسمارک – کە بە سەختی ئەتوانین بە لایەنگری سوسیالیسمی بزانین- دەستی پێکرد و پاشان بە درێژای سەدەی بیستەم هەموو دیموکراسیە پێشکەوتوەکان (بەکەمێک دواکەوتن ویلایەتە یەکگرتوەکان) لە ئاستێکی بەربڵاودا قەبوڵیانکرد. لە بەختی ڕۆژگار دەوڵەتی خۆشگوزەرانی بە ناسککردنی دەرئەنجامە سەختەکانی ئابوری سەرمایەداری بازاڕی، بۆ ئەو کەسانەی زۆرترین زیانیان پێگەیشتووە، پاریزگاری لە ئابوری سۆسیالیستی بازاڕی دیسان کەمکردەوە.
بە گشتی ئابوریەکی دامەزراو لەسەر بازاڕ بەشێوەیەکی بەردەوام زیانی جدی بە هەندێک هاوڵاتی ئەگەیەنێت، هەروەها سەرمایەداری بازاڕ بە دروستکردنی نایەکسانی گەورە لە ئاستی سەرچاوەکاندا لەنێوان هاوڵاتیاندا، بە ناچار ئەبێتە هۆی بەهێزبونی نایەکسانی سیاسی لەنێوان هاوڵاتیانی وڵاتێکی دیموکراتیدا. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا وڵاتە دیموکراتیە مۆدێرنەکان، ئەڵتەرناتیڤێکی پراکتیکی و قابیلی جێبجێکردنیان بۆ ئابوری سەرمایەداری بازاڕ نیە.

## ٥- پێویستی بە ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیە نادیموکراتیەکان

بە کورتی ئەکرێت بەسێ ڕستە ئەو کێشەیە دەربڕین کە ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان بۆ یەکسانی سیاسی دروستی ئەکەن:
١- ئەو بڕیارانەی لەئاستی ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکاندا ئەدرێت، بۆ هاوڵاتیانی وڵاتە دیموکراتیەکان وەک ئەوانی تر، دەرئەنجامی گرنگی هەبووە.

٢- زۆرێک لەو بڕیارانەی لە ئاستی ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکاندا دراون، دەرئەنجامی زۆر پۆزەتیڤیان هەبووە.
٣- لەگەڵ ئەمەشدا بڕیاردان لە ئاستی ڕێکخراوی نێو دەوڵەتیدا، نە شکڵی دیموکراتی هەیە و نە ئەتوانێت وا بێت.
سەبارەت بە ڕستەی یەکەم بە دەگمەن ئەکرێت گومانی لێبکرێت. بۆ نمونە ناوی ئەم حاڵاتانە بهێنین: یەکێتی ئەوروپا، سنوقی نێودەوڵەتی پارە، بانقی جیهانی، ڕێکخراوی نێونەتەوەی کار، ڕێکەوتننامەی بازرگانی ئازادی ئەمەریکای باکور، ڕێکخراوی ئەتلانتیکی باکور، ڕێکخراوای وڵاتە ئەمەریکیەکان، ڕێکخراوی نێونەتەوەکان، بەرنامەی گەشەپیدانی ڕێکخراوی نێو نەتەوەکان، و ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی.

بۆ ئەم هەمووە ئەبێت ئەو ئەنجامانەش زیاد بکەین کە دەرئەنجامی کارکردنی بازارەکان و بنکە جیهانیەکانە.
زۆرێک لە خەڵک گومان لە ڕستەی دوهەمیش ناکەن، هەرچەند ڕەنگە بەتوندی لەگەل سودخوازی و پێویستی هەندێک لە بڕیارەکان، ڕێکخراوەکان و سیستەمەکەدا نەبن.
لەهەڵ ئەمەشدا ئەگەر سێهەم ڕستە ڕاست بێت، ئەوکاتە ڕوبەڕوی کێشەیەکی قوڵ و جدی لەگەڵ دیموکراسی و هەروەها یەکسانی سیاسی ئەبینەوە. کاتێک باسی بڕیارەکانی ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان ئەکرێت، من چوار پرۆسەی کۆمەڵایەتی - سیاسی بنەڕەتی بە ئاراستەی گەیشتن بە بڕیاری دەستەجەمعی لەبەرچاو ئەگرم: زنجیرە پلەکان، چاودێری بەهۆی ڕابەرانەوە، زۆر بڵێی و مامەڵەکردن یان چاودێری لەناو ڕابەراندا، سیستەمی نرخاندن، یان چاودێری ڕابەران لەڕێی ڕابەرانەوە، و دیموکراسی یان چاودێری بەسەر ڕابەران.
دیارە ئەوەی گوتمان مەسەلەی زۆر سادە و تەجریدین و هیچکات لەوانە لەوڵاتێکی دیموکراتی مۆدێرندا بەشێوەیەکی پەتی و جیا لە بابەتەکانی تر بونی نیە. لەڕاستیدا هەرچی لە نزیکترەوە ڕێکخراوێکی دیاریکراوی ببینین و لیی بکۆڵینەوە، پەیوەندی دولایەنە و تەنگاوتەنگی ئەم چوار پرۆسەیە - کە لەڕوی تیوریەوە قابلی جیاکردنەوەیە لە یەکتر - شکڵێکی ئاڵۆز وەرئەگرێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەکرێت خاڵی سەرەکی کەمتازۆر بەمشێوەیە دەرببڕێت: بڕیاردان لە ئاستی ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکاندا زنجیرە پلەکان، گفتوگۆ و قسەکردنی دەستەبژێرەکان لەگەڵ یەکدا و سیستەمی نرخ ئەگرێتەوە. لەم ناوەدا ئەوەی بە تەواوی سەرنج ڕائەکیشێت نەبوون یان ئیفلیجی چاودێری دیموکراتیانەی کاریگەرە بەسەر بڕیاردەراندا.
لەم حاڵەتەدا ئەم پرسیارەی خوارەوە بە بیردا دێت: ئایا ئەکرێت چاوەڕێی ئەوە بین دەزگا سیاسیە بنەڕەتیەکان هاوشان لەگەڵ دیموکراسی نوێنەرایەتی مۆدێرن، لە ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکاندا گەشە بکات و پەرە بسێنێت؟ بە هۆی جیاواز وەڵامی گومانکارانە بەم پرسیارەوە قابیلی پاساوە.
١- دروستکردنی دەزگاکان بە ئەنقەست.

شکڵگیری دەزگاکان خۆبەخۆ و بەشێوەی پەرەسەندنی کوێرانەی داروینی نیە. جگە لە یەکێتی ئەوروپا، من هیچ تیشکێکی ڕوناک بۆ دروستکردنی دەزگای دیموکراتی لەناو دەزگا نێو دەوڵەتیەکاندا نابینم. خەیاڵی ئەوەی بڕیارەکانی بانکی جیهانی یان ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی ڕۆژێک بە هۆی ئەنجومەنێکی یاسادانانەوە دابنرێت، کە لەو نوێنەرانە پێکهاتووە کە بەشێوەیکی ڕاستەوخۆ لە لایەن خەڵکی ئەو وڵاتانەوە هەڵبژێراون کە بەرژەوەندیان پێوەی هەیە، خەیاڵێکی پڕوپوچە.

٢- ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان تا ڕادەیەک کێشەی پانتایی توندتر ئەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا کە بونی دەوڵەتە گەورەکان پێوەری ئالەنگارەکان (تەحەداکان) سەبارەت بە یەکسانی سیاسی بە پلەی کۆتایی خۆی ئەگەیەنن، ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان تەنانەت ئەم ئالەنگارە زیاتر ئەکەن.

٣- هەمەڕەنگی ئەزمونە مێژوییەکان، شوناسەکان، کلتورەکان، بەهاکان، باوەڕەکان، وەفاداریەکان، زمانەکان و شتی لەم بابەتە، ئەگەری دروستبون و چالاکیەکانی دەزگا دیموکراتیەکان لەناو ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکاندا تا ڕادەیەکی زۆر ئەستەم کردوە. چ لەڕوی تیوری و چ لەڕوی ئەزمونیەوە ڕێژەیەکی کەموکوڕ و ناتەواو لەنێوان ئەندازە و فرەییدا هەیە. بۆ نمونە فرەیی کلتوری لە بەلجیکا و سویسرا بهێنە بەرچاوی خۆتان. بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندی ئەم دوانە پۆزەتیڤە، واتە زیادبونی پانتایی (نەک لەڕوی ژمارەی هاوڵاتیانەوە، بەڵکو لەڕوی ڕوبەرەوە) ئارەزوی جیاوازی زیاتر ئەکات. پێئەچێت ئەم بابەتە لە ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیکاندا بەتەواوی ڕاست بێت. لێرەوە ئەو فرەییەی لە ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیکاندا هەیە، ئەچێتە سەر ئەو فرەییەی لەناو خودی وڵاتەکاندا هەیە و دوو چەندانی ئەکات.

بە هۆی جیاوازیەوە، بڕیاردانێک ئەتوانێت دەرئەنجامی جیاوازی بۆ گروپە جیاوازەکان هەبێت. سود و زیانی هەر بڕیاردانێکی سیاسی، بۆ گروپی جیاواز لەیەک، جیاواز ئەبێت. ئەگەری بردنەوە و دۆڕان، هەردوکی لە ئارادایە. دۆڕاوەکان ڕەنگە بەناچاری مل بۆ بابەتەکە بدەن یان ئەوەی بە پێچەوانەوەی ئەمەوە ڕوبدات. تەنانەت لە وڵاتە دیموکراتیەکانیشدا دۆڕاوەکان یان دۆڕاوە بەزەبرەکان ڕەنگە پەنا بۆ توندوتیژی بەرن. ئەم دۆخە لە ساڵی ١٨٦١ دا لە ویلاتە یەکگرتوەکان بوو هۆی بەرپابونی شەڕی ناوخۆ.

٤- لەبەر هۆیەکی تر هەمەڕەنگی، گومانئامێزە، پێویستی دروستکردنی کلتورێکی سیاسی کە لەکاتی دەرکەوتنی دەرگیری و قەیراندا، بۆ ئەوەی هانی هاوڵاتیان بدات پشتگیری لە دەزگا سیاسیەکانیان بکەن. پاراستنی سەقامگیری ناوخۆیی وڵاتە دیموکراتیەکان لەکاتی ڕودانی قەیرانە گەورەکاندا، بەئەندازەی پێویست زەحمەتە، ئەم خاڵە بەتایبەتی لەبارەی ئەو وڵاتانەوە ڕاستە کە جیاوازی زۆری تێدایە. کەمێک دواتر ئەگەڕیمەوە بۆ ئەم خاڵە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەمەریکیەکان توانیبویان لە کاتێکی کەمدا -زیاد لە نیو سەدە- کلتورێکی سیاسی

به گشتی دیموکراتی و تاڕادەیەک کاریگەر پەرە پێبدەن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەزمون دەریخست ئەم کلتورە سیاسیە نەیتوانی لەساڵی ١٨٦١دا ڕێگری لە جیاخوازی و بەرپابونی جەنگی ناوخۆ بگرێت. ئەگەر قەیران و ململانی توانیبێتی ئەم تەباییە دەرونیەی وڵاتێک لەم ئاستە بەرزەی شوناسی نەتەوەیی و زمان و کلتوری سیاسی هاوبەش ڕوبەڕوی مەترسی بکاتەوە، ئەوا ئەگەری دەرکەوتنی ئەم هەڕەشەیە بۆ تەبایی ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان زۆر زیاترە. چونکە هاوبەشیەکانی کلتوری سیاسی ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان ئەوەندە گەورە نیە.

٥- بەهۆی ئاڵۆزی زۆری بریاردان لە ئاستی نێو دەوڵەتیدا، وێنای ئەوەی هاولاتیان هوشیارانە ڕەزامەندی لەسەر ئەم بریارانە پیشان بدەن، زۆر زەحمەت و نەکردەیە. لە وڵاتە دیموکراتیەکاندا زانیاری هاوڵاتیان لەبارەی سیاسەتی دەرەکیەوە، تەنانەت لە زانیاریان لەبارەی مەسەلەکانی ترەوە کەمترە. کاتێک ڕژێمە نەتەوەییەکان زۆرجار لە بوارێکدا شکست دێنن، چۆن ئەکریت چاوەڕێی ئەوە بکرێت کە ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان لەو بوارەدا سەرکەوتوو بن؟

دواجار ئابوری جیهانی، بازاڕە نێو نەتەوەییەکان و بنکە ئابوریە نێو نەتەوەییەکان، بەشەکانی یەک ڕێکخراوی نێونەتەوەیی پێک ئەهێنن. ڕێکخراوی نێونەتەوەیی ناوبراو دەرگیری مەسەلەی تایبەت و زۆر ئاڵۆزن کە پەیوەندیان

بە ڕەوایەتیەوە هەیە. بنکە بازرگانیەکان بەشێوەیەکی سەرەکی بەشێوازی زنجیرە پلەیی بەڕێوە ئەبرێن و لە چوارچێوەی



ڕێکخراوە کەمتازۆر ڕکابەرەکاندا کار ئەکەن. بەشی سەرەکی ڕەوایەتی و قەبوڵکراوی گشتی ئەم بنکانە و ئەوەی کە ئەم بنکانە تەحەمول ئەکرێن، تەنها لەبەر ئەوە نیە کە ڕکابەری لە بواری بازاڕدا سود بە مەسرەفکەران ئەگەیەنێت، بەڵکو بونی ڕێساکانی دەوڵەتیش دەوری لەمەدا هەیە. مێژووی ئابوری دوو دەیەی دوایی ئەوە ئەسەلمینێت کە بونی ڕێساکانی حکومەت لە بنەڕەتدا ڕکابەری لە بازاڕدا لە ئاستێکی مەعقولدا بهێڵێتەوە، زیانەکانی دەرئەنجامی ڕێسا داماڵین لە بازاڕ و بنکەکانە کەمکردۆتەوە، و شێوەیەکی دادپەروەرانەتری یان لانیکەم قەبوڵکراو تری لە دابەشکردنی سامان زامن ئەکات. بێ بونی چاودێری و ڕێساکان، بەخێرایی دەستەبژێرە سیاسیەکان و خەڵک بە گشتی، بنکە تایبەتیەکان ڕەوانەی زبڵدانی مێژوو ئەکەن.
چۆن ئەکرێت بازاڕەکان و بنکە بازرگانیە نێو نەتەوەییەکان ملکەچی ڕێسا بکەین؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ئەکرێت بگوترێت پرۆسە و ڕێکخراوی نێو نەتەوەیی تر بونی هەیە، کە ڕێسا بۆ ئەم بنکانە ڕێکبخەن. لەم بوارەدا ئەکرێت ناوی ئەم ڕێکخراوانە بهێنین: بانکی جیهانی و سنوقی نێو نەتەوەیی پارە. ئەم وەڵامە هەرچەند کە قابیلی قەبوڵ بێت، ئایا ئەتوانێت کێشەی سەرەکی ڕازیبونی دیموکراتی، چارەسەر بکات یان ئەوەی تەنها بە شێوەیەکی تری لێکردوە؟ نامەوێت بڵێم ڕژێمە نێو نەتەوەیی نادیموکراتیەکان، حاڵەتی دیکتاتۆریان هەیە. ڕەنگە لە فەرهەنگی وشەکانی ئێمەدا زاراوەیەکی گونجاومان بۆ ئەوانە نەبێت. من پێم باشە بەو حکومەتانەی بزانین کە بە هۆی ئەو دەستەبژێرانەوە بەڕێوە ئەبرێن کە ئاستێکی سنورداری هەمەڕەنگیان تێدایە. بە دەربڕینێکی تر دەستەبژێرە سیاسیەکان و بیرۆکراتی نێو نەتەوەیی لەکاتی بڕیارداندا، بەهۆی ڕێکەوتنامەکان، ڕێکەوتنە نێو نەتەوەیەکان و دواجار مەترسی دەرکەوتنی ناڕەزایەتی گشتی، سنوردار ئەبن. ڕێکخراوە نێو نەتەوەیەکان بەشێوەیەکی ئاسایی حاڵەتی فرەییان هەیە، چونکە دەستەبژێرەکانی ئەم ڕێکخراوانە لەڕوی دید و وەفاداری و هەستی ئینتیماوە، هەمەڕەنگن.

## ٦- قەیرانەکان

هەستئەکەم بە دڵنیایی بتوانرێت باسی بونی یاسایەکەی بنەڕەتی تر بۆ سیاسەت بکرێت: ڕەنگە هەر ڕێکخراوێکی سیاسی هەر سات ناساتێک ڕوبەڕوی قەیران بێتەوە.

ئەم قەیرانانە بەرکەوتنی ناوخۆیی، شەڕی ناوخۆ، هێرشی دەرەکی، جەنگی نێو دەوڵەتی، کارەساتی سروشتی، نەبونی، داوەشینی ئابوری، بێکاری، هەڵاوسانی توند و هەندێک حاڵەتی تر ئەگرێتەوە. ئەمڕۆ ئەبێت ئەگەری بەردەوامی هێرشی تیرۆریستیش بۆ ئەم لیستە زیاد بکەین.
لەو وڵاتانەی کلتوری سیاسی لاواز و کەمڕەنگ و خاوەنی دەزگای دیموکراتی سەقامگیر نین،

قەیرانەکان ئەبنە هۆی ڕوخان و گەڕانەوە بۆ دیکتاتۆریەت. ئەم دۆخە بە درێژای سەدەی بیستەم چەندانجار لە وڵاتەکانی ئەمەریکای لاتین و هەندێک شوێنی تردا ڕویدا. بەڵام تەنانەت لەو وڵاتانەشدا کە خاوەنی دەزگای دیموکراتین و کلتورێکی سیاسیش پشتگیری ئەم دەزگایانە ئەکات، دەرکەوتنی قەیرانیکی درێژخایەن و بەرێژە توند، ئەتوانێت دەسەڵات لە دەست نوێنەرانی هەلبژێراو بسەنێت و بیخاتە دەست دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوە، یان بە دەربڕینێکی تر دەسەڵات لە ئەنجومەن یان کۆنگرێسەوە بگوێزێتەوە بۆ سەرەک وەزیران یان سەرۆک کۆمار.

سوڕانەوەی دەسەڵات بەرەو دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە هەلومەرجی قەیراناویدا، بە تایبەتی کاتێک توندتر ئەبێت کە ئەو بەشەی داڕشتنی سیاسەت بگرێتەوە کە لە قۆناغەکانی کە کەمتر کێشەئامیزە، چاودێریەکی لاوازی دیموکراتیان بەسەرەوەیە. لەم ئاستەدا ئەتوانین ناوی کاروباری سوپا و سیاسەتی دەرەکی بهێنین. بۆ نمونە کۆنترۆلی سەرۆک کۆمار بەسەر سیاسەتی دەرەکیدا، بەردەوام لە کۆنترۆلی کۆنگرێس زۆر بەهێزتر بووە. لەکاتی زیادبونی مەترسی بەرپابونی جەنگ و لەویش خراپتر دەستپێکردنی جەنگ، دەسەڵاتی جێبەجیکردن زیاتر ئەبێت، کۆنترۆڵی دەسەڵاتی دادوەری - چ بگات بە کاریگەری هاوڵاتیانی ئاسایی- ڕوو لە کەمی ئەکات. دواجار هەڕەشە تیرۆریستیەکان بووە بە هۆکاریکی بنەرەتی بۆ سوڕانەوەی دەسەڵات بەلای دەزگای جێبەجێکردندا. ئەمە جگە لەوەی پاش هێرشەکانی ١١ سپتەمبەری ٢٠٠١ سوڕانەوەی دەسەڵات بە شێوەیەکی سەرەکی لە هاوڵاتیانی ئەمەریکی و کۆنگرێسەوە بەرەو سەرکۆمار بووە. لە فەسڵی دوایدا ئەگەڕێمەوە بۆ ئەم باسە.

ئەوەی کە قەیرانە نێودەوڵەتیەکان و هەڕەشە تیرۆریستیەکان بەشێوەیەکی توند یەکسانی لە نێوان هاوڵاتیاندا کەمکردۆتەوە، تەنها تایبەت نیە بە ویلایەتە یەکگرتەوەکان. ڕەنگە ئینگلتەرا دیارترین نمونەی ئەو وڵاتانە بێت کە تیایدا ڕودانی قەیران - قەیرانی دەرەکی - بوبێتە هۆی سوڕانەوەی دەسەڵات لە نوێنەرانی هەڵبژێراو و خەڵکەوە بەرەو دەزگای جێبەجیکردن. سەرەک وەزیران و کابینەی ئینگلتەرا، لەگەڵ ئەو هەموو نارەزاییە بەرفراوانە بەردەوام و ڕوو لە زیادکردنەی ڕای گشتیدا، پشتگیری لە هێرشی ئەمەریکا بۆ عێراق کرد.

خۆشبەختانە لەزۆریک لە مەسەلەکانی تردا جگە لە سیاسەتی دەرەکی و جەنگ، ئاستی یەکسانی سیاسی هاوڵاتیان کە ڕابەرانیش ئەگرێتەوە، لە ئاستێک یان بەرزتر لە ئاستی هەبوو لە وڵاتانی تردایە کە - بەهەموو کەموکوڕیەکانەوە- بە دیموکراسی ناو ئەبرێن.

گەر شتەکان کۆ بکەینەوە ئەبێت بگوترێت: ئارەزوی یەکسانی سیاسی هاوڵاتیانی یەکەیەکی سیاسی، بەردەوام و لەهەموو شوێنێک، ڕوبەڕوی ڕێگری سیاسی زۆر گەورە ئەبێتەوە: دابەشکردنی سەرچاوە سیاسیەکان، لێهاتوویەکان، پاڵنەرەکان، سنورداریێتی کات،

ئەندازەی ڕێکخراوی سیاسی، دەسەڵات و باڵادەستی ئابوری بازاڕ و بونی ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان کە گرنگیان هەیە، بەڵام دیموکراتی نین و دەربازنەبون لە قەیرانە سەختەکان.
ئایا لەو کۆمەڵگایانەی کە حکومی ئەوەمان بەسەردا دان کە دیموکراتین، ئەکرێت لەم سنورداریێتیانە تێپەرین؟ یان بە پێچەوانەوە ئەم ڕێگرانە، ڕێ لە پێشکەوتن بەرەو ئامانجی (یەکسانی سیاسی) ئەگرێت و نایەکسانیەکی سیاسی گەورەتر لەناو هاوڵاتیانی وڵاتە دیموکراتیەکاندا دروست ئەکات؟ ئایا زیادبونی نایەکسانی سیاسی لەهەندێک وڵاتدا – لەوانە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان – بەرەو ژێر ئاستی دیموکراسی و سەرو ئاستێک کە بە چەند هۆیەک بۆ دەسەڵاتگەری یان دیکتاتۆری داماننا، نایان بات؟
بە یەک ڕستە ئایا ئەم سەدەیە و ئەو قۆناغە مێژوویە بەرجەستەیە کە زۆریک لە وڵاتەکان بەرەو دیموکراسی ئەڕۆن، کۆتای پێدێت و سەردەمێکی تازە دەست پێئەکات کە تیاییدا هەندێک وڵات بە ڕێکخراوی دیموکراتی سەقامگیرەوە، جوڵە بەرەو حکومەتی کەمتر دیموکراتی دەست پێئەکەن؟

**وەرگێرانی فەسڵی چواری ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە**

**رابرت ای. دال : درباره برابری سیاسی. ترجمه: جهانگیر معینی علمداری. تهران. فرهنگ صبا. چاپ**



# بنیادگەری و سیمۆتیک

## تێری ئیگڵتن

**لە ئینگلیزییەوە: عەتــا قــەرەداخی**

ئێمە لە کۆتایی پێشەکی ئەم کتێبەدا تیۆری ئەدەبیی ئەمریکیمان لە ناو دەستی ڕەخنەیی نوێدا بەجێهێشت، کە تەکنیکی زیاتر پێگەیشتووی ئەو تیۆریە ئەدەبیە لە شەڕێکی درەنگ وەختەدایە دژی زانستی نوێ و ئاراستەی بەپیشەسازیبوون. بەڵام کاتێ کۆمەڵگەی ئەمەریکای باکوور لە ساڵانی پەنجاکاندا پەرەی سەند، گەشەکردنی لە ڕووی بیرکردنەوەی زانستی و ڕێبەرێتییەوە زۆر توند (ڕەق) بوو، واپێدەچوو کە شێوازێکی زیاتر جێگای خواست و ویست لە تەکنۆکراتی ڕەخنەگرانە داواکراو بێت. ڕەخنەی نوێ کاری خۆی بەباشی کردبوو، ئەمەش بەو مانایە بوو کە زۆر سادە و تایبەتمەند بوو بۆ ئەوەی ئەو بنەمایانە بەدەست بهێنێت کە ببێتە بەشێکی ئەکادیمی لوتبەرز.

ڕەخنەی نوێ لە جەختکردنی چڕوپڕیدا لەسەر دەقی ئەدەبی دیاریکراو یان پەرتکراو و، ڕەچاوکردنی هەستیارێتی پڕ لە نەرمونیانی، مەیلی ئەوەی هەبوو کە ڕووە فراوانتر و زیاتر بنیادییەکانی ئەدەب بخاتە لاوە. مێژووی ئەدەبی چی بەسەرهاتبوو؟ ئەوەی پێویست بوو، ئەو تیۆرییە ئەدەبیە بوو کە پارێزگاری لەو ئاراستە فۆرمالیستیە بکات کە لە ڕەخنەی نوێدا هەبوو. واتە بایەخدانی لە ڕادەبەدەری بە ئەدەب وەکو ئەوەی کە بابەتێکی جوانناسیە، زیاتر لەوەی کە پیادەکردنی کۆمەڵایەتیانە بێت. لە هەمان کاتدا بۆ ڕەخنەی نوێ دەشیا لە هەموو ئەمانە شتێکی زیاتر سیستاماتیکی و زانستی درووست بکات. لەساڵی ١٩٥٧ دا وەڵامەکە گەیشت، ئەویش ئەو کاتەی کە ڕەخنەگری کەنەدی نۆرسرۆپ فرای کە بەشێوەیەکی بەرز و گشتگر هەموو ڕەگەزە ئەدەبیەکانی لە ژێر ناونیشانی (توێکاری ڕەخنەدا) کۆکردەوە.

بیروبۆچوونی نۆرسرۆپ فرای ئەوە بوو کە ڕەخنە لە بارێکی پڕ لە پشێوی نازانستیانەدا بوو، پێویستی بەوە بوو بە شێوەیەکی جوان ڕێکبخرێتەوە. فرای وای دەبینی کە مەسەلەی هەڵسەنگاندن بریتیە لە بەها زاتییەکان و قسەی پڕوپوچ، بۆیە بە توونددی داوای پێداگری لەسەر سیستمێکی بابەتیانە دەکرد. فرای پێی وابوو ئەمە شتێکی شیاوە چونکە ئەدەب خۆی سیستمێکی لەو جۆرەی پێکهێناوە. لەڕاستیدا ئەدەب تەنیا کۆکردنەوەیەکی بێ بەرنامەی نووسینە پەرش و بڵاوەکان نەبوو کە لە درێژەی مێژوودا نووسرابوون. ئەگەر تۆ ئەدەبت بە وردی هەڵبسەنگاندایە، ئەوا دەتبینی کە ئەدەب بەپێی چەند یاسایەکی بابەتی دیار کاریکردووە، ڕەخنەیش خۆی توانیوویەتی بە پێکهێنانی ئەو یاسایانە ببێتە بابەتێکی سیستماتیکی. یاساکانیش بریتی بوون لە شێوەی باو و شێوازە یەکەمیەکان و (ئەسڵی) ئەفسانە و ڕەگەزە جۆراوجۆرەکان کە بەهۆیانەوە سەرجەمی بەرهەمە ئەدەبیەکان بنیادنراون. لە ڕەگوریشەی هەموو ئەدەبێکدا چوار (جۆری گێڕانەوە) هەن، کە چوار ئەفسانە (وەرزەکان) بەدوای یەکدا بێن، کە ئەوانیش وەرزەکانی بەهار و هاوین و پایز و زستانن. دەشێ تیۆری شێوازە ئەدەبیەکان بە شێوەیەک دابنرێت کە لە ئەفسانەدا پاڵەوان لە جۆردا لەوانی تر بەرزتر بێت. لە ڕۆمانسدا پاڵەوان لە پلەدا لەوانی تر بەرزترە. هەروەها پاڵەوان لە شێوازەکانی گێڕانەوەی بەرزی تراژیدیا و داستاندا (مەلحەمە) لە پلەدا لە کەسەکانی تر بەرزەترە، بێ ئەوەی لە ژینگەکەی خۆیدا بەرزوباڵا بێت. پاڵەوان لە شێوازەکانی گێڕانەوەی ئاست نزمی کۆمیدیا و ڕیالیزمدا هاوشانە لەگەڵ ئەوانی ترماندا "واتە هاوشێوەی کەسانی ئاساییە"، لە داشۆرین و گاڵتەجاڕیدا (ئایرۆنی) پاڵەوان لە ئێمە نزمترە.

دەشێ تراژیدیا و کۆمیدیا بۆ جاری دووەم دابەش بکرێن بۆ لاسایی کردنەوەی بەرز و لاسایی کردنەوەی نزم و گاڵتەجاڕی و(ئایرۆنی). تراژیدیا دەربارەی گۆشەگیری مرۆڤ دەدوێت، بەڵام کۆمیدیا لەبارەی یەکگرتنی مرۆڤەوەیە. سێ نموونەی دووبارە بووەوەی سیمبۆلیزم

هەیە، ڕووداوی جیدی بۆ درووستکردنی تێکشکاندن و گۆڕان، شەیتانی، پێوانەیی، کە ئەمانە دەستنیشان دەکرێن. پاشان دەشێ کۆی سیستەمەکە بخرێتە ڕێ وەکو تیۆرێکی خولی لە مێژووی ئەدەبیدا: ئەدەب لە ئەفسانەوە دەچێت بۆ گاڵتەجاڕی (ئایرۆنی) و پاشان لەوێشەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەفسانە، لە ساڵی ١٩٥٧دا، ئێمە بە ئاشکرا لە شوێنێکی دۆخی گاڵتەجاڕیدا بووین لەگەڵ بوونی ئاماژەکان بۆ گەڕانەوەیەکی پڕ لە ئاستەنگ بۆ دۆخی ئەفسانەیی.

بۆ ئەوەی فرای سیستەمە ئەدەبیەکەی بچەسپێنێت، کە ئێمە لەسەرەوە بێجگە لە خستنەڕوویەکی کەم نەبێت هیچی ترمان لەبارەوە نەگووت، پێش هەموو شتێ پێویست بوو ئەو واتە فرای بەهای هەڵسەنگاندنەکان بەلاوە بنێت، چونکە ئەو بەهایانەی هەڵسەنگاندنەکان تەنیا ژاوەژاوی زاتین. کاتێ ئێمە شیکاری ئەدەب دەکەین، مانای وایە لەبارەی ئەدەبەوە قسە دەکەین، کاتێکیش ئەدەب هەڵدەسنگێنین، واتە ئێمە لەبارەی خۆمانەوە قسە دەکەین. دیسان پێویستە ئەم سیستەمە هەموو مێژوویەک بخاتە دەرەوەی خۆی تەنیا مێژووی ئەدەب نەبێت. بەرهەمە ئەدەبیەکان لە بەرهەمە ئەدەبیەکانی ترەوە بەرهەم دەهێنرێن، نەک لە مادەی تری دەرەوەی سیستەمە ئەدەبیەکە خۆی. کەڵکی تیۆری فرای ئەوەیە کە هەمان شێوەی ڕەخنەی نوێ ئەدەب لەوە دەپارێزێت کە بە مێژوو ناشیرین و پیس ببێت، هەروەک فرای ئەدەب وەکو دووبارە بەکارخستنەوەی داخراوی ژینگەی دەقەکان سەیر دەکات. بەڵام جیاواز لە ڕەخنەی نوێ، فرای لە ئەدەبدا مێژوویەکی جێگرەوە، لەگەڵ سەرجەمی ڕەهەندە گەردوونییەکان و هەموو بنیادە کۆکراوەکانی مێژوو خۆی دەدۆزێتەوە. شێواز و ئەفسانەکانی ئەدەب بە مێژوودا تێدەپەڕن و، بە مەبەستی هاوشێوەکردنی مێژوو، یان لە کۆمەڵێ جیاوازی دووبارە بووەوەدا لەسەر هەمان بیرۆکە مێژوو دەڕوخێنن. بۆ ئەوەی ئەو سیستەمە بە زیندوویی بمێنێتەوە، پێویستە بە توندی دابخرێت: نابێت بوار بە هیچ شتێکی دەرەکی بدرێت بێتە ناویەوە نەوەکو پۆلەکانی بشێوێنێت. هەر لەبەرئەمەیە کە پاڵنەری زانستیانەی فرای داوای فۆرمالیزمێک دەکات کە زۆر تەواوتر بێت لە فۆرمالیزمی ڕەخنەی نوێ. ڕەخنەگرانی نوێ ڕێگایان دا کە ئەدەب لە هەندێ ڕووی گرنگەوە زانراو بێت و، جۆرێک لە مەعریفە لەبارەی دنیاوە بەرهەم بهێنێت: فرای سوورە لەسەر ئەوەی کە ئەدەب بنیادێکی فرمانی (زمانی) سەربەخۆیە و، بەتەواوی جیاکراوەیە لەهەر سەرچاوەیەک کە لە پشتیەوەیەتی و. جیهانێکی شاراوە و بەسەرخۆدا داخراوە، کە ژیان و واقیع تێیدا لە سیستەمێکی پەیوەندی زمانیدان(١). هەموو ئەوەی کە سیستەمەکە دەیکات بریتیە لە دووبارە تێکەڵاو کردنەوەی یەکە ڕەمزییەکان لە پەیوەندیبوونیاندا پێکەوە، زیاتر لەوەی کە لە پەیوەندیدا بێت لەگەڵ هەر جۆرە ڕاستیەک کە لە دەرەوەی سیستەمەکە بێت. ئەدەب بریتی نییە لە ڕێگای زانینی ڕاستی، بەڵکو جۆرێکە لە خەونبینینی یۆتۆپیانەی دەستەجەمی کە

لە درێژەی مێژوودا بەردەوام بووە، لەگەڵ دەربڕینی ئەو ئارەزووە سەرەکیانەی مرۆڤدا، کە گەشەی بە شارستانێتی مرۆڤایەتی داوە. بەڵام بەبێ ئەوەی کە ئەمە هەرگیز ئەو ئارەزووانەی مرۆڤ تێر بکات. لەلایەکی ترەوە ئەدەب وەکو گوزارشت کردن لە خودی تاکە کەسی دانەران (نووسەران) سەیر ناکرێت. کە ئەو کەسانە زیاترنین لە ئەرکەکانی ئەم سیستمە گەردوونیە: ئەدەب لە بابەتی کۆکراوەی ڕەچەڵەکی مرۆڤ خۆیەوە هەڵدەقوڵێت، کە ئەویش بە شێوەیەک دەبێت بۆ بەرجەستە کردنی شێوازی یەکەمین یان وێنەکانی دەلالەتی گەردوونی.

بەرهەمەکەی فرای جەخت دەکاتە سەر ڕەگوڕیشەی پۆتۆبیانەی ئەدەب چونکە بە ترسی زۆری جیهانی ڕاستەقینەی کۆمەڵایەتی و بە قێزکردنەوەوە لە مێژوو خۆی نیشانە کراوە. لە ئەدەبدا و تەنیا لە ئەدەبدا، مرۆڤ دەتوانێت لە پیسییە دەرەکییەکانی زمانی سەرچاوەیی ڕزگاری بێت و ماڵێکی ڕۆحی بدۆزێتەوە. ئەفسانە تیۆرییەکان، بە شێوەیەکی دەلالەتدارانە، بریتین لە وێنەکانی پێش بەشارییوونی بازنە سرووشتیەکان و سۆز و خولیای گەڕانەوە بۆ بیرەوەرییەکانی مێژووی پێش بەپیشەسازی بوون. مێژووی ڕاستەقینە بەلای فرایەوە بریتیە لە کۆیلایەتی و ڕەتنەکردنەوە، ئەدەبیش وەکو تاکە شوێنێک دەمێنێتەوە کە ئێمە دەتوانین تیایدا ئازاد بین. جێگای بایەخە کە پرسیار لە جۆری ئەو مێژووە بکەین کە ئێمەی تێدا دەژین بە گوێرەی ئەم تیۆرییە، بۆ ئەوەی بەلایەنی کەمەوە تا ئەندازەیەک جێگای قایل بوون بێت.

جوانی ئەم ڕێبازە ئەوەیە کە بەشێوەیەکی لێهاتووانە جوانیە توونە ڕەوەکان یەکپێدەگرێت بۆ پۆلێنکردنێکی چالاکی "زانستیانە" و، ئەدەبیش دەپارێزێت وەکو جێگرەوەیەکی خەیاڵی بۆ کۆمەڵگەی مۆدێرن، لە کاتێکدا وادەکات کە ڕەخنە بە گوێرەی ئەو کۆمەڵگەیە جێگای ڕێز بێت. ڕەخنە تێکشکێنەرێکی چووست و چالاک بۆ زۆربلێیی ئەدەب دەخاتە ڕوو. هەروەک بە توانایەکی کۆمپیتەرییەوە هەموو بەرهەمێکی ئەدەبی دادەبەزێنێت بۆ ئاستێکی ئەفسانەیی دیاریکراو، بەڵام ئەمە لەگەڵ سۆزبۆجوڵاندنی لە ڕادەبەدەری ڕۆمانسیانەدا تێکەڵاو دەکات. لە ڕوویەکەوە، ئەم تیۆرییە شتێکی نامرۆییە کە سوکایەتی دەکات و، لە ناوەند دەرکردنی خودی تاکەکەسی مرۆڤە و لەبەرامبەردا بە ناوەند کردنی هەموو شتێکە لە سیستمی کۆکراوەی ئەدەبیی خۆیدا. لە ڕوویەکی ترەوە، ئەم تیۆرییە کاری مرۆیی مەسیحیەکی وابەستە و پەیوەستە (چونکە فرای پیاوێکی ئایینیە)، ئەو وای دەبینێت ئەو جوڵەیەی کە ئەدەب و شارستانێتی دەجوڵێنێت بریتیە لە - ئارەزوو- کە دواجار تەنیا لە مەملەکەتی خودادا جێبەجێ دەکرێت.

وەکو هەندێ خاوەن تیۆری ئەدەبی کە ئێمە سەرنجمان لە تیۆرییەکانیان داوە، فرای، ئەدەب وەها پێشکەش دەکات کە کۆپیەکی جێگرەوەی ئایین بێت. ئەدەب دەبێتە پێگەیەکی بنەڕەتی بۆ شکستی ئایدیۆلۆجیای ئاینی و ئەفسانەی جۆراوجۆریش پێشکەش دەکات کە پەیوەندیان بە ژیانی کۆمەڵایەتیەوە هەیە. فرای

لە (ڕێبازی ڕەخنەییدا- ساڵی ١٩٧١) "ئەفسانە پەیوەستبووەکان" بە هەڵوێستی خۆپارێزانەوە لەبەرامبەر "ئەفسانەکانی ئازادی" لیبراڵیدا دادەنێت و ئارەزوو دەکات هاوسەنگیەکی ڕێک لە نێوان هەردووکیاندا هەبێت. پێویستە ئاراستەکانی دەسەڵاتی سەرکوتکەری پارێزکار یان خۆپارێز بە هۆی ئەفسانەی ئازادییەوە ڕاست بکرێنەوە، لە کاتێکدا کە هەستی پارێزکارانەی ڕێکخستن پێویستە خولیاکانی لیبراڵیزم پاراو بکات بۆ نابەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی. ئەوەی کە سیستمی بەهێزی ئەفسانەیی لە هۆمیرۆسەوە بۆ مەملەکەتی خودا پێی دەگات، بە کورتی، پێگەیەکە لە شوێن، لە نێوان کۆماری لیبراڵ و دیموکراتی پارێزکاردا. تاکە هەڵەیەک کە فرای ئێمەی لێ ئاگادار دەکاتەوە، هەڵەی شۆڕشگێڕییە کە بەشێوەیەکی ساویلکانە ئەفسانەکانی ئازادی بە خراپ ڕاڤە دەکات و وای دادەنێت کە کۆمەڵێ ئامانجن لە ڕووی مێژووییەوە بەدەست دەهێنرێن. شۆڕشگێڕێتی تەنیا بریتییە لە ڕەخنەیەکی خراپ، کە ئەفسانە و واقیع تێکەڵاو دەکات، هەرچۆن منداڵێک تێکەڵ و پێکەڵی دەکات لە نێوان ئەکتەرێکی مێینە و خانزادێک یان شاژنێکی جوانی ڕاستەقینەدا. شتێکی نایابە کە ئەدەب وەکو ئەوەی هەیە، جیابووەتەوە لە هەر بایەخدانێکی کردەیی بێبەها، کە لە ئاکامدا زۆر، یان کەم توانای هەیە پێمان بڵێت کام ڕێگا هەڵبژێرین. فرای لە نێو نەریتی مرۆییانەی ماتیۆ ئارنۆڵددا جێگای خۆی گرتووە و وەکو دەڵێت حەزی لە "کۆمەڵگەی ئازاد و بێ چین و شارنشینە". ئەوەی ئەم مەبەستیەتی لە کۆمەڵگەی بێ چین، هەمان شێوەی ئەو کۆمەڵگەیەیە کە ئارنۆڵد مەبەستی بووە لە پێش ئەمدا، کە ئەویش لە ڕووی کردارییەوە کۆمەڵگەیەکە بەشێوەیەکی تەواو دان دەنێت بە بەهاکانی (فرای)دا کە بەهای لیبراڵی چینی ناوەندن.

بۆچوونێکی نەچەسپاو هەیە کە دەشێ تیایدا بەرهەمی نۆرترۆپ فرای وەکو بەرهەمی بنیادگەرێک وەسف بکرێت، ئەمەش لە ڕووی دەلالییەوە هاوکاتە لەگەڵ گەشەکردنی بنیادگەری کلاسیکدا لە ئەوروپا. بنیادگەری وەکو ئەو زارەوەیە خۆی ئاماژەی بۆ دەکات پەیوەستە بە بنیادەوە، زۆر تایبەتتریش پەیوەستە بە تاقیکردنەوەی ئەو یاسا گشتیانەوە کە بنیاد تیایاندا کار دەکات. دیسان هەمان شێوەی فرای (بنیادگەریی کلاسیک) بایەخ دەدات بە کەمکردنەوەی دیاردە تاکەکەسیەکان، وەکو نموونەی ڕوون بۆ ئەم یاسایانە، بنیادگەری تەواو مەزهەبێکی دیار لە خۆدەگرێت کە لای فرای نادۆزرێتەوە: ئەویش ئەو بڕوابوونەیە کە پێی وایە یەکەکانی تاکەکەسی هەر سیستمێک هیچ مانایەکیان نییە تەنیا بە هۆی چاکەی پەیوەندی نێوان خۆیانەوە نەبێت بە یەکترییەوە. ئەمەش لە بڕوایەکی سادەوە نایەت کە پێویست بێت تۆ بنیادگەرانە سەیری شتەکان بکەیت. تۆ دەتوانیت قەسیدەیەک وەها هەڵبسەنگێنیت کە بنیادە لە کاتێکدا هێشتا مامەڵەکردن لەگەڵ هەریەکە لە بەشەکانی ئەو قەسیدەیە زۆر، یان کەم لە خۆیاندا مانا بەخشن. لەوانەیە قەسیدەکە یەک وێنەی تێدا بێت لەبارەی خۆرەوە و

وێنەیەکی تریش لەبارەی مانگەوە، تۆش بایەخ بەوە دەدەیت کە چۆن ئەو دوو وێنەیە پێکەوە دەگونجێن بۆ پێکهێنانی بنیادێک. بەڵام تۆ تەنیا کاتێک دەبیتە هەڵگری شوناسی بنیادگەر کە ئیدیعای ئەوە بکەیت کە مانای هەر وێنەیەک بە تەواوی پەیوەستە بە مانای وێنەیەکی ترەوە. وێنەکان مانایەکی گەوهەری (چەسپاو) یان نییە بەڵکو مانایەکیان هەیە لە ئەنجامی پەیوەندیبوونیان بە یەکترییەوە بەرهەم دێت. تۆ پێویستت بەوە نییە بچیتە دەرەوەی قەسیدەکە، بۆ ئەوەی لە بارەی خۆر و مانگەوە زانیاری وەربگریت بە مەبەستی ڕاڤەکردنی ئەو دوو وێنەیە، بەڵکو ئەوان هەریەکەیان ڕاڤە و پێناسەی ئەویتریان دەکات.

بوارم بدەن با هەوڵبدەم لە ڕێگای نموونەیەکی سادەوە ئەمە ڕوون بکەمەوە، وای دادەنێین ئێمە چیرۆکێک شی دەکەینەوە کە تیایدا کوڕێک دوای ئەوەی لەگەڵ باوکی شەڕ دەکات،ماڵەوە بەجێدەهێڵێت، لەبەر گەرمای ئەو ڕۆژەدا بەپێ بەناو دارستانێکدا دەڕوات و دەکەوێتە چاڵێکی قوڵەوە. باوکەکە دێتە دەرەوە بەدوای کوڕەکەیدا دەگەڕێت، سەیری چاڵەکە دەکات، بەڵام لەبەر تاریکی ناو چاڵەکە ناتوانێت کوڕەکەی ببینێت، لەو کاتەدا خۆر ڕاستەوخۆ بەرزدەبێتەوە بۆ سەر سەری پیاوەکە، تیشکی خۆر قوڵایی چاڵەکە ڕووناک دەکاتەوە و ڕێگا بۆ باوکەکە خۆش دەکات کە منداڵەکەی ڕزگار بکات. دوای ئاشتبوونەوەیەکی پڕ لە خۆشی، پێکەوە دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە.

ئەمە ناشێت گێڕانەوەیەکی بەتایبەتی دانراو بێت، بەڵام خاسێتی ئاسانکاری تێدایە. بەئاشکرا، دەشێ ئەم ڕووداوە بە هەموو جۆرە ڕێگایەک ڕاڤە بکرێت. لەوانەیە ڕەخنەگری شیکاری دەروونی چەندین ئاماژەی گرێی ئۆدیبی تیادا ئاشکرا بکات و نیشانی بدات کە چۆن کەوتنە ناوچاڵەکە بۆ ئەو منداڵە سزایەکە کە منداڵەکە خۆی نائاگایانە ئاواتی بۆ دەخوازێت بە لەبەرچاوگرتنی ناکۆکیەکەی لەگەڵ باوکیدا، یان لەوانەیە کەوتنە چاڵەکەوە جۆرێک لە خەساندنی ڕەمزیانە بێت، یان گەڕانەوە و پەنابردنی ڕەمزیانە بێت بۆ نێو منداڵدانی دایکی. دەشێ ڕەخنەگری هیومانیست ئەم ڕووداوە وەکو بە دراماکردنێکی توند و تیژی ئەو گیروگرفتانە بخوێنێتەوە کە لە چوارچێوەی پەیوەندییەکانی مرۆڤدا حەشاردەدرێن. دەشێ جۆرێکی تر لە ڕەخنەگر وەها سەیری ئەم ڕووداوە بکات کە یارییەکی درێژکراوەی بێ ئامانجە بە وشەکانی (کوڕ/خۆر -. (son-sun ئەوەی ڕەخنەگری بنیادگەر دەیکات، بریتیە لە نەخشەکێشانی چیرۆکەکە لە شێوازی هێڵکاریدا. یەکەم یەکەی دەلالەتداری چیرۆکەکە ئەوەیە کە "کوڕ لەگەڵ باوکیدا شەڕدەکات" کە دەشێ دووبارە وەها بنووسرێتەوە کە "نزم دژی بەرز ڕادەپەڕێت". ڕێگاکردنی کوڕەکە بەناو دارستانەکەدا بریتییە لە جوڵەیەک بە درێژایی تەوەری ئاسۆیی، لەبەرامبەر تەوەری شاوڵیدا کە (نزم/بەرز) ە، هەروەک دەشێ ئاماژەی بۆ بکرێت وەکو (ناوەند). کەوتنە ناو چەڵەکەوە، مانای کەوتنە شوێنێکەوە کە نزمترە لە ڕووی زەوی, ئەوەش جارێکی تر دەلالەتی نزمی هەڵدەگرێت، خۆریش

لە لوتکەدا دەلالەتی بەرزی هەڵدەگرێت. بە کەوتنی تیشکی خۆر لە ناو چاڵەکە، بە مانایەک ئەوە دەگەیەنێت کە خۆر چەماوەتەوە بەرەو نزمی. بەمەش یەکەم دالی یەکەی گێڕانەوە هەڵدەگەڕێتەوە، لەوێدا کە نزم بوو، لە ڕووی بەرزدا وەستا. ئاشتەوایی نێوان باوک و کوڕ هاوسەنگی بۆ نێوان نزم و بەرز دەگێڕێتەوە و پێکەوە ڕێکردنیان بەرەو ماڵەوە دەلالەتی ناوەندبوون (Middle) هەڵدەگرێت و ئەم دەستکەوتەش بارێکی ناوەندی گونجاو نیشان دەدات. لە نێو خۆشی سەرکەوتندا، بنیادگەر یاساکانی خۆی ڕێک دەخاتەوە و دەگات بە چیرۆکی دواتر.

ئەوەی تێبینی دەکرێت سەبارەت بەمجۆرە شیکردنەوەیە، ئەوەیە کە ئەمیش وەکو فۆرمالیزم، ناوەرۆکی ڕاستەقینەی چیرۆکەکە دەخاتە نێوان دوو کەوانەوە و بەتەواویش جەخت دەکاتە سەر ڕوخسار، یان شێوە. تۆ دەتوانیت جێگای "باوک و کوڕ، چاڵ و خۆر"، بە ڕەگەزی تەواو جیاواز بگریتەوە، بۆ نموونە "دایک و کچ، باڵندە و تەپکە"، لەگەڵ ئەو جێگرتنەوەیەشدا هێشتا چیرۆکەکە هەروەکو خۆی دەمێنێتەوە. مادەم بنیادی پەیوەندییەکان لە نێوان یەکەکاندا دەپارێزرێن، گرنگ نییە تۆ کام بەش هەڵدەبژێریت. ئەمە حاڵەتی خوێندنەوەی دەروونشیکارییانە، یان مرۆییانەی حیکایەتەکە نییە، کە پشت دەبەستێت بەم بەشانە کە دەلالەتی گەوهەریی دیاریکراویان هەیە، کە بۆ تێگەیشتن لێی، دەبێ ئێمە بگەڕێینەوە بۆ زانینی خۆمان لەبارەی جیهانی دەرەوەی دەقەکەوە.

بێگومان ئەوەش مانایەکی هەیە کە خۆر بەرزە و چاڵەکان نزمن، بۆ ئەو مەودایەش ئەوەی کە وەکو ناوەرۆک هەڵدەبژێردرێت گرنگە، بەڵام ئەگەر ئێمە بنیادی گێڕانەوەمان وەرگرت و تیایدا ڕۆڵی ڕەمزی (ناوەندگێڕ)مان کرد بە شتی سەرەکی لە نێوان دوو بەشدا، ئەوا دەشێ ئەو ناوەندگێڕە هەر شتێک بێت لە کوللەیەکی بچوکەوە بۆ تاڤگەیەک.

دەشێ پەیوەندییەکانی نێوان بەشە جیاوازەکانی چیرۆکەکە پەیوەندی هاوتەریبی، دژیەکی، هەڵگەڕانەوە، یەکسانبوون..تاد بێت. خۆ ئەگەر ئەم بنیادەی پەیوەندیە ناوخۆییەکان بە پارێزراوی بمێنێتەوە، ئەوا یەکەکانی تاکە کەسی شوێنیان دەگرنەوە. دەشێ سێ خاڵی تر لەبارەی ئەم میتۆدەوە تێبینی بکرێت. یەکەم بۆ بنیادگەری شتێکی گرنگ نییە کە ئەم چیرۆکە بە زەحمەت ببێتە نموونە بۆ ئەدەبی باڵا. ئەم میتۆدە بە تەواوی بێ باکە لەبارەی بەهای کەلتووری بابەتەکەوە، هەرشتێک بێت لە "جەنگ و ئاشتییەوە" بۆ " هاواری جەنگ"، چونکە ئەم میتۆدە شیکارییە، نەک هەڵسەنگاندن. دووەم بنیادگەری ڕیسواکردنێکی بەهێند وەرگیراوی هەستی گشتییە.. بنیادگەری مانای ئاشکرای چیرۆکەکە ڕەت دەکاتەوە و لەبری ئەوە بەدوای پەرتکردنی بنیادە قوڵە دیارەکاندا دەگەڕێت، واتە ئەوانەی کە لە ڕووکەشی چیرۆکەکەدا دیار نین. بنیادگەری لە بەهای دیارەوە ناکەوێتە مامەڵەکردن لەگەڵ دەقدا. بەڵکو لە شوێنی خۆی لای دەبات بۆ جۆرێکی تەواو جیاواز لە بابەت. سێیەم ئەگەر ناوەرۆکە

دیاریکراوەکانی دەقەکە شایانی گۆڕین بوون، ئەوا بۆچوونێک هەیە کە تیایدا مرۆڤ دەتوانێت بڵێت" ناوەرۆکی" گێڕانەوە بریتیە لە بنیادەکەی. ئەمەش هاوشێوەی ئەو وانیشاندانەیە کە گێڕانەوە بە ڕێگایەک لەبارەی خۆیەوەیە دەیکات. کە بابەتەکەی بریتییە لە پەیوەندییە ناوکۆییەکانی و شێوازی تایبەتی خۆی بۆ دروستکردنی مانا.
بنیادگەری ئەدەبی لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستدا پەرەی سەند، ئەویش وەکو هەوڵێک بۆ ڕانانی میتۆد و ڕوانینی قوڵی دامەزرێنەری زانستی زمانی بنیادگەری نوێ فردینانڵ دی سۆسۆر لە ئەدەبدا. بەهۆی زۆر خستنەڕووی سادەیەوە کتێبەکەی دی سۆسۆر (وانەکان لە زانستی گشتی زمان)دا ساڵی ١٩١٦ سەردەمێک درووست دەکات کە ئێستا وانەکانی لەبەردەستدان. من تەنیا هەندێ لە پێگە سەرەکییەکانی ئەو کتێبە دەخەمە ڕوو. سۆسۆر زمانی وەکو سیستمێکی ئاماژە(دەلالات) سەیردەکرد، کە دەبوو لە ڕووی (سینۆکرۆنیکەوە- ئێستاوە) توێژینەوە بکرایە، واتە توێژینەوەی زمان بکرایە وەکو سیستمێکی تەواو لە چرکەساتێکی دیاریکراودا، نەک توێژینەوەی ( دایاکرۆنیکی- بەپێی مێژوو) ی زمان بکرایە لە پەرەسەندنی مێژوویی خۆیدا. دەبوا وەها سەیری هەر (دەلالەت)ێک بکرایە وەکو ئەوەی پێکهاتبێت لە (دال) (وێنەی دووەم، یان هاوشێوەی نووسینیەکەی) و مەدلولێک ( چەمک یان مانا). ئەم سێ نیشانە ڕەشە(c–a–t) ئاماژەدەرن (دال) کە مەدلولی cat واتە پشیلە لە مێشکی ئینگلیزیدا دەوروژێنن. پەیوەندی نێوان دال و مەدلول پەیوەندییەکی لە خۆوەیی یان خۆڕسکیە. هیچ هۆیەکی زکماکی نییە بۆئەوەی ئەم سێ نیشانەیە مانای پشیلە بگەیەنن بێجگە لە نەریتی کەلتووری و مێژوویی. بەراوردی وشەی chat بکە لە زمانی فەرنسیدا، واتە پشیلە. پەیوەندی نێوان سەرجەمی نیشانە و ئەوەی نیشانە بۆی دەگەڕێتەوە (واتە ئەوەی کە سۆسۆر پێی دەڵێت سەرچاوە، کە بوونەوەرێکی لەڕاستیدا کولکنی چوارپێیە) دیسان شتێکی زکماکییە. هەر ئاماژەیەک لە سیستمەکەدا مانای هەیە، کە ئەوەش تەنیا بەهۆی باشی جیاوازیەکەیەوە لەوانی تر. پشیلە cat مانای هەیە نەک لە خۆیدا، بەڵکو لەبەرئەوەی پشیلە ( شەبقە، یان بێ ئابڕو، یان شەمشەمە کوێرە (cap, cad, bat نییە. گرنگ نییە کە چۆن دال دەگۆڕێت، مادەم پارێزگاری لە جیاوازیی بوونی خۆی لە دالەکانی تر دەکات، تۆ دەتوانیت بە زۆر ئاوازی جیاواز ئەوە بڵێیت مادەم ئەو جیاوازییە پارێزراوە. دی سۆسۆر دەڵێت: لە سیستمی زانستی زماندا، هیچ شتێک نییە بێجگە لە جیاوازی: مانا بەشێوەیەکی تەمومژاوی گەوهەری نییە لە ئاماژەدا، بەڵکو مانا وەزیفیە و بەرهەمی جیاوازبوونیەتی لە ئاماژەکانی تر. لە کۆتایدا، سۆسۆر بڕوای وابوو کە زانستی زمان دەکەوێتە پشێوییەکی بێ ئومێدییەوە ئەگەر خۆی پەیوەست بکات بە قسەی ڕاستەقینەوە، یان بە قسەوە وەکو سۆسۆر داوای دەکرد. سۆسۆر بایەخی نەداوە بە لێکۆڵینەوەی ئەوەی کە خەڵک بە ڕاستی

دەیانگووت، ئەو بایەخی داوە بە بنیادی بابەتی ئەو ئاماژانەی کە وایان کرد قسەکانیان لە ئاستی یەکەمدا شیاو بێت، کە سۆسۆر ئەمەی بە زمان language ناودەبرد. هەروەک سۆسۆر بایەخی بەو بابەتە ڕاستەقینانە نەداوە کە خەڵک لەبارەیانەوە دواون. بە مەبەستی توێژینەوەی زمان بە شێوەیەکی کاریگەرانە، دەبوو سەرچاوەکانی ئاماژەکان، واتە ئەو شتانەی کە بەراستی ئاماژەی بۆ کردوون لە نێوان دوو کەوانەدا دابنرانایە.

بنیادگەری بەگشتی هەوڵێکە بۆ ڕانانی ئەم تیۆرییەی زانستی زمان بەسەر بابەتەکان و چالاکیەکانی تردا بێجگە لە زمان خۆی. تۆ دەتوانی ئەفسانەیەک، یان پێشبڕکێی بەرەنگاربوونەوە، یان سیستمی خزمایەتی و خێڵایەتی، یان لیستی جۆراوجۆری خواردنەکان لە خواردنگە یان وێنەکردنی زەیتی وەکو سیستمێکی ئاماژەکان ببینیت. شیکردنەوەی بنیادگەرێک هەوڵ دەدات بە ڕێگای پەرتکردن زنجیرەیەک یاسای سەرەکی پەرت بکات کە بەهۆیانەوە ئەم ئاماژانە یەکیان پێ دەگیرێت بۆ ماناکان. بنیادگەری تا ئاستێکی بەربڵاو ئەوە پشت گوێ دەخات کە ئاماژەکان بەڕاستی دەیڵێن، لە جیاتی ئەوە جەخت دەکاتە سەر پەیوەندییە ناوکۆییەکانی هەر ئاماژەیەک بە ئاماژەیەکی ترەوە. لەبارەی بنیادگەرییەوە فریدریک جامیسۆن دەڵێت: بنیادگەری هەوڵێکە بۆ دووبارە بیرکردنەوە لە هەموو شتێک لە ڕوانگەی زانستی زمانەوە(٢). بنیادگەری نیشانەیەکی ئەو ڕاستیەیە کە زمان بە کێشەکانی و ڕووە نائاشکراکانی و ناوەڕۆکەکانیەوە بووەتە نموونە و خولیایەک بۆ ژیانی فیکریی سەدەی بیستەم.

تێڕوانینەکانی دیسۆسۆر لە بواری زانستی زماندا کاریگەری لەسەر فۆرمالیستەکانی ڕووسیا هەبوو، هەرچەندە فۆرمالیزم خۆی بەتەواوی بنیادگەری نییە. فۆرمالیزم لە ڕووی بنیادەوە دەڕوانێتە دەقە ئەدەبیەکان و سەرنج دەخاتە سەر سەرچاوە بەمەبەستی پشکنینی ئاماژە خۆی، بەڵام بە شێوەیەکی تایبەتمەندانە بە ماناوە خەریک نابێت لەو ڕووەوە کە جیاوازییە، یان بەوەی لە زۆربەی بەرهەمەکانیدا پەیوەستە بە یاسا قوڵەکانو بنیادە گرنگەکانی دەقە ئەدەبیەکانەوە. یەکێک لە فۆرمالیستەکانی ڕووسیا کە زمانەوانیش بوو، ئەویش (ڕۆمان یاکۆبسن)ە سەرەکیترین پەیوەندی لە نێوان فۆرمالیزم و بنیادگەری نوێی ئەمڕۆدا پێشکەش کرد. یاکۆبسن ڕابەری (ئەڵقەی زمانیی مۆسکۆ) بوو، کە ئەو ئەڵقەیەش لە دەستەیەکی فۆرمالیست پێکهاتبوو، لە ساڵی ١٩١٥ دامەزراو، لە ساڵی ١٩٢٠ یاکۆبسن کۆچی کرد بۆ پراگ بۆ ئەوەی ببێتە یەکێک لە گەورەترین تیۆردانەرانی بنیادگەری چیک. (ئەڵقەی زمانیی پراگ) لە ساڵی ١٩٢٦دا دامەزرا و هەتا هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی بەردەوام بوو. دوای ئەوە ڕۆمان یاکۆبسن جارێکی تر کۆچی کرد و ئەمجارەیان چوو بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لەوێ لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا ڕووبەڕووی ئەنترۆپۆلۆجیستی فەڕەنسی کلۆد لیڤی

شتراوس بووەوە، لەو ڕووبەڕوبوونەوەیەوە پەیوەندییەکی فیکری لە نێوانیاندا درووست بوو کە ڕۆڵی لەبەرچاوی بینی لە پەرەسەندنی بنیادگەری نوێدا.

دەشێ هەژمووونی یاکۆبسن لە هەموو شوێنێکی فۆرمالیزم و بنیادگەری چیکی و زانستی زمانی نوێدا هەست پێبکرێت. ئەوەی یاکۆبسن بەشداری تێدا کردووە بە تایبەتی بۆ شیعریەتە، کە ئەو وەکو بەشێک لە بواری زانستی زمان دایناوە و بیرۆکەیەک بوو کە پێی وابوو شیعریەت پێش هەموو شتێک پێکهاتووە لە دانانی زمان لە جۆرێکی دیاری کراو لە پەیوەندی خودئاگایی لەگەڵ خۆیدا. ئەرک بینینی شیعریەتی زمان ئاشکرایی ئاماژەکان بەهێز دەکات و، سەرنج بەرەو لای خاسێتە مادییەکان ڕادەکێشێت، زیاتر لە بەکارهێنانی سادەی ئەو ئاماژانە وەکو پەیوەندی ڕووبەڕووبوونەوەیان. لە شیعریەتدا، ئاماژە لە بابەتەکەی ڕووت دەکرێتەوە، بەوەش پەیوەندی ئاسایی نێوان ئاماژە و سەرچاوە دەشێوێنرێت، کە ئەوەش شتێکە بوار بە ئاماژە دەدات ئازادییەکی داریکراوی هەبێت بەوەی کە بابەتێکی بەهادارە لە خۆیدا. کۆی پەیوەندیکردن بە لای یاکۆبسنەوە شەش ڕەگەز لەخۆ دەگرێت کە بریتین لە: نێرەر، بۆ نێردراو، ئەو پەیامەی لە نێوانیاندا دەڕوات، ئەو کۆدە هاوبەشەی کە وا لەو پەیامە دەکات ڕوون بێت (جێگای تێگەیشتن بێت)، بەریەک کەوتن، یان ناوەندی فیزیکی پەیوەندیکردن و، چوارچێوەیەک کە پەیامەکەی بۆ دەگەڕێتەوە. هەر یەکە لەم ڕەگەزانە ئەگەری ئەوەی هەیە دەسەڵات بکات بەسەر کردارێکی پەیوەندیکردنی دیاری کراودا. زمان لە باری تێڕوانینی نێرەرەوە وەها دەبینرێت کە "هەڵچوون" یان دەربڕینی بارێکی عەقڵی بێت، بەڵام لە باری تێڕوانینی بۆنێردراوەوە "ئارەزوە" یان هەوڵدانە بۆ کاریگەرییەک، ئەگەر پەیوەندیکردن پەیوەندی هەبێت بە سیاقەکەوە ئەوا شتێکی سەرچاوەیی دەبێت، ئەگەر زمان ئاراستە کراو بێت بۆ کۆدەکە خۆی ئەوا (میتا زمانیی) دەبێت (وەکو ئەوەی کاتێ دوو کەس گفتوگۆدەکەن ئەگەر لەیەکتر تێبگەن)، ڕۆیشتنی پەیوەندی کردن بە شێوەیەکی گۆشەیی( لار) بەرەو بەریەککەوتن خۆی زۆر باشە (دڵنیاییەphatic - ئەمەش مانای ئەوەیە: باشە، دواجار ئێمە لێرەدا قسە دەکەین). ئەرکی شیعریی بەرز و باڵادەست دەبێت، کاتێ پەیوەندیکردن جەخت بکاتە سەر پەیامەکە خۆی- واتە کاتێ وشەکان خۆیان لە تێڕوانینی ئێمەوە لە پێشەنگی گرینگیدانمانن، زیاتر لەوەی کە لە لایەن کەسێکەوە بۆ هەر مەبەستێک و لەهەر بارودۆخێکدا بگوترێن(٣).

دیسان یاکۆبسن بایەخ دەدات بە زۆر جیاکاری شاراوە لەلای دیسۆسۆر لە نێوان خوازە (میتافۆر) و کینایەدا (میتۆنۆم)دا. لە خوازەدا ئاماژەیەک دەگۆڕدرێت بە ئاماژەیەکی تر چونکە شتێکی هاوشێوەیە لەگەڵیدا. هەڵچوون (سۆز) دەبێتە کڵپە. لە کینایەدا، ئاماژەیەک لەگەڵ ئاماژەیەکی تردا پەیوەست دەکرێت، باڵ پەیوەست دەکرێت لەگەڵ فڕۆکەدا، چونکە باڵ بەشێکە لە فڕۆکە، هەروەها ئاسمان پەیوەست دەکرێت لەگەڵ فڕۆکەدا بەهۆی

نزیکی مادیانەیانەوە پێکەوە. ئێمە دەتوانین خوازە دروست بکەین چونکە زنجیرەیەک لە ئاماژەمان هەیە کە یەکسانن. هەڵچوون، کڵپە، خۆشەویستی...تاد. کاتێ دەدوێین یان دەنووسین ئەوا ئاماژەکان هەڵدەبژێرین، ئەویش لە ڕەهەندە شیاوە یەکسانەکاندا و پاشان پێکەوە کۆیان دەکەینەوە بۆ پێکهێنانی ڕستەیەک. هەرچۆنێک بێت ئەوەی لە شیعردا ڕوودەدات ئەوەیە کە ئێمە لە پرۆسێسی پێکەوە کۆکردنەوەی وشەکان و هەروەها لە هەڵبژاردنیاندا سەرنج دەخەینە سەر یەکسانەکان. ئێمە ئەو وشانە پێکەوە دەچنین کە لە ڕووی سیمانتیکی یان ئیقاعی یان دەنگی یان لە هەندێ ڕێگای ترەوە یەکسانن. لەبەرئەوەیە کە یاکۆبسن دەتوانێت لە پێناسەیەکی بەناوبانگدا، بڵێت: ئەرکی شیعری بنەمای یەکسانبوون لە تەوەری هەڵبژاردنەوە بۆ تەوەری یەکخستن نیشان دەدات(٤). ڕێگایەکی تری گوتنی ئەمە ئەوەیە کە لە شیعردا لێچوون زیاتر دەکرێت لەبەرامبەر لێکنزیکیدا Contiguity - ، وشەکان پێکەوە لە پێناوی ئەو بیرۆکانەدا ناچنرێن کە دەیانگوازنەوە، وەکو ئەوەی کە لە قسەی ئاساییدا ڕوودەدات، بەڵکو وشەکان پێکەوە دەچنرێن بە جۆرێک کە چاو لەسەر نموونەکانی لێکچوون و، دژیەک و، تەریببوون و ...تاد بێت کە ئەمانەش بەرهەم دەهێنرێن لەلایەن دەنگ و مانا و ئیقاع ومانای زیادەوە Connotation. هەندێ شێوازی ئەدەبی، بۆ نموونە پەخشانی ڕیالیستی مەیلی بەلای ئەوەدایە ببێتە کینایە، ئاماژەکان بە هۆی نزیکبوونیان لە یەکترەوە پێکەوە ببەستێت، شێوازی تریش لە جۆری شیعری ڕۆمانسی و سیمبۆلیزم لە ئاستێکی بەرزدا خوازەن (واتە میتافۆر) (٥).

یاکۆبسن و جان مۆکارۆڤیسکی و فیلیکس ڤۆدیکا و کەسانی تریش کە نوێنەرایەتی قوتابخانەی پراگ دەکەن، جۆرێک لە گواستەوە لە فۆرمالیزمەوە بۆ بنیادگەری نوێ نیشان دەدەن. ئەمان بیرۆکەکانی فۆرمالیستەکانیان فراوان کرد، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر چەسپاو ئەو بیرۆکانەیان لە چوارچێوەی زانستی زمانی سۆسۆردا کرد بە سیستم. لە ڕوانینی ئەمانەوە قەسیدە وەکو "بنیادی ئەرکی" سەیر دەکرا، کە تیایدا دالەکان و مەدلولەکان بەهۆی تاکە زنجیرەیەکی ئاڵۆز لە پەیوەندییەوە بەڕێوەدەبرێن. پێویستە ئەم ئاماژانە لە بوونی خۆیاندا توێژینەوە بکرێن، نەک وەکو ڕەنگدانەوەی واقیعێکی دەرەکی: جەختکردنی سۆسۆر لەسەر پەیوەندی هەڕەمەکی نێوان ئاماژە و سەرچاوە، وشە و شت، یارمەتی جیاکردنەوەی دەقی داوە لە دەوروبەرەکەی و بابەتێکی سەربەخۆی لێ دروست کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا بەرهەمی ئەدەبی پەیوەست بووە بە دنیاوە بە هۆی چەمکی فۆرمالیستی (بە نامەئلوفکردن)ەوە. هونەر سیستمێکی ئاماژەی نەریتی دەخاتە باری نامۆبوونەوە و دووری دەخاتەوە و، سەرنجی ئێمە لەسەر پرۆسێسی مادیانەی زمان خۆی چڕدەکاتەوە و، بەوەش پەیپێبردنی ئێمە نوێ دەکاتەوە. لە بەهێند وەرنەگرتنی زماندا، ئێمە جارێکی تر بەئاگایی خۆمان دەگوازینەوە. بەهەرحاڵ،

زیاتر لە فۆرمالیستەکان، بنیادگەرانی چیک سووربوون لەسەر یەکێتی بنیادی بەرهەمەکە. دەبوو تێگەیشتن لە ڕەگەزەکانی ئەو بەرهەمە وەکو ئەرکی یەکەیەکی دینامیکی وەربگیرایە، کە یەک ئاستی دیاریکراو لە ئاستەکانی دەقەکەی تیا پیادەبکرایە (کە وەکو قوتابخانەی پراگ گوتوویەتی ئەویش ئاستی باڵادەست بوایە)، وەکو ئەو کاریگەرییە دیاریکراوەی کە شێواندوویەتی، یان هەموو ئاستەکانی تری ڕاکێشاوەتە بواری هێزی تایبەت بە خۆی.

بەمجۆرە بنیادگەرانی پراگ دەشیا وەها دەربکەوتنایە کە تەنیا وەکو وێنەیەکی زیاتر زانستیانەی ڕەخنەی نوێ بن. ئەم پێشنیازەش تۆوی ڕاستیەکی تێدایە. بەڵام سەرباری ئەوەی کە بەرهەمی هونەری وەکو سیستمێکی داخراو بینراوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەرهەمە هونەرییە وەکو بابەتێکی پەیوەست بە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و مێژووییەوە دانراوە. بەپێی بۆچوونی جان مۆکارۆڤسکی بەرهەمی هونەری وەکو تاکە دژی پاشخانێکی تەواو گشتی دەلالەتەکان ناسراوە. ئەویش لەو ڕوانگەیەوە کە لادانێکی سیستماتیکی بووە لە پێوانەی زانستی زمان. لەبەرئەوەی ئەم پاشخانە دەگۆڕێت، بەپێی ئەویش ڕاڤەکردن و هەڵسەنگاندن دەگۆڕێت، لە ئاکامی ئەوەشدا بەرهەمی هونەری دەگاتە خاڵێک کە دەشێ لەو خاڵەدا ئەو بنەمایانەی نەمێنێت کە چیتر بە بەرهەمێکی هونەری تەواو بزانرێت. شتێک نییە کە مۆکارۆڤسکی لە کتێبی "ئەرکی جوانناسی: پێوانە و بەها وەکو ڕاستی کۆمەڵایەتی" ساڵی ١٩٣٦ "گفتوگۆی بکات کە ئەرکی جوانناسی هەبێت بێ لەبەرچاوگرتنی شوێن و کات، یان ئەو کەسەی کە هەڵیدەسەنگێنێت. هەروەک هیچ شتێک بوونی نییە ئەگەر بەرهەمی هونەری ئەو ئەرکە لە بارودۆخی گونجاودا هەڵنەگرێت. مۆکارۆڤسکی جیاوازی دەکات لە نێوان بەرهەمی مادی هونەری" کە کتێبیکی فیزیکیە و، وێنەکێشان یان پەیکەرتاشی خۆی، لەگەڵ بابەتی جوانناسیدا کە تەنیا لە ڕاڤەکردنی مرۆڤدا بۆ ئەم ڕاستیە فیزیکیە بوونی هەیە.

لەگەڵ بەرهەمی قوتابخانەی پراگدا، زاراوەی بنیادگەری زۆر یان کەم لەگەڵ زاراوەی سیمۆتیکدا تێکەڵ دەبێت. سیمۆتیک یان سیمۆلۆجیا مانای توێژینەوەی سیستاماتیکانەی ئاماژەکان، ئەمەش ئەوەیە کە بنیادگەرانی بواری ئەدەبی ئەنجامی دەدەن. زاراوەی بنیادگەری خۆی ئاماژە بۆ میتۆدێکی بەدواداچوون دەکات، کە دەشێ بەسەر ڕەهەندی تەواوی بابەتەکاندا جێبەجێ بکرێت لە یارییەکانی دوو گۆڵیەوە هەتا شێوازەکانی بەرهەمهێنانی ئابووری. زانستی سیمۆتێک زیاتر بوارێکی تایبەتی توێژینەوە نیشان دەدات، ئەویش بواری ئەو سیستمانەیە کە لەباری ئاسایدا وەکو ئاماژەکان دادەنرێن، بۆ نموونە: چامە (قەسیدە)، بانگ کردنی باڵندەکان، نیشانەکانی هاتووچۆ، نیشانە پزیشکییەکان و شتی تریش. بەڵام ئەم دوو وشەیە تێکەڵاودەبن، لەبەرئەوەی بنیادگەری مامەڵەی هەندێ شت دەکات کە ناشێت ئاسایی وەکو سیستمێکی ئاماژەکان بیری لێبکرێتەوە، هەرچەندە کە هەمان شێوەش بووە -بۆ

نموونە پەیوەندییەکانی خزمایەتی لە کۆمەڵگەی خێڵایەتیدا- لە کاتێکدا کە زانستی سیمۆتیک بە شێوەیەکی بەربڵاو میتۆدەکانی بنیادگەری بەکار دەهێنێت.
دامەزرێنەری زانستی سیمۆتیکی ئەمەریکی (س. ئێس. پیرس) سێ جۆری بنەڕەتی ئاماژەی جیاکردۆتەوە. جۆری ئایکۆنی Iconic – کە لەوێدا ئاماژە شتێک بوو لەوە دەچوو کە دەینواند (بۆ نموونە وێنەیەک کەسێک دەنوێنێت). جۆری ئاماژەی پێڕستیIndexical – کە تیایدا ئاماژە شتێکە تێکەڵ دەبێت لەگەڵ ئەوەی کە دەینوێنی (دوکەڵ لەگەڵ ئاگر، زیپکە لەگەڵ سورێژە). جۆری سێیەم: هێمایی Symbolic – وەکو ئەوەی دیسۆسۆر دەیڵێت ئاماژە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی یان نەریتی دەبەسترێت بە سەرچاوەکەیەوە. زانستی سیمۆتیک ئەم پۆلێنکردنەو زۆر پۆلێنکردنی تر دەگرێتەوە. زانستی سیمۆتیک جیاوازی دەکات لە نێوان نیشانکردن – Denotation) واتە ئاماژەکە چی دەنوێنێت)، لەگەڵ واگەیاندن – Connotation)ئاماژەی تر کە تێکەڵ دەبێت لەگەڵیدا) لە نێوان کۆدەکان (ئەو بنیادانەی کە یاساکە بەڕێوەیان دەبات و مانا بەرهەم دەهێنن) و ئەو پەیامانانەی کە لەلایەن ئەو بنیادانەوە ڕەوانە دەکرێن و، جیاوازیکردن لە نێوان نموونە – Paradigmatic)واتە کۆمەڵێک ئاماژە کە دەشێ هەریەکەیان ئەویتریان بنوێنێ) و، سینتاگماتیک (کە لەوێدا ئاماژەکان پێکەوە لە زنجیرێکدا پێکەوە دەبەسترێن). زانستی سیمۆتیک لەبارەی میتازمانەوە دەدوێت، کە تیایدا یەک سیستمی ئاماژە سیستمێکی تری ئاماژە نیشان دەکات (بۆ نموونە پەیوەندی نێوان ڕەخنەی ئەدەبی و ئەدەب). ئاماژە فرە ماناکان لە مانایەک زیاتر و ژمارەیەکی گەورە لە چەمکی تەکنیکی تریان هەیە. بۆ ئەوەی ببینین کە ئەم جۆرە شیکردنەوەیە لە پیادەکردندا چۆن دەردەکەوێت، دەشێ ئێمە بە کورتی سەیری بەرهەمی نووسەری سیمیۆتیکی سۆڤێتی یۆری لۆتمان بکەین کە ڕابەری ئەوەبوو کە پێی دەگوترا قوتابخانەی تارتۆ.

**سەرچاوەکان:**

١- Anatomy of Criticism (New York ),p ١٣٣.

٢- The prison- House of Language ( Princeton, NJ, ١٩٧٢), p.vii.

٣- See Closing Statement: Linguistics and Poetics, in Thomas A. Sebeok (ed.), Style in Language ( Cambidge, Mass, ١٩٦٠).

٤- Ibid, p ٣٥٨.

٥- see Two aspects of Language and Two Types of Aphasic Disturdances, in Roman Jakobson and Morries Helle, Fundamentals of Language ( The Hague, ١٩٥٦ ).

+ ئەم بابەتە بەشی یەکەمی پاری سێیەمە لە کتێبی:

- Terry Eagleton, Literary Theory, Blackwell Publishing, ٢٠٠٨, pp. ٧٩-٨٨.

# ئەوروپا چۆن چۆنی کێشەی تایفی تێپەڕاند؟

## هاشم ساڵح
**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع**

پرۆفیسۆر "برنار کۆتری" بە یەکێک لە گەورە شارەزایانی کاروباری چاکسازی ئاینی ئەوروپی دادەنرێت. ئەو لە بنەڕەتدا لە زانکۆی ڤێرسای مامۆستایە و ئەندامی فەخریی پەیمانگای زانکۆیی فەرەنسایە. لێرەدا بە سێ نوسخە: ئەڵمانی و فەرەنسی و ئینگلیزی، کتێبێکی قەبە دەربارەی چاکسازی ئاینی پێشکەش دەکات. ئاشکرایە ئەم چاکسازییە، لە مێژووی ئەوروپا و لە سەروبەندی سەدەی شازدەهەم و هەروەها لە سەردەمی ڕێنیسانسیشدا، دیارترین و گەورەترین ڕوداو بوو. سەدەی شازدەهەم و سەردەمی ڕێنیسانس دوو قۆناغی پێکەوە بەستراون.
دانەر پێیوایە ئەم چاکسازییەی ئاین، ئەوە شوناسی ئەوروپای مۆدێرنی دروست کردووە، کاتێ سەرکەوت بەسەر سەردەمی ئیمپراتۆریەتی مەسیحی کۆن کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بڵاوببوەوە

و دەرگای لەبەردەم ناکۆکیی نەتەوەیی ئەڵمانی و فەرەنسی و ئینگلیزی.. هتد، کردەوە. پێش چاکسازی ئاینی، هەموان سەر بە جیهانی مەسیحی بوون و هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نەبوو، تەنها کەمەکێک نەبێت. لەو ڕۆژگارەدا ئاین هەژمونێکی تەواوی هەبوو، پێش هەموو شتێ ئاین شوناسی مرۆڤی ئەوروپی دروست دەکرد. ئەوەندە بەس بوو مەسیحی بیت، تا تەواوی مافەکان وەربگرێت. بەڵام وای لە حاڵی ئەوانەی سەر بە ئاینەکانی دیکە بوون، یان "زەندیقە" مەسیحییەکان یاخود ئەوانەی لای پاپای ڕۆما و ڤاتیکان بە زەندیق و لادەر دادەنران. ئەوانە بە ماوەیەکی زۆر پێش بەرپابوونی بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئاینی، دەچەوسێنرانەوە.

دەگێڕنەوە و دەڵێن جارێکیان چەکدارەکانی ڤاتیکان پەلاماری شاری "بێزییە"ی باشوری فەرەنسا دەدەن، گوایە ئەو شارە پڕە لە زەندیق. سەربازەکانی لە باڵیۆزەکەی پاپا یان لە نێردراوەکەی ڤاتیکان دەپرسن: چۆن بتوانین جیاوازی لە نێوان زەندیقەکان و نا زەندیقەکاندا بکەین تا نەیانکوژین. نێردراوەکە ئاوا وەڵامی چەکدارەکانی داوەتەوە: (هەر هەموویان بکوژن و کەس مەهێڵنەوە، خودا بۆ خۆی بەندە ساڵحەکانی دەناسێتەوە)، ئەم وتەیە بووە بە پەند. پاش ئەوەی چەکدارەکان تەواوی شارەکە داگیر دەکەن، باڵیۆزەکە هەواڵی سەرکەوتنە مەزنەکەی بۆ قەداسەتی پاپا دەنێرێت و دەنوسێت: (موجاهیدەکانمان دەستیان لە کەس نەپاراست، نە ئافرەتێک نە پیاوێک نە منداڵێک. دوژمنە کافرەکانمان هەلا هەلا کرد و بە شمشێرەکان زیاد لە بیست هەزار کەسمان لەناوبردووە. بە ڕاستی تۆڵەی خودایی، جوانترین و نایابترین تۆڵەیە).

ئا ئەمەیە عەقڵیەتی تیۆلۆژی کە لە سەروبەندی هەژمونی ڕەهای تاریکبینی مەسیحی، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەربڵاوبوو. لەو سەردەمانەدا تەکفیرکردن و ڕقی ئاینی، هەردووکیان بەربڵاوبوون. خۆشبەختانە لە ئێستادا مەسەلەکان زۆر گۆڕاون. ڤاتیکان چیتر هیچ کەسێ بە کافر دانانێت و پاپاش ڕوکارێکی مرۆیی پرشنگدار و لێبوردەیی لەگەڵ هەمواندا، وەرگرتووە. ئاشکرایە کۆڕبەندی دووەمی ڤاتیکان دانی بە ئیسلامدا ناوە و ڕێزگرتنی خۆی بۆ موسڵمانەکان ڕاگەیاند و داوای داخستنی لاپەڕە بە ئازارەکانی ڕابردوو و کردنەوەی لاپەڕەیەکی تازەی جیاوازتر دەکات. بگرە ڤاتیکان نوسینگەیەکی بۆ گفوگۆکردن لەگەڵ (غەیرە باوەڕدارەکان) یان ڕاستتر نا موتەدەینەکان کردووەتەوە. با هەنووکە بگەڕێینەوە بۆ کرۆکی باسەکەمان، وتمان دوای بەرپابوونی چاکسازی ئاینی، ئەڵمانییەک هەستی دەکرد جگە لەوەی مەسیحییە، ئەڵمانیشە. باشە ئەوە کێ بوو ئەو هەستەی لا دروست کرد؟ ئەوە ڕابەری گەورەی ڕیفۆرمی ئاینی مارتن لۆسەر بوو. ئەم پیاوە کە یاخیبوونی دژ بە ڕۆما ڕاگەیاند و پاپای بەوە تۆمەتبار کرد کە ئاین بۆ مەبەستی شەخسی و بەرژەوەندی خۆی بەکاردەهێنێت، ئەو بوو ئەڵمانەکانی لە خەوی قووڵی چەندین ساڵە خەبەرکردەوە و

وای لێکردن هەست بە شوناس و کەسێتییە مێژووییەکەی خۆیان بکەن.
لە ڕاستیدا پاپا گەلی ئەڵمانی لە ڕووی مادییەوە ئیستیغلال دەکرد، بگرە پێی ڕادەبواردن، گەر ئەو گوزارشتە ڕەوا بێت. چۆن؟ لەسەر یاریکردن بە ژێی سۆزی ئاینی مەسیحی و ڕازیکردنیان بەوەی لە ئامێزی مەسیحیەتدا بمێننەوە، ئەمەش لە پێناو ئەوەی ساڵانە ملیۆنەها دینار لە گەلی ئەڵمانی وەربگرێت و لە ڕۆمای کاردیناڵ و مەترانەکان و پیاوە ئاینییە دەوڵەمەندەکان کە بەشی هەرە زۆریان دەوڵەمەندی گەندەڵ بوون، کۆشک و باڵەخانەی پێ دروست بکات. دواتر مارتن لۆسەر هات و بە گەلی ئەڵمانیای وت: (ئەم پاپایە ساڵەهایە ڕادەبوێرێ پێتان، بە ناوی ئاین و ئیمانەوە خوێنتان دەمژێت، کەچی خۆی ژیانێکی پڕ کەیف و سەفا و ڕابواردن دەژی کە مەسیح ئەو جۆرە ژیانەی ڕەتکردووەتەوە. گێلیەتی و کەوتنەدوای پاپا و ڤاتیکان بەسە. ئەوانە لە ئاین لایانداوە و ئاینیان پیس کردووە و چیتر گوێڕایەڵیان هەرگیز ئەرک نییە).
دواتر لۆسەر هیرشێکی توندی کردە سەر (صكوك الغفران) کە ڤاتیکان بە گەلە هەژار و دواکەوتووەکەی دەفرۆشت، گوایە هەر کەسێ کڕی، ئەوا دەچێتە بەهەشت، تا پارەی زۆرتر بدات، ڕۆحی زیاتر بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە! بگرە دەتوانی بۆ مناڵەکان و بۆ باو و باپیرانیشت بکڕیت کە مردوون و ترسی ئەوەت هەیە بڕۆنە دۆزەخ. ڕۆحیان بکڕەوە و یەکسەر دەڕۆنە بەهەشت. ئەوە پێڕابواردنێکە هیچ پێڕابواردنێکی دیکە شان لە شانی نادات. بەڵام گەلی ئەڵمانی باوەڕی پێ دەکرد، چونکە ئەوەی زۆر لێی دەترسا ئەوەبوو بڕواتە ناو ئاگری دۆزەخ.
پاپا بۆ فرۆشتنی ئەم (نامە-صكوك) پڕوپوچانە کە هیچ پەیوەندییەکیان نە بە ئیمان و نە بە ئاینی ڕاستەقینەوە هەیە، پیاوەکانی خۆی بۆ هەموو سوچ و قوژبنێکی ئەڵمانیا دەنارد، تا باجی (پیرۆز) و پارەی بێ شومار کۆبکەنەوە. ئیمان وای لێهاتبوو بە پارە دەکڕدرا. تەنانەت گەر ڕیسواترین کەسیش بێت، ئەوا ئەو نامانەیان پێ دەدایت، بەو مەرجەی شتێک پارە بدەیت! ئا لەو کات و ساتەدا، مارتن لۆسەر تا بڵێی تووڕە بوو، شۆڕشێکی بێ ئامانی دەست پێکرد و ڤاتیکانی هەژانێکی گەورە هەژان.
پاشان لۆسەر دەڵێ: ئێوە بۆ ئەوەی لە ئاینەکەتان تێبگەن و شیکردنەوە بۆ کتێبی پیرۆز بکەن، پێویستتان بەوان نییە. خودا عەقڵی پێ بەخشیوون بۆ ئەوەی کاری پێ بکەن نەک لە کاری بخەن، ئیماندار پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ خودای خۆیدا هەیە و پێویستی بە نوێنەر نییە. هیچ ئیماندارێک لەوی دیکە باشتر نییە، مەگەر بە دەستپاکی و بێگەردی و ڕەفتاری ڕاست و ڕەوان نەبێت. ئیدی سەردەمی نوێنەرایەتی و دەڵاڵبازەکان بەسەرچوو کە بازرگانیان بە ئاینەوە دەکرد و تادەهات میللەتیان نوقمی نەزانینی زیاتر و هەژاری زیاتر دەکرد.
دواتر لۆسەر کتێبی پیرۆزی وەرگێڕایە سەر زمانی ئەڵمانی، ئاشکرایە پێشتر کتێبی پیرۆز تەنها بە زمانی لاتینی دەخوێنرایەوە: واتە بە زمانی پیرۆزی کڵێسا. زمانی لاتینی بە بێ بایەخ و نزم تەماشای زمانی گەلانی دەکرد، وەک

زمانی ئینگلیزی یان ئەڵمانی یاخود فەرەنسی، پێیوابوو ئەو زمانانە زمانی بازاڕی و گشتی و بێ نرخن و بۆ نووسین و خوێندنەوە دەست نادەن.
لۆسەر بوێری ئەوەی کرد کتێبی پیرۆز وەرگێڕێتە سەر زمانێکی (گشتی و بازاڕی)، بەوەش زمانی ئەڵمانی، بەو مانایەی لەمڕۆدا ناسراوە دامەزراند و شێوەزارەکانی ئەو زمانەی یەکخست. لێرەوە لۆسەر تەنها ڕابەرێکی ڕیفۆرمخوازی ئاینی نەبوو، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا دامەزرێنەری خواستی ناسیۆنالیزمی ئەڵمانی، بگرە زمانی ئەڵمانیش بوو. لەبەر ئەم هۆیەیە ئەڵمانەکان بە مەزنترین کەسایەتی مێژوویی دایدەنێن. جگە لەوە لۆسەر یاسایەکی دیکەی لە یاساکانی پاپاویەت تێکشکاند، ئەویش یاسای بە ڕەبەنی مانەوەی پیاوانی ئاینی بوو. خانمێکی شۆخ و شەنگی هێنا کە پێشتر ڕاهیبە بوو، لەم بارەیەوە بە مەسیحییە ئەڵمانییەکان دەڵێ: خودا بۆ هەتا هەتایە ڕەبەنی بەسەرماندا فەرز نەکردووە، وەک ئەوەی پاپای ڕۆما پێیوایە. پیاوی ئاینیش مرۆڤێکە وەک هەر مرۆڤێکی دیکە و کۆمەڵێ غەریزەی هەیە، مافی خۆیەتی بە شێوەیەکی سروشتی تێریان بکات، گەر نا ئەوا مەسەلەکان تێکدەچن و خراپ دەبن.
بەم شێوەیە ژنهێنان و شووکردنی پیاوان و ژنانی ئاینی (ڕاهیب و ڕاهیبە)، لە مەزهەبی پرۆتستانتیدا سیفەتێکی شەرعی وەرگرت، ئەمە لە کاتێکدایە تا ئێستا لە مەزهەبی کاسۆلیکیدا قەدەغەیە. ئاشکرایە ئەوە کێشەی زۆری خستووەتەوە، بگرە ئابڕوچونی سێکسی شەرمهێنی لێکەوتووەتەوە کە ناو بەناو لە میدیاکانەوە باس دەکرێن و نەنگییەکی گەورەی بۆ ڤاتیکان دروست کردووە. هەنووکە یەکێک لەو داواکاریانەی پێداگیری زۆری لەسەر دەکرێت و خراوەتە بەر دەست پاپا (فرانسیس) کە مرۆڤێکی بەڕێزە، ئەوەیە ڕێگە بە ڕاهیبەکان بدرێت هاوسەرگیری ئەنجامبدەن. بەڵام ئایا بوێری ئەوە دەکات ئەم چاکسازییە مەترسیدارە بەدیبێنێت؟ ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لۆسەر بە چوار سەد ساڵ پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتبوو. دواتر بیروڕاکانی لۆسەر گواسترانەوە بۆ تەواوی ئەورووپا و بڵاوبوەوە وەک بڵاوبوونەوەی ئاگر لە پوش و پەڵاش. ئیدی لەو ڕۆژگارەوە ئەورووپا بۆ دوو بەش دابەش بوو: کاسۆلیکی لە باشور و پرۆتستانتی لە باکور.
دوای ئەوە، بە درێژایی هەر دوو سەدەی شانزەهەم و حەڤدەهەم، جەنگی مەزهەبی لە نێوان ئەو دوو لایەنەدا بەرپابوو، لە هەموو شوێنێکدا لەسەر شوناس مرۆڤەکان دەکوژران. قەسابخانەی تائیفی مەرتسیدار ڕوویاندا، لە هەموویان بەناوبانگتر قەسابخانەکەی سانت بارتیلیمی بوو کە تا ئێستا لە کۆ نەستی یادەوەری فەرەنسیا ماوەتەوە. ئەو قەسابخانەیە لە ٢٤/ ئابی ساڵی ١٥٧٢ ڕوویدا، واتە پێش نزیکەی چوار سەدە و نیو. لە شەوێکی تاریکدا، تەواوی ڕابەرانی مەزهەبی پرۆتستانت کە نووستبوون، بوونە قوربانی و بە غەدر هەموویان کوژران. پاشان ئاگری تایفەگەری کڵپەی سەند و

هەزاران خەڵکی دیکەی لە پیاوان و ژنان و منداڵان، بێ جیاوازی، لەناوبرد. پاپای ڕۆمای ئەو سەردەمە، چەپڵەی بۆ ئەو قەسابخانەیە لێدەدا و پێیوابوو ئەوە سەرکەوتنێکی ئاشکرای ئیمانی ڕاستەقینەیە بەسەر زەندیقەکاندا. فەرەنسییەکان، بەو هۆیەوە، ئێستاشی لەگەڵ دابێت، لەبەرامبەر خۆیان هەست بە شەرمەزاری دەکەن. فەرەنسییەکان دوای ئەوەی تێگەشتن و پێشکەوتن، ئەو قەسابخانەیە بە لاپەڕەیەکی ڕەشی مێژوویان لەقەڵەمی دەدەن.

دواتر پرۆفیسۆر برنار کۆتری بەردەوام دەبێت و دەڵێ: پێویستە ئەوەش بزانین، دووەم ڕابەری ڕیفۆرمخوازی ئاینی پاش مارتن لۆسەر، (جان کالڤن)ی فەرەنسییە. جان کالڤن لە لەدایکبوانی شاری (ئامیان)ی پایتەختی هەرێمی بیکاردییە. لێرەوە ڕیفۆرمی ئاینی، ڕەگێکی فەرەنسیشی هەیە، نەک تەنها ئەڵمانی. ئاشکرایە ئەم ڕابەرە ئاینییە گەورەیە، سەرزەمینی فەرەنسای بەجێهێشت و ڕووی کردە شاری جنێف و تێیدا نیشتەجێ بوو، بووە سەرکردەیەکی ڕۆحی ئەو شارە. لەبەر ئەم هۆیەیە شاری جنێف لە سویسرا، بووەتە پایتەختی پرۆتستانتیەت، وەک چۆن ڕۆما پایتەختی کاسۆلیکییەتە. جنێف شاری (کالڤن)ە بە پلەی یەکەم، دواتر بووە شاری جان جاک ڕۆسۆ کە هەموو وتارەکانی بەم وتە بەناوبانگە واژۆ دەکرد: هاوڵاتییەک لە جنێف، دەنگدانەوەی وتارەکانی لە هەموو لایەکی ئەوروپا دەنگی دەدایەوە. ئەوە ڕۆسۆ بوو ڕیفۆرمی دووەمی لە مەسیحیەتدا دەست پێکرد: واتە ئایینداری عەقڵانی ڕۆشنگەر. ئەو مەسیحییەتی لە داخستنەکان و خورافات و زیادەڕەوی و ململانێی تائیفی ناشرین پاککردەوە. کرۆکی ئاینی ئاشکرا کرد و توێکڵە بێ کەڵکەکانی لێ داماڵی. بەوەش هەنگاوێکی گەورەی نا، بە بەراورد بەوەی لۆتەر و کالڤن ئەنجامیاندا.

ڕۆسۆ لەگەڵ فەیلەسوفە ڕۆشنگەرەکانی دیکەدا، ئەوروپایان خستە نێو تازەگەری ئاینی و ئەخلاقی و سیاسییەوە و پەیمانی کۆمەڵایەتی پێشکەش کردن: واتە ئینجیلی شۆڕشی فەرەنسی. ئاشکرایە جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتیبوون کە شۆڕشی فەرەنسی لە بەرواری ٢٦ ئابی ساڵی ١٧٨٩ بڵاویکردەوە، تا ئاستێکی زۆر لە فیکری ڕۆسۆوە وەرگیراوە. لێرەوە لەو پەیوەندییە جومگەییە تێدەگەین کە فیکر و سیاسەت پێکەوە دەبەستێتەوە. کەچی دوای هەموو ئەوە دێن و پێت دەڵێن: ڕۆشنبیران چ سودێکیان هەیە؟ هیچ سیاسەتێکی مەزن، بە بێ بوونی فیکرێکی پێشوەختەی مەزن، بوونی نییە.

بەم شێوەیە ئەوروپا توانی هێدی هێدی لە تاریکییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و دەمارگیری ئوسوڵی بێتە دەرەوە و بڕواتە نێو تازەگەری فیکری و لێکبوردەیی ئاینییەوە. بەم جۆرە ئەو کێشە تایفییە مەترسیدارەی تێپەڕاند کە چەندین نەوەی ئەوانی وێران کرد و بۆ چەندین سەدە، ڕۆشنایی لە چاوانیاندا کوژاندبووەوە.

---

**سەرچاوە: الشرق الاوسط**، ١٩ / ٣/ ٢٠١٤



# نەتەوەیەك چییە؟

ئێرنێست ڕێنان
**لە ئیتالییەوە: جەمال زەندی**

بەڕێوەچوونی کۆنفرانسێک لە سۆربۆن ١١مارسی ١٨٨٢

ئەوەی مەبەستمە لەگەڵ ئێوە بیدەمە بەر باس و تاوتوێ بکەم، هزرێکە کە تەنها بە ڕواڵەت ڕوونە، بەڵام لە ڕاستیدا خراپ لێ تێگەیشتنی زۆر ئاسانە. فۆرمی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەمیشە هەمەچەشن بووە. زۆر کۆمەڵگە بە پێکهاتەی ڕەنگاوڕەنگەوە هەن، وەکو چین، میسر، بابلی کۆن، هەندێک خێڵ وەک یەهوودییەکان و عەرەبەکان، هێندێک شار وەک ئاتێن وسپارت، یەکێتی وڵاتە جیاجیاکان وەک ئیمپڕاتۆری کارۆلینجۆ، جڤاتە بێ وڵاتەکان کە ئایین بۆتەوە هۆی یەکگربوونیان، وەک ئیسرائیلی و پارسەکان، وڵاتانی وەک فەرەنسا، ئینگلیز و بەشێ زۆر لە وڵاتە ئەوروپاییەکان، هەندێک کۆنفێدراسیۆن وەک سویس و ئەمریکا، جۆرێک لە خزمایەتی کە پەیوەندی بە ڕەگەز یان

باشتر بڵێین بە زمانەوە هەیە، لە نێوان گرووپە جۆراجۆرە ژێرمەن و سلاڤەکاندا هەیە. هەموو ئەمانە فۆرم و پێکهاتەی ئەو گرووپانەن کە بوونیان هەیە یان بووە و ناتوانن بێ ئەوەی تووشی بارگرژی و کێشە ببن، ئاوێتەی یەک ببن. لە سەردەمی شۆرشی فەرەنسادا پێیان وا بوو دەتوانن دامەزراوە و شارە بچووک وسەربەخۆکانی ئاتێن و سپارت لەگەڵ وڵاتە گەورەکانی سەردەم کە ژمارەی دانیشتووانیان دەگاتە سی یان چل ملیۆن کەس هەڵسەنگێنن. هەڵەیەکی ترسناک کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ڕوودەدات ئەوەیە کە وڵات و ڕەگەزیان تێکەڵ کردووە و گەلانێک کە بەڕاستی بوونیان هەبوو، لە گەڵ گرووپە زمانی و ئتنییەکان بە یەک جۆر پێناسە دەکەن. هەوڵ دەدەین زۆر بە وردی ئەم پرسە شی بکەینەوە، چونکە ئاڵۆزی لە مانای وشەکاندا دەتوانێ ببێتە هۆی هەڵەی کوشندە. باسێکی زۆر هەستیار و ناسکە، لەبەر ئەوەی ئێمە بە جۆرێک زیندووەکان دەدەینە بەر باس و شیکاری وەک چۆن شیکاری مردووەکان بکەین، هەر بۆیە هەموو هەوڵمان دەخەینە گەڕ بۆ دادوەرییەکی بێ لایەنانە.

١

هەر لە بەرەبەیانی هەرەسهێنانی ئیمپڕاتۆری ڕۆمەوە یان باشتر بڵێین لە دەسپێکی هەڵوەشانەوەی ئیمپڕاتۆری کارۆلینجۆوە، پێدەچێ ئەورووپای ڕۆژاوا دابەش بووبێ بە سەر نەتەوەکاندا – لە سەردەمە جیاکاندا – هەندێک لەوان هەوڵیان دا بەسەر ئەوانیتردا حوکمڕانی بکەن، بە بێ دەستەبەرکردنی سەرکەوتنێکی درێژ خایەن. کارێک کە نە کارلۆی پێنج و لویجی چواردەهەم و نە ناپلیۆنی تێدا سەرکەوتوو بوون. دژوارە لە داهاتووشدا کەسی تێدا سەرکەوتوو بێ. دامەزراندنی ئیمپڕاتۆرییەکی نوێ وەکو ڕۆم یان ئیمراتۆری تازەی کارۆلینجۆ ئیتر مومکین نییە.
دابەش بوونی ئەورووپا ئەمێستا ئیتر ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە و هەر هەوڵێک بۆ دەسەڵاتداری بەسەر هەموویدا بە بێ ماتڵ بوون دەبێتە هۆی پێکهێنانی هاوپەیمانی بە گەڕانەوە بۆ سنوورە سرووشتییەکانی. ئەورووپا، بۆ ماوەیەکی زۆر خاوەنی جۆرێک هاوسەنگی تایبەتی بوو: فەرەنسا، ئینگلیز، ئاڵمان و ڕووسیا دیسان بۆ سەد ساڵی تر دەمێننەوە، سەرەڕای ئەو ڕووداوانەی کە ڕەنگە بە دژیان بن، کەسایەتی مێژوویی، واتە پاژی سەرەکی شەترەنجێکن کە خانووەکانی بەردەوام لە بەر گرینگی و گەورەیی لە گۆڕان دان، بێ ئەوەی بە یەکجاری تێکبچن. بەم پێیە دیاردەی نەتەوە لە مێژوودا تازەیە، لە ڕابردوودا شتێک بە نێوی نەتەوە نەبوو: میسر، چین و کلدانی کۆن هەرگیز نەتەوە نەبوون. جڤاتانێک بوون کە یەک لە کوڕەکانی هەتاو یان یەک لە کوڕەکانی ئاسمان ڕێبەری دەکردن. شارۆمەندیی چینی و میسری لە ئارادا نەبوو. مێژووی کۆنی کلاسیک کۆمار و شارییارییە ناوچەییەکانی لە بیرە، کۆفێدراسیونی کۆماری هەرێمی و ئیمپڕاتۆرەکانی لە بیرە: بەڵام نەتەوە بەم جۆرەی ئێمە ئەمڕۆ مەبەستمانە نەبووە.. ئاتێن، سپارت، سیدۆن،

تیرۆ، نموونەی هێندێک ناوەندی بچووک و بە شکۆی وڵاتپارێزین. گەرچی ئەو شارانە سەرزەمینەکانی بە ڕادەی بەرچاو تەسک بوو. گالیا، سپانیا و ئیتالیا - پێش ئەوەی لە نێو ئیمپراتۆری ڕۆماندا بتوێنەوە - کۆمەڵە خەڵکانیک بوون، کە زۆرجار پێکەوە هاوپەیمان بوون، بەڵام بە بێ ئەوەی دامەزراوەیەکی ناوەندی یان زنجیرە پاشایەتی پێک بهێنن. تەنانەت ئیمپراتۆری ئاشوور، پارسەکان و ئیمپراتۆری ئەسکەندەریش وڵات نەبوون. ئاشوورییەکان هەرگیز وڵاتپارێز(پاتێریوت) نەبوون: ئیمپراتۆری پارسەکان فیودالییەکی پان و بەرین بوو. تەنیا یەک نەتەوە نییە کە لە لەشکەرکێشییە مەزنەکەی ئەسکەندەرەوە سەری هەڵدابێ، کە دەرنجامەکەی بە گشتی بۆ مێژووی شارستانیەت بە سوود بوو. ئیمپراتۆری ڕۆم زۆر نزیک بوو بە پێکهاتەی وڵاتەوە، ئەوەش کاتێک بایەخی پەیدا کرد کە گۆڕانکارییە بەرینەکانی کۆتایی شەڕ بوو بە هۆی باڵادەستی ڕۆمییەکان و یەکخستنێکی بەرین و جۆریک لە ئاشتی و سەر و ساماندانی سەقامگیر کرد.

لە ئاخر و ئۆخرەکانی ئیمپراتۆرییەکەدا لە نیوان کەسانی خاوەن گیانی بەرز، ئوسقۆفە ڕۆشنەکان و خەڵکی خوێندەواردا، هەستێکی ڕاستەقینە بە «پاکس ڕۆمان» (ئاشتییەک کە لە سەردەمی ئیمپراتۆری ڕۆمدا بۆماوەیەکی زۆر لە ڕۆژاوا سەقامگیر بوو) لەئارا بوو، دژی بێسەر و بەرەیی کە بێگانەکان ورووژێنەری بوون. بەڵام ئیمپراتۆرییەک دوازدە هێندە گەورەتر لە فەرەنسای ئەمرۆ لەو ئاستەدا نییە نەخشی دەوڵەتیکی مۆدێرنی ئەمرۆیی بگێڕێ. دابران و جیایی لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا لە سەدەی سێهەمدا هەلێک بوو بۆ دامەزرانی ئیمپراتۆری گالیکۆ (Gallico).

چێنەری ئەو تووەی دواتر بوو بە بنەما و یارەمای ناسیونالیزم هێرش و لەشکەرکێشی ژێرمەنەکان بوو.

بەڕاستی، ژێرمەنەکان لە دەسپێکی هێرشە بەربڵاوەکانیانەوە لە سەدەی پێنجەمەوە تاکوو دواهەمین داگیرکارییە نۆرمانەکانیان لە سەدەی دەیەمدا چییان کرد؟ نەختێ زەمینی ڕەگەزیان گۆڕی، بەڵام زنجیرە ئەریستوکراسییەکی چەکدارانە لە بەشێکی بەرین و بەرچاو لە ئیمپراتۆرییە کۆنەکەی ڕۆژئاوا دادەمەزرێنن، کە دواتر وەک داگیرکەر نێویان لێ دەبرێ. لەوێندەرەوە فەرەنسا، بوورگوندیا، لۆمباردیا، دواتریش نۆرماندیا دروست دەبن. ئیمپراتۆری فرانکۆ، کە بەرهەمی پاوانخوازیی بوو، توانی بۆ ماوەیەکی کورت ئەوروپا بکاتە یەکپارچە، بەڵام ئەم ئیمپراتۆرییە بە شێوەییەکی چارەهەڵنەگر لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆهەمدا لە بەریەک هەڵوەشایەوە. ڕێکەوتنی ڤێردوون (Verdun) دابەشبوون بوو لە سەرهێڵی کەمترین گۆڕانکایی، لەوە بەدواوە فەرەنسا، ئاڵمانیا، ئینگلیز، ئیتالیا و سپانیا، بە ڕێبازی دژبەیەکدا دەئاژوێن و بەنێو هەزاران ڕووداودا دەپەڕینەوە، بۆ پێگەیاندنی یەکجاری نەتەوەیی خۆیان، بەو شێوەی ئەمرۆ دەیانبینین. لە واقیعدا ئەوەی تایبەتمەندی ئەم دوڵەتانەیە

ئاویتەیی گەلانی دامەزرێنەریانە.
لەنێو ئەو وڵاتانەی هەر ئێستا ئاماژەمان پێ کردن، هیچ شتێکی هاوشێوەی ئەوەی لە تورکیا دەبینرێ، بەدی ناکەین، لەوێ تورک، سلاڤ، یۆنانی، ئەرمەنی، عەرەب، سووری و کورد ئەمڕۆ جودا جودان، هەر وەک دەمی بە کۆیلە کردنیان.

ئەوە ئاکامی دەور و نەخشی دوو هەلومەرجی سەرەکی بوو؛ هەر لە سەرەتا و یەکەم هەنگاودا خەڵکی ژێرمەن لەگەڵ یونانی و لاتیندا پێوەندی بەرقەرار دەکەن و مەسێحیەت قەبووڵ دەکەن. کاتێک سەرکەوتوو و ژێرکەوتوو هەردووکیان ئایینی هاوبەشیان هەبێت، یان باشتر بڵێین کاتێک سەرکەوتوو ئایینی ژێرکەوتوو قبووڵ ئەکات،



ئیتر ناتوانێ وەبەرهێنەری سیستێمی تورکی بێت: بەشی بەرچاو لە دابەشبوونی مرۆڤایەتی لەسەر بنەمای لایەنگری لە ئایینەکانە.
دووهەم: فەرامۆش کردنی یەکجاری زمانی تایبەتی لە لایەن داگیرکەرانەوە بوو. نەوەکانی کلۆدۆڤێۆ، ئالاریکۆ، گۆندێبالدۆ، ئابلۆینو و ڕۆلۆنێ بە زمانی ڕۆمانی قسەیان دەکرد. ئەم ڕووداوە بە نۆبەی خۆی ئاکامی تایبەتمەندییەکی گرینگ بوو: فرانکی، بوورگوندی، گۆتیەکان، لۆنگۆباردی و نۆرمانی، زۆر کەم ژنی هاوڕەگەزیان لەگەڵ بوو. بۆ چەند نەوەیەک سەرکردەکان تەنها لە ژنانی ژێرمەنیان دەخواست، بەڵام گراوەکانیان لاتینی بوون، شێوەی پەروەردەی منداڵەکانیشیان هەر لاتینی بوو. هەموو ئەندامانی خێڵەکان لەگەڵ ژنی لاتینی گۆڤەندیان ساز دەدا، واتە، دوای سەقامگیر بوونی فرانک و گۆتیەکان لەسەر خاکی ڕۆمانەکان، زمانی گۆتی و فرانکەکان گەر تۆزێک بەختی هەبوو، چەقی بەست. لە ئینگلیزدا وا نەبوو، هۆکاریش ئەوە بوو کە ئەگەرچی ڕەنگە داگیرکەرانی ئانگلۆساکسۆن ژنیشیان لەگەڵ بووبێ، بەڵام خەڵکی بریتانی ڕەویان کرد، لە لایەکی ترەوە لەوێ لاتینی زۆر بەرچاو نەبوو یان باشتر بڵێین هەرگیز لە بریتانیا باڵادەست نەبوو.
ئەگەر لە سەدەی پێنجەمدا لە گالیا بە فراوانی بە گالی قسەدەکرا، کلۆدۆڤێۆ و دەست و پێوەندەکانی لەبەر زمانی گالی دەستبەرداری زمانی ژێرمەن نەبوون، کەوابوو ئاکامی بنەڕەتی بوو بە ئەوە کە سەرەڕای هێز و تەوژمی داب و نەریتی داگیرکەرانی ژێرمەن، لەگەڵ چەرخی زەماندا ئەو فۆرمەی ئەوان دامەزرێنەری بوون، بوو بە فۆرمی نەتەوەکان. بە شێوەیەکی تەواو یاسایی فەرەنسا دەبێتە نێوی ئەو وڵاتەی کە تەنها گرووپێکی بچووک و کەمینەی فرانکی تێدا جێگیر ببوون. لە سەدەی دەیەمدا، لەنێو یەکەم «کانسۆنس دێ ژست» (سرروودەکانی شکۆ) ئەوانەی کە نموودێک لە ئاوێنەی باڵانوێنی ڕۆحی تەواوی سەردەمی خۆیانن، هەموو دانیشتووانی فەرەنسا فەرەنساییین. لە گریگۆری تۆرسوودا، بیری ڕەگەزێکی جیاواز لە نێو خەڵکی فەرەنسادا بە باشی خۆ دەنوێنی کە هەرگیز لەنێو نووسەر و شاعیرەکانی پاش ئووگۆ کاپێتۆ، بەرچاو ناکەوێ. جیاوازی نیوان ڕەسەن و عەوام بە تەواوی دیارە، بەڵام ئەوە بە هیچ جۆرێک جیاوازی ڕەگەزی نییە، جیاوازییە لە بوێریدا، نەریت پەروەردەیی کە بەمیرات پێیان گەیشتووە. بە زەینی هیچ کەس ناگات کە ڕیشەی هەموو ئەمانە لە داگیرکەرییدا بێت. ئەو تێیۆرییە درۆیینەی کە پێی وایە ڕیشەی ڕەسەنایەتی لە مافێکی تایبەتیدایە کە لەلایەن شاوە بە خزمەتگوزار و گەورەکانی نەتەوە بەخشراوە و گوایە بە جۆرێک کە هەر ڕەسەنێک، «ڕەسەنایەتییە»، لە سەدەی سێزدەدا وەک بیر گرسا.
دوای ئەوەی داگیرکەری نورماندییەکان کۆتایی پێ دێت، هەر هەمان شت ڕاستی خۆی دەسەلمێنێ. یانی لە ماوەی یەک یان دوو نەوەدا ئیتر داگیرکەرە نورماندییەکان خۆیان لە باقی

خەڵک جیا ناکەنەوە، ئەڵبەت ئەمە نەبووە هۆی کەم بوونی کاریگەرییان؛ ئەوان داب ونەریتێکی چەکداری و وڵاتخوازیی و چینێکی ڕەسەنی چەکداریان ڕادەستی وڵاتی داگیرکراو کرد کە پێشتر خاوەنی نەبوون.
فەرامۆشی، یان باشترە بێژم هەڵەی مێژوویی پێشاندەری ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە لە دروستکردنی یەک نەتەوەدا، هەر بەم هۆیەوە ڕۆچوون لە خوێندنەوە مێژووییەکان زۆر جار دەبێتە نموودێکی مەترسیدار بۆ نەتەوەگەرایی. لە ڕاستیدا توێژینەوەی مێژوویی، ڕاستی ئەوە شەڕ و شۆڕانە ڕوون دەکاتەوە کە هاوکات بوو لەگەڵ سیستێمە سیاسییە جوراوجۆرەکاندا و بەوانەشەوە کە ئاکامی سوودمەندیان بووە؛ یەکێتی هەمیشە بە زەبر و زەنگ جێ بە جێ دەبێ: یەکخستنی فەرەنسای باکوور و فەرەنسای باشوور ڕەشەکوژی و کاولکارییەکی بە شوێنەوە بوو کە نزیک بە یەک سەدەی بە بێ وچان خایاند.
شای فەرەنسا – گەر بکرێ وا بێژم – نموونەیەکی ئارمانی؛ «کوورەی تاواندنەوەی» سەدە بوو: شای فەرەنسا ئەوەی کە بەدیهێنەری یەکێتی زۆربەی فەرەنسای ئەمڕۆ بوو. بەسەرهاتی شای فەرەنسامان بینی، ئەو پرستێجی خۆی دۆڕاند؛ ئەو نەتەوەی ئەو ساماندەری بوو، تووکیان لێ کرد. ئەمڕۆ تەنها کەسانی وشیار لەو ئاستەدان لەوە تێ بگەن کە ئەو مەبەستی بوو بە سەرەنجامی بگەیەنێ و ئەوەی بە سەرەنجامی گەیاند.
هەندێک یاسای بلیمەتی مێژوویی لە ناکۆکیدا هەستیان پێ دەکرێ، ئەو پلانەی شای فەرەنسا بەو شێوە شکۆمەندە، بەشێکی بە زەبر و زەنگ و بەشێکی بە ئاشتی، ڕێبەری کرد و بە ئاکامی گەیاند، لە زۆر وڵاتدا تووشی شکست بوو. لە ژێر تاج و تەختی سانت ستێفانۆدا، مەجارییەکان و سلاڤەکان جیا مانەوە، هەر وەکوو چۆن هەشسەد ساڵ پێش جودا بوون. لویجی بۆ پتەوکردنی زنجیرەپاشایەتی ئاسبوورگ، زۆرجار بندەستەکانی لێک دادەبڕی و دەیانیدا بە گژیەکدا. لە بۆهیمیا، چیک و ئاڵمانی هەرگیز دانەیان پێکەوە نەدەکولا، سیاسەتی تورک لە مەڕ جیاکردنەوەی نەتەوەکان لە سەر بنەمای ئایین ئەزموونێکی پڕ تاڵ بوو، بوو بە هۆی خاپوور بوونی ڕۆژهەڵاتی ناڤین. بنواڕن شارێک وەک ساڵۆنیک یان سمین: لەوێ پێنج، شەش جڤات دەبینن، هەرکامیان بیرەوەری تایبەت بە خۆی هەیە و دەکرێ بڵێین هیچ شتێکی هاوبەشیان نییە.
لە کاتێکدا جەوهەری نەتەوەیەک لەودایە کە هەموو ئەندامەکانی لە سەر میراتێکی هاوبەش کۆکن و زۆر شتیان فەرامۆش کردووە، هیچ شارۆمەندێکی فەرەنسایی بیرەوەری لەوەی کە بووگاردی، ئالانۆی یان ڤیزگۆتۆیییە نییە؛ هەر شارۆمەندێکی فەرەنسا دەبێ شەوی سان بارتۆلۆمێو و کۆمەڵکوژییەکەی سەدەی سێزدەی باشووری فەرامۆش کردبێ.
فەرەنسا دە بنەماڵەی لێ نییە بە تاقیکردنەوە بیسەلمێنن کە بە ئەسڵ دەگەڕێنەوە سەر فەرانکەکان، هەڵبەت وەها تاقیکردنەوەیەک بە هۆی تێکەڵاویی نەناسراوەوە هەر زۆر نوقسان

دەبێ و دەتوانێ هەموو تیۆرییە ژێنێتیکییەکان تووشی سەر لێشێواوی بکات.

کەوابوو، نەتەوەی مۆدێرن ئاکامێکی مێژوویی و بەرهەمی زنجیرەکردارێکی هاوتەریبن بەرەو یەک ئاقار. هێندێ جار یەکگرتوویی لە ڕێگەی زنجیرە پاشایەتییەوە سەپاوە، بۆ نموونە فەرەنسا. جاروباریش لە ئیرادەی هەرێمەکانەوە، بۆ نموونە هۆلەند، سویس و بلژیک، یان لەلایەن سەرکردەیەکی سپاوە کە بووەتە بزوێنەری بزاڤەکان و دواتر خۆی بەسەر بڕوبیانووی فیۆداڵەکاندا سەپاندوە، وەک ئیتالیا و ئاڵمان.

لە هەر حاڵدا، هەمیشە هۆکارێکی سەرەکی بزوێنەری ئەم بزاڤانە بووە. لە وەها نموونەگەلێکدا هۆکارەکان لەنێوان سەرسووڕمانی چاوەنوارنەکراوەدا خۆ دەهاوێنە بەر تیشک. بە چاوی خومان یەکگرتنی ئیتالیامان لە تێکشاندا بینی، خاپوور بوونی تورکیا لە سەرکەوتندا.

هەر شکانێک دەبوو بە هۆی یەکێتی ئیتالیاییەکان و هەر سەرکەوتنێک دەبوو بە هۆی لاواز بوونی تورکیا، چونکە ئیتالیا یەک نەتەوەیە، لە کاتێکدا تورکیە – لە دەرەوەی ئاسیای بچووک – نەتەوە نییە.

لە ڕێگەی شۆڕشی فەرەنساوە بانگەوازی بوونی نەتەوەیەک بکرێ، جێی شانازییە بۆ فەرەنسا، کەس نابێ پێی ناخۆش بێت ئەگەر لاسایی کرایەوە. بنەمای نەتەوە هی فەرەنسایە. بەڵام بەهەرحاڵ نەتەوە چییە؟ بۆچی هۆلەند نەتەوەیە، لە کاتێکدا هاننوڤێر و گەورەدووکی پارما نەتەوە نین؟ بۆچی فەرەنسا بەردەوامە لە نەتەوە بوون، لە کاتێکدا بنەما ئافرێنەرەکانی بزر بوون؟

بۆچی سویس کە خاوەنی سێ چوار زمان، دوو ئایین و سێ چوار ڕەگەزە، یەک نەتەوەیە، لە کاتێکدا، بۆ نموونە تۆسکانا (ناوچەیەک لە ئیتالیا) ئەوندە فرەڕەگەزە، نەتەوە نییە؟ بۆچی ئاووستریا دەوڵەتە و نەتەوە نییە؟ چی بنەمای ڕەگەزی و نەتەوەیی لێک جودا دەکاتەوە؟

گیانی وردبین تا وەڵامی شیاو بۆ ئەم پرسیارانە نەدۆزێتەوە ئۆقرە ناگرێ. بە دڵنیاییەوە کێشەکانی جیهان بە وەڵامی ئەم پرسیارانە چارەسەر نابێ، بەڵام مرۆڤی شێلگیر بەڵگەی دەوێت بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە بە مەبەستی ڕەواندنەوەی ئەو تەم و مژەی گیانە سەرسەرییەکانی تێدا نووقم دەبن.

٢

هێندێ بیرمەندی زانستی سیاسی لەو باوەڕە دان کە یەک نەتەوە زنجیرەپاشایەتییە، ئەوەی لە کۆندا داگیریانی کردبوو؛ ئەمە پێشتر قبووڵ کرا بوو، بەڵام دواتر لە لایەن گەلەوە لە بیر کرا. بە بڕوای ئەو چالاکە سیاسییانەی جێی ئاماژەی منن، یەکخستنی ناوچەکان کە لە لایەن زنجیرەپاشایەتییەکەوە بەڕێوە چووە (لە ڕێگەی شەڕ، ژن و ژنخوازی، یان ڕێکەوتنەکانیانەوە) بە تێداچوونی زنجیرە پاشایەتی بنیادنەرییان ئەوانیش هەرسیان هێناوە. ڕاستە کە زۆربەی نەتەوە مۆدێرنەکان لەلایەن هێندێک بنەماڵەوە دامەزراوە کە بە ئەسڵ

فیۆداڵ بوون، ئەوانەی کە پەیمانیان لەگەڵ خاکدا بەستبوو و بە شێوەیەک لە شێوەکان بوون بە هەوێن و گرسێنەری. سنووری فەرەنسای ١٧٨٩ هیچ شتێکی سروشتی و پێویست نەبوو. ئەو ناوچە بەربڵاوەی کە کاپێتیجی لکاندیانە هێڵە بەرتەسکەکەی ڕێکەوتنی ڤێردوونەوە، بە دڵنیاییەوە یەک لە دەسکەوتە تایبەتییەکانیان بوو.

ئەو سەردەمەی پەیوەست کردنەکان جێبەجێ کران، کەس بۆچوونی ئەوتۆی لە سەر سنووری سروشتی، مافی نەتەوەیی و ئیرادەی هەرێمەکان نەبوو. یەکێتی نێوان ئینگلیز، ئیرلەند و سکۆتلەند کاری زنجیرە پاشایەتی بوو. یەکێتی ئیتالیا ماوەیەکی زۆری خایاند، چونکوو هیچکام لە گەلێک بنەماڵەی دەسەڵاتدار – پێش لە سەدەی نۆزدە – نەیانتوانی ببنە ناوەندی یەکێتییەکە. سەیر ئەوەیە کە ئەو دوورگە تەماوییەی ساردینیا، کە بە حاڵە حاڵ ئیتالیایی بوو، بووە ناوەندی پاشایەتی.
هولەند کە بە ڕاپەڕینێکی بوێرانە خۆی دامەزراند، سەرەڕای ئەمەش پێوەندییەکی ژن و ژنخوازی لەگەڵ بنەماڵەی ئۆرانج (نێوی زنجیرەپاشایەتییەکە) پێک هێنا، کە ئەگەر بێتوو ڕۆژێک ئەو پێوەندییە بپچڕێ، یەکیەتی ئەوان تووشی مەترسی جیددی دەبێ.
دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەم یاسایە گشتگیر نییە، سویس و وڵاتە یەکگرتووکانی ئەمریکا لە ڕێڕەوەی زەماندا و بەرەبەرە پێک هاتن و هیچ زنجیرەپاشایەتییەک نەبوو بە هەوێنی یەکخستنیان.

باسی ئەو کێشانە ناکەم لە مەڕ فەرەنساوە: بۆ خۆدان لە وەها باسێک پێویستە ڕەمزی داهاتوو بزانرێ. تەنها دەتوانین بێژین کە پاشایەتییە مەزنەکەی فەرەنسا، ئەوەندە ڕیشەی نەتەوەیی بوو کە دوای هەرس هێنانیشی نەتەوە توانی بە تەنیا خۆی ڕابگرێت. ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە سەدەی چواردەهەم هەموو شتێکی گۆڕیبوو. دوای سەدەکانی دارمان مرۆڤ گەڕابۆوە بۆ ڕۆحی کۆن، بۆ ڕێزگرتن لە خۆی و هزری مافی مرۆڤ.
وشەی «وڵات» و «شارۆمەند» مانای خۆیان پێ درایەوە و بەم شێوەیە بوێرانەترین نەشتەرگەری مێژوویان ئەنجامدا: نەشتەرگەرییەک کە دەکرێ لەگەڵ ئەوەدا هەڵیسەنگێنین کە لە فیزیۆلۆژیدا هەوڵدانە بۆ ژیاندنەوەی کەسێک بە ناسنامەی پێشوویەوە، جەستەیەک کە دڵ و مێشکی لێ دابڕا بوو.
کەوابوو پێویستە قبووڵی بکەین کە نەتەوەیەک دەتوانێ بوونی هەبێ بە بێ بنەمای زنجیرە پاشایەتی و تەنانەت ئەو نەتەوانەی لە ڕێگەی زنجیرەی پاشایەتییەکانەوە پێک هاتبوون، دەتوانن لێک جوودا ببنەوە، بێ ئەوەی لە نێو بچن. ئەو بنەما کۆنەی کە تەنیا بایەخی بە مافی شازادەکان دەدا، ئیتر بۆ ئەوە نابێ داکۆکی لێ بکرێ؛ لە سەرەوی مافی زنجیرەیی بنەماڵە، بنەمای نەتەوەیی هەیە. لەسەر کامە پێوەر ئەم مافە نەتەوەییە بنیاد دەنرێ؟ کامانە ئەو هێماگەلە کە ناسنامەکەی دیاری دەکەن؟ لە کامە ڕاستی حاشاهەڵنەگرەوە هەلی هێنجین؟
١. لە ڕەگەزەوە؟ هێندێک بە دڵنیاییەوە داکۆکی

لێ دەکەن. دابەشبوونی دەستکرد؟ بەرهەمی فیۆدالیسم؟ لە ژن و ژنخوازیی زنجیرەی بنەماڵەکان و لە کۆنگرە دیپلۆماسییەکانەوە؟ ئەمانە هەتاهەتایی نین. ڕەگەزی خەڵک، ئەمەیە ئەوەی بنەمای دادوەری و پایەی یاسایی لە سەر دادەمەزرێنن؟ بۆ نموونە بنەماڵەی ژێرمەنییەکان بە پێی ئەم تیۆرییەی خەریکم شرۆڤەی دەکەم، مافی ئەوەی هەیە ئەندامە پرژ و بڵاوەکانی ژێرمەن وەربگرێتەوە، تەنانەت کاتێکیش ئەندامێک داوای پەیوەست بوون بە ئەوان نەکات. مافی ژێرمەنیسم بە سەر هەرێمیکەوە گەلێک بەهێزترە لە مافی بە سەر دانیشتووانییەوە. بەم شێوە جۆرێک لە مافی پێش شارستانیەت دروست دەبێ وەک مافێک کە لەلایەن خوداوە دەدرا بە شاکان و شا نوێنەری خودا بوو لەسەر زەوی.

لەم حاڵەدا بنەمای نەتەوەیی لەگەڵ بنەمای ڕەگەزی جێگەی دەگۆڕدرێ، ئەمە هەڵەیەکی کوشندەیە و لەهەرکوێ بیهەوێت ببێتە باڵادەست، شارستانییەتی ئەوروپا تووشی دارمان دەکات. چەندە بنەمای نەتەوە دروست و ڕەوایە، هەر بەو رادەیە مافی پێش شارستانییەتی ڕەگەز نارەوایە و تەژییە لە مەترسی بۆ سەر پێشکەوتنی ڕاستەقینە. دەکرێ بێژین کە توخم و ڕەگەز لە شار و خێڵە سەرەتاییەکاندا لە پلەی یەکەمدا دادەنران. خێڵ و شارە سەرەتاییەکان داری لق و پۆ کوتاوی بنەماڵەکان بوون. هەموو شارۆمەندانی سپارت و ئاتێن دوور و نزیک خزم بوون.

ئەم بۆچوونە لە بابەتی بەنی ئێسرائیلیشەوە دروستە: خێڵە عەرەبەکان ئێستاش هەروان، با واز لە سپارت و ئاتێن و بەنی ئێسرائیل بێنین و ئاورێک لە ئیمپراتۆری ڕۆم بدەینەوە؛ هەلومەرج بە تەواوی جیاوازە. لە سەرەتاوە بە زۆر سەپێنراوە و دواتریش لە بەر بەرژەوەندی ڕاگیراوە، ئەم قەڵاچنە زەبەلاحە لە شار و هەرێم بە تایبەتمەندی تەواو جیاوازەوە زەبرێکی گورچکبرە لە بیری ڕەگەزی. هەروەها مەسیحییەتیش بە تایبەتمەندی گشتگیر و موتڵەقگەرایەوە بە شێوەیەکی تۆکمەتر لە



سەر هەمان ڕێباز دەڕوا. ئەو هاوپەیمانییەکی چڕوپڕی لەگەڵ ئیمپراتۆری ڕۆما دەبەستێ. لە ژێر کاریگەری یەکگرتنی ئیمپراتۆر و کلیسادا وەک دوو هێزی سەرەکی و مەیدانی، بنەمای ئێتنیکی بۆ سەدان ساڵ لە کاروباری بەڕێوەبەرایەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی دوور دەخەرێتەوە.

هێرشی بەربەرەکان بە ڕواڵەتە قیزونەکەیەوە، هەنگاوێکی تر بوو بەم ئاقارەدا. دابەش بوونی قەڵەمڕەوی بەربەرەکان فری بەسەر ڕەگەزەوە نەبوو؛ داگیرکەران بە زۆر و ویستی خۆیان یاسا و ڕێسایان بۆ دیاری کردبوون. ئەوەی ئەوان ئاوڕیان لێ نەدایەوە، ڕەگەزی گەلی باڵادەست بوو.

کارلو مانیۆ، هەمان سیاسەتی ڕۆمییەکانی پەیڕەو کرد، یەکەم ئیمپراتۆری کە پێکهاتەی ڕەگەزیی هەر زۆر فرەچەشنە: ڕێکەوتنی ڤێردوون بێ هیچ دوو دڵییەک دوو هێڵی سەرەکی لە باکوورەوە بەرەو باشوور دیاری کرد و ئەوەی لە بەرچاویان نەگرت، ڕەگەزی دانیشتووانێ بوو کە هێڵەکان لێکیانی دادەبڕی. گۆڕینی سنوورەکان، دواتر بێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەک بە ناسنامەی ڕەگەزی بکات، دەست پێ دەکا و لە دەورانی سەدەکانی نێوەڕاستدا سەقامگیردەبێ. ئەو هێڵە سیاسییەی کاپێنجی دیاری کرد و بوو بە هۆی ئەوە کە ناوچەکانی گالیای کۆن لەژێر ناوی فەرەنسادا یەک بخات، مەبەستی ئێتنیکی لە پشت نەبوو.

دلفیناتو، برێزێ، پروڤێنزا و فرانکا کونتێ، هیچ بیرەوەرییەکیان لە ڕەگ و ڕیشەی هاوبەشی خۆیان نەبوو. هەرچەشنە ئاشنایەتییەک لە سەر ناسنامەی گالیا لە سەدەی دووهەمەوە بزر ببوو، تەنها توێژینەوەی وردی مێژووی نوێ پەردەی لە سەر ڕەگ و ڕیشەی ئەوان هەڵدایەوە.

کەوابوو لە پێکهاتنی نەتەوەی مۆدێرندا بابەتی ڕەگەز دەورێکی نەبووە. فەرەنسا چێلتیک، ببێریک و ژێرمەنە، ئاڵمان ژێرمەن، چێلتیک و سلاڤە. توێژینەوە لە کێشەی ڕەگەز لە ئیتالیا هەر زۆر ئاڵۆزە. گالی، ئترووسکو، پێلاسجی و یونانی (بێ ئەوەی باسی زۆر توخمی دیکە بکەین) تێکەڵاوییەکە، ڕێک بێژی چێشتی میجێورە و بۆ پۆلێنبەندی نابێ. دوورگەکانی بریتانیا بە گشتی تێکەڵاوێکن لە خوێنی چێلتیک و خوێنی ژێرمەنی بە جۆرێک کە شرۆڤەکردنی پێوەندنیان پڕ دژوارە. هەقیقەت ئەوەیە کە ڕەگەزی پەتی، بوونی نییە و هەر هەوڵدانێک بۆ ئەوەی شیکاریی ئێتنۆگرافی بکرێ بە بنەمای سیاسی، مانای ئەوەیە تارمایی بکرێتە بنەما. وڵاتە هەرە ڕەسەنەکان - ئینگلیز، فەرەنسا و ئیتالیا - ئەو وڵاتانەن کە بە زۆری خوێنیان ئاوێتەیە. هەروەها پێداگریی لە سەر ئەوەی ئاڵمان تاقانەیە و بەدەرە لەم لێکدانەوە، جگە لە خەیاڵی خاو و تەم و مژاوی هیچی دیکە نییە. هەموو باشوور گالیک بوون. هەموو بەشی ڕۆژهەڵات هەر لە ڕووباری ئێلباوە سلاڤن. ئەو بەشەی پێیان وایە پاک و پەتین، ئایا بەڕاستی وان؟

لە هەمبەر ئەم کێشەیە پێویستە ڕوانگەیەکی ڕوونمان هەبێت، خۆ بە دوور بگرین لە هەر

چەشنە خراپ تێگەیشتنێک. مشتومڕ لە مەڕ ڕەگەز باسێکی بێبڕانەوەیە، وشەی ڕەگەز لە لایەن توێژەرانی مێژووی زمان و مرۆڤناس و زانایانی فیزیولۆژییەوە بە دوو مانای تەواو جیاوازەوە بە کار براوە. بۆ مرۆڤناسان وشەی ڕەگەز هەر هەمان مانا دەدات کە لە گیانەوەرناسیدا هەیە؛ ڕەگەز نیشانەی پێوەندی و خزمایەتی خوێنییە، بەڵام توێژینەوە لە زمان و مێژوو ناڕواتەوە سەر ئاقار و ئامانجی فیزیولۆژی. پەیڤگەلی براکیچێفالو(سەرپان) و دولیکوچێفالو (سەرباریک) نە لە مێژوودا بەرچاو دەکەون، نە لە زمانناسیدا. لەنێو کۆمەڵەمرۆڤی داهێنەری زمان و تەکووزی ئارياييدا براکیچێفالو و دولیکوچێفالو هەبوون. ئەم بۆچوونە لەمەڕ جڤاتە سەرەتاییەکان کە زمان و داب و نەریتی سامیش دەئافرێنن، دروستە. بە وتەیەکی دیکە ڕیشەی گیانەوەرناسی مرۆڤ زۆر کۆنترە لە ڕیشەی زمان، کولتوور و شارستانییەت. کۆمەڵە سەرەتاییە ئارییەکان، سامی و توورانییەکان لە بواری فیزیولۆژییەوە هیچ شتێکی هاوبەشیان نەبوو.

ئەو بە کۆما بوونانە ڕووداوی مێژووین کە لە سەردەمی دیارکراودا ڕوویان داوە، پازدە یان بیست هەزار ساڵ پێش، کاتێک ڕیشەی گیانەوەرناسی جۆری مرۆڤ لە تاریکی نووتەکدا ون بوو. ئەوەی کە لە ڕوانگەی زمانناسی و مێژووییەوە بە نێوی ڕەگەزی ژێرمەن دەناسرێ، بە دڵنیاییەوە بنەماڵەیەکی جیاوازە لەنێو گۆنەی مرۆڤدا، بەڵام ئەوە بەو مانایە نییە کە لە بواری مرۆڤناسییەوە بنەماڵەیەکی تایبەت بێت. جگە لە چەند سەدەیەکی زۆر کەم پێش مەسیح نەبێ، دیاردەیەک بە نێوی ژێرمەن لە مێژوودا بەدی ناکرێ. لەگەڵ ئاوەزدا ناگونجێ کە ژێرمەنەکان لەو سەردەمە دیاریکراوەدا لە کوت و پڕا لە دڵی زەوییەوە هاتبووبێتنە دەرەوە، پێش ئەمەش ئەوان لە گەڵ سلاڤەکان بەشێک بوون لەو کۆما گەورەی سەکاکییەکان، بە بێ هێچ جیاوازییەکی تایبەت. بە دڵنیاییەوە ئینگلیزییەک «گۆنە»ی تایبەتییە لە بەراورد لەگەڵ باقی مرۆڤایەتی. ئەو گۆنەی ئەمڕۆ بە گشتی بە نێوی ئانگلۆساکسون دەناسرێ، نە بریتانی سەردەمی جولیو چێزارن (قەیسەر)، نە ئانگلوساکسونی هێنجست [Hengist]، نە دانمارکی کوونت، نە نورماندی جوولیامی جەهانگرە، ئەو بەرهەمی هەموو ئەمانەیە. فەرەنساییەک نە گالیە، نە فرانکی، نە بوورگاردوو. ئەو کوورەی شای فەرەنسا سەرکردایەتی دەکرد، مرۆڤێکی پێ گەیاند کە لە یەک توو و لە یەک قوڕ نەپێژراوە. دانیشووانی جرێسێی [Jersey] گوویرنێسێی [Guernesey] لەگەڵ خەڵکی نورمانی کە دەکەونە بنارەکانی نزیک بەوانەوە لە بواری ڕەگ و ڕیشەوە هیچ جیاوازییەکیان نییە. لە سەدەی یازدەهەمدا چاوی هەرە تیژ بچووکترین جیاوازی لە نیوان خەڵکی ئەمبەر و ئەوبەری ڕووبارەکەدا بەدی نەدەکرد.

نامۆیی و جودایی ئەوە دوو گەلە لەیەکتر ڕەوتێکی نزیک بە حەوت سەد ساڵی تێ پەڕاند، یانی ئەوان لە ڕێڕەوی زەماندا لێک دابڕان و ڕیشەی هاوبەشی خۆیان فەرامۆش کرد.





کەوابوو، لە بواری مێژووناسییەوە ڕەگەز بەو جۆرەی ئێمە ڕاڤەی دەکەین، دیاردەیەکی گرساوە و نەگۆڕ نییە. گرینگی توێژینەوە لە ڕەگەز بۆ مێژووناسێک کە دەپەرژێتە سەر مێژووی مرۆڤایەتی، لەوەدایە کە ئەو دانەری سیاسەت نییە. ئەوەی نەخشەی ئەوروپای داڕشتووە، ئەوەی لە بەر چاوی نەگرتووە، ڕەگەز بووە. یەکەم نەتەوەکانی ئەوروپا هەموویان لە تۆو و خوێنی جیاجیان، کە تێک ئاڵاون. کەوابوو لە سەرەتاوە توخمی ڕەگەز گرینگی خۆی بوو، بەڵام لە ڕێڕەوی زەمەندا بەردەوام لە گرینگی کەم دەبێتەوە و مێژووی مرۆڤ بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە گیانەوەرناسی جیا دەبێتەوە. مرۆڤ مشک و مارموور نییە، تاکوو ڕەگەز هەموو شتێکی دیاری بکات. کەس مافی ئەوەی نییە، بکەوێتە پشکنینی جیهان و کەپۆڵی خەڵک ئەندازە بگرێت، دواتر یەخەی بگرێت و پێی بێژێ: تۆ هاوخوێنی ئێمەی، تۆ لە خودی خۆمانی!

لە سەرووەی هێماکانی مرۆڤناسییەوە، ئاوەز، داد، ڕاستی و جوانی هەیە، کە لای هەمووان یەک شتن. ڕێک هەر بۆیە سیاسەت لە سەر بنەمای ئێتنوگرافی مەترسیدار و وەبەرهێنەری بارگرژییە. ئەمرۆ ئێوە بە دژی ئەوانیتر کەڵکی لێ وەردەگرن، بەیانی ئەوانیتر بە دژی ئێوە کەڵکی لێ وەردەگرنەوە. ئەو ئەڵمانییانە کە ئاڵای ئێتنۆگرافیان زۆر بەرز کردۆتەوە، لەوە دڵنیان کە ڕۆژێک نابینن کە سلاڤەکان لە ناوی دێهاتەکانی ساکسونیا و لووساوزیا بکۆڵنەوە و بە شوێن ویلتێس (wiltzes) و

ئۆبۆتریتی (Obotriti) دا بگەڕێن و داوای خوێنی باوباپیرانیان بکەن کە لە لایەن ئۆتونیەکانەوە[Ottoni] بە کۆمەڵ فرۆشران یان بە کۆمەڵ کوژران؟ بۆ هەموو لایەک باشە کە هونەری فەرامۆش کردن فێر بن.
ئێتنۆگرافی بۆ من بایەخی خۆی هەیە؛ زانستێک کە جارجار دەتوانێ گرینگ بێت، بەڵام من دەخوازم ئازاد بێت و ئارەزوومە تێکەڵ بە کاروباری سیاسی نەکرێ. لە بواری ئێتنۆگرافیدا وەک هەموو بوارەکانی دیکەی توێژینەوە، سیستێمەکان دەگۆڕدرێن؛ سرووشتی پێشکەوتن وایە. ئەگەر بێتوو سنووری دەوڵەتان بکەوێتە شوێن شەپۆڵ و خروشی زانست، وڵاتپارێزی (پاتریوتیسم) بە باسێکی پاردوکسالەوە دەبەسترێ و بەو ئاکامە دەگەین بە وڵاتپارێز بڵێین؛ ئێوە بە هەڵەدا دەچن خوێنی خۆتان بۆ وەها ئارمانجێک دەڕێژن؛ باوەڕتان کردووە چێلیکن؛ نەخێر ئێوە ژێرمەنن، سەر لە نوێ دوای ده ساڵی تر دێن و دەبێژن: نەخێر ئێوە سلاڤن. بۆ ئەوەی غەدر لە زانست نەکرێ، با گەردنی ئازاد بکەین و ناچاری نەکەین لە سەر کێشەگەلێک دادوەری بکات کە زۆر بەرژەوەندی تر دەوری تێدا دەگێڕن.
ئەگەر قەرار بێت دیپلوماسی لەم بوارەدا بەڵگەمان پێشکەش بکات، لەوە دڵنیا بن زۆرجار هاودەستی ئاشکرای ئەو لەگەڵ سووچ و تاواندا تووشی سەرسووڕمانتان دەکات.

٢. پێویستە هەر بەو شێوەی ڕەگەزمان ڕاڤە کرد، ڕاڤەی زمانیش بکەین. زمان هێز نییە بۆ یەکێتی بەڵکوو دەکرێ پاڵنەر بێت؛ وڵاتە یەکگرتووکانی ئەمریکا و ئینگلیس بە یەک زمان قسە دەکەن، ئەمریکای لاتین و ئیسپانیاش بە هەمان شێوە، بەڵام نەتەوەیەک نین. سویس کە ئەوندە ڕێک و پێکە، بە پێچەوانەوە، لە سەر سازیانی چەند لایەن بنیاد نراوە کە بە چوار زمان دەپەیڤن. لە مرۆڤدا شتێک هەیە کە لە سەرەوەی زمانەوەیە: ئەوە ویست و ئیرادەیە. ئیرادە و ویستی سویسرییەکان ئەوەیە سەرەڕای چەندزمانی پێکەوە بژین، وەها سازانێک هەر یەکجار گرینگترە لەو یەکێتییەی لە ژێر زەبر و زۆردا ڕاگیراوە. هەرمانێک کە فەرەنسا شانازی پێوە دەکات ئەوەیە کە هەرگیز پەنای بەر زۆر نەبردووە بۆ گەیشتن بە زمانێکی یەکگرتوو. بۆچی ناکرێ خاوەنی یەک هەست و هزر بین و بە زمانی جیاواز یەک شتمان خۆش بوێت؟ تاوێک پێش ئێستا باسی ئەوەمان کرد، ئەگەر بێتوو ئێتنۆگرافی بکرێتە بنەمانی سیاسەتی نێودەوڵەتی، چەند پڕمەترسی و پڕخەسارە. لە بابەتی زمانیشەوە ڕێک هەر وایە. با هەرواترین مەوادی ئازاد بۆ ئەم توێژینەوە جێ بایەخانە فەراهەم بکەین؛ ئاڵۆزیان نەکەین و پشت گوێیان نەخەین، چونکە هەردووکیان بە یەک ڕادە زیانبەخشن. ئەوە کە لە بواری سیاسییەوە گرینگی زۆر بە زمان دەدرێ، هۆکاری ئەوەیە وەک یەک لە هێماکانی ڕەگەز چاوی لێ دەکرێ. درۆی لەوە ئاشکراتر نییە. پڕووس، کە لە ئێستادا هەموو بە ئەڵمانی قسە دەکەن، چەند سەدە پێش زمانیان سلاڤ بوو؛ ناوچەی گاڵیس ئینگلیزی قسە دەکەن،

گالیا و ئیسپانیا بە زاراوە سەرەتاییەکانی ئالبالونیا قسەیان دەکرد؛ میسر بە عەرەبی قسە دەکەن، نموونەی وا بێ ئەژمارە. تەنانەت لە سەردەمە هەر دوورەکانیشدا ناسنامەی زمان و ناسنامەی ڕەگەز یەک شت نەبوون. با ئاماژە بە خێڵەکانی پێش ـ ئاریایی یان پێش ـ سامی بکەین؛ کۆیلە هەبوون بە زمانی خاوەنەکانیان قسەیان دەکرد، بەڵام ئەوکات ڕەگەزی کۆیلە و کۆیلەدار یەک نەبوو. باشە دووپات بکرێتەوە؛ کە ئەو دابەشبوونە لەنێو زمانی هیندوئەوروپایی، سامی و زمانەکانی تریش کە بە وردی و وردبینی تایبەتی زماناسییەوە توێژنەوەیان لە سەر کراوە، لە گەڵ دابەشبوونی مرۆڤناسیدا ناتەبان. زمانەکان لە ڕێڕەوی مێژوودا فۆرمیان گرتووە و بە قازانجی خوێنی ئاخێوەرانی بەڵگەیەکی وەها بە دەستەوە نادەن. لە هەرحاڵدا، ناکرێ بە دژی ئازادی مرۆڤ ببێت، کاتێک باسی ئەوەیە کۆمەڵێک مرۆڤ بڕیار بدەن لە خۆش و ناخۆشیدا پێکەوە ببن.
زێدەڕۆیی کردن و خۆ لە بازنەی یەک کولتووردا بە نێو کولتووری نەتەوەیی قەتیس کردن، لە ڕاستیدا خۆ سنووردار کردن و خۆ ئەسیر کردنە لە بازنەیەکی داخراودا، خۆ دوورگرتنە لە هەڵمژینی هەوای پاکی پێدەشتی بەرینی مرۆڤایەتی، بۆ خۆ قەتیس کردن لە نێو تاقمی وڵاتپارێزییدا. هیچ شتێک ئەوەندە زیانبەخش نییە بۆ ڕۆح، هیچ شتێک ئەوەندە پێش بە گەشی شارستانیەت ناگرێ. نابێ ئەم بنەما بنەڕەتییە پشت گوێ بخرێ کە مرۆڤ پێش ئەوەی بخرێتە بازنەی ئەم یان ئەو زمانەوە، پێش ئەوەی بخرێتە نێوە بازنەی ئەم یان ئەوە ڕەگەزەوە و بەشداری ئەم یان ئەو کولتوور ببێت، ئەو بوونەوەرێکی خاوەن ئەخلاق و ئاوەزە. پێش لە کولتووری فەرەنسایی، ئاڵمانی و ئیتالی، کولتووری مرۆڤایەتی هەیە.
بنواڕن بۆ گەورە پیاوانی سەردەمی سەر لە نوێ ژیانەوە (ڕێنێساس): نە فەرەنسایی، نە ئیتالیایی، نە ئەڵمانی بوون. لە مامەڵە کردن لەگەڵ کۆندا نهێنی ڕاستەقینەی پەروەردەی گیانی مرۆڤایەتییان دۆزیبۆوە و گیان و جەستەیان بۆ تەرخان کردبوو و چ خزمەتی هێژایان بە مرۆڤایەتی کرد.

٣. تەنانەت ئاینیش ناتوانێ زەمینەیەکی گونجاو پێشکەش بکات بۆ بنیادنانی ناسیونالیزمی مۆدێرن.
لە سەرەتاوە، ئایین و گرووپە کۆمەڵایەتییەکان زۆر بە توندی لێک ئاڵابوون. گرووپە کۆمەڵایەتییەکان هەراو بۆوەی بنەماڵە بوون. ئاین و داب و نەریتەکان تایبەت بە بنەماڵەکان بوون. ئاینی ئاتێن نەریتی تایبەتی خودی ئاتێن بوو و ئەفسانەی چۆنییەتی دامەزرانی، هی یاسا و ڕێوڕەسمەکانی کە هێمای هیچ دین و ئاینێکی گرسا و چەق بەستوو نەبوون. ئەو ئاینە، بە مانای پڕاوپڕی وشە، ئاینی دەوڵەت بوو. ئەوەی جێبەجێ کردنی ڕەت بکردبایەتەوە، ئاتێنییەکی ڕاستەقینە نەبوو. ڕێوڕەسمی ئاکرۆپۆلی هێمای کەسایەتی بوو. سوێند خواردن بە سەر گڵکۆی ئاگراولو بە

مانای سوێند خواردن بوو بۆ مردن لەپێناو وڵاتدا. وەها ئاینێک هاوسەنگی ڕێوڕەسمی ئاڵایە لەم سەردەمەدا. خۆ بواردن لە بەشداری لەو ڕێوڕەسمانە هاوسەنگی نەچوونە ژێر باری ئەرکی سەروازییە لەم سەردەمەدا. مانای ئەوە بوو بێژی ئەمن ئاتێنی نیم. ئەمجا ئاشکرایە کە ئەو ڕێوڕەسمانە بۆ کەسێک کە خەڵکی ئاتێن نەبوو، هیچ مانایەکی نەبوو.  هەر بۆیە هیچ چالاکییەکی پروسێلیتیسم* بۆ زەخت خستنە سەر بیانییەکان بۆ قەبووڵ کردنی نەبوو، کۆیلەکانی ئاتێن بەڕێوەیان نەدەبرد.

ئەمە لە بابەت هێندێک لە کۆمارە بچووکەکانی سەدەکانی نێوەڕاستیشەوە دروستە. ئەوەی سوێندی بە سەری سانت مارکۆ نەخواردبا، شارۆمەندێکی باشی ڤینێزی نەبوو. ئەوەی سانت ئاندێرای لە سەرەوەی هەموو سانتەکانی بەهەشتەوە دانەنابا، شارۆمەندیکی باشی ئامالفیتانو نەبوو. لەو کۆمەڵگە بچووکانەدا کە دواتر حکوومەتی ملەوڕ و سەرەڕۆ بوونە حوکمڕانیان، ئەم دیاردەیە بەها و نرخی وەهای نەما.

ئەوەی لە سپارت و ئاتێندا ڕاستی بوو، لە بەرەبەیانی هێرشەکانی ئەسکەندەر و دامەزراندی پاشایەتییەکەی ئیتر ڕاستی نەبوو و ئەگەر ترووسکەیەکی مابوو، لە سەردەمی ئیمپراتۆری ڕۆمدا بە یەکجاری گوژایەوە. کوشتوبڕ و پشکنینێک کە ئانتیوخوس ئێفانیو [Antico Epifanio] کردی بۆ ئەوەی ڕێوڕەسمی جوڤی ئۆلیمپیا [Giove Olimpio] لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا بسەپێنێ و ئەوەی ئیمپراتۆری ڕۆم کردی بە مەبەستی سەقامگیر کردنی ئاینێکی دەوڵەتی، هەڵە بوون. لە سەردەمی ئەمڕۆدا بارودۆخەکە بە تەواوی ڕوونە، ئیتر ئەو کۆما بەرینەی بە کۆ باوەڕیان بە یەک ئایین بوو، نەماون، ئەمێستا هەرکەسە بە شێوەی خۆی باوەڕ و دین هەڵدەبژێرێ. ئێستا ئیتر ئایینی دەوڵەتی نییە؛ دەکرێ فەرەنسایی، ئینگلیسی و ئاڵمانی بیت و کاتولیک، پروتێستان و یەهوودی بیت و یان هەر ئایینێکی دیکە بۆ خۆت هەڵبژێری. ئێستا ئیتر دین بووەتە کێشەی تاکەکان و پێوەندی بە وشیاری تاکەکەسییەوە هەیە. بە سەر چوو زەمانێک کە دەوڵەتانی ڕۆژاوا بە سەر کاتۆلیک و پرۆتێستاندا دابەش ببوون.

ئایین کە پەنجا ساڵ پێش یەک لە توخمە بنەڕەتییەکانی دامەزرانی بەلژیکا بوو، ئێستا ئیتر شتێکی تاکەکەسییە و گرینگی خۆی لە ناخی تاکەکاندا دەپارێزێ و دەکرێ بێژین ئاوەزێک کە سنووری نێوان گەلان دیاری دەکات، بە تەواوی لەژێر کاریگەری ئاین هاتۆتە دەرەوە.

٤. بە دڵنیاییەوە بەرژەوەندی هاوبەش خاڵێکی زۆر گرینگە لە پێوەندی نێوان مرۆڤەکاندا. بەڵام ئایا ئەمە مانای وایە کە دەکرێ تەنها لە سەر بەرژەوەندی هاوبەش وڵات دابمەزرێ؟ بەرژەوەندی هاوبەش دەبێتە هۆی پەیمانی

بازرگانی. لە ناسنامەی نەتەوەییدا هەست و سۆز هەیە؛ زولڤێرێین (Zollverrein)* وڵاتێک نییە (هەڵگرتنی خاڵی گومرگی نێوان هەرێمەکانی ئاڵمان، یانی ئابووری هاوبەش ناتوانێ ببێتە هەوێنی نەتەوەیی)؛ نەتەوە یەک پەیکەرەی زیندووە بە گیان و جەستەوە.

٥. جوگرافیا، ئەوەی سنوورە سرووشتییەکانی لەسەر دادەمەزرێ، بێگومان دەوری گرینگ دەگێڕێ لە دابەشبوونی وڵاتەکاندا. جوگرافیا ڕاستییەکی مێژوویی بنەڕەتییە. ڕووبارەکان ڕێنوێنی ڕەگەزەکان بوون و کێوەکان لەمپەر، یەکەمیان ڕێ خۆشکەر بووە ژ بۆ بزاڤە مێژووییەکان و دووهەمیان ڕێگر. بەهەرحاڵ، وەک چۆن هێندێک لایەن باوەڕیان وایە، ئایا دەکرێ داکۆکی لە هزرێک بکرێ کە پێی وایە سنووری وڵاتێک لە سەر نەخشەی جوگرافی دیاری کراوە و وڵاتێکی تر مافی ئەوەی هەیە هەرکات بیهەوێت بۆ گەیشتن بە کێو و یان ڕووبارێک دەوری هەڵمووتێ بداتەوە، بۆی هەیە چەندی پێ خۆش بوو، سنوورەکەی هەراو بکاتەوە؟ ئامۆژەی لەمە ملەوڕانەتر و مەرگبارتر نییە. بە وەها هزرێک هەموو توند و تیژییەک پاساو دەکرێ. ئەرێ ئەوە کێو و ڕووبارەکانن کە سنوورە سرووشتیەکان دیاری دەکەن؟ گومان لەوەدا نییە کە کێوەکان دەبنە هۆی دابڕان لە کاتێکدا چۆمەکان هۆکاریی پێکەوە ژیانن. بەڵام ئەوە بەو مانا نییە کە هەموو کێوەکان دەبنە هۆی لەت و پەت بوونی وڵاتان. چۆن بزانین کام کێو هۆی دابڕان و کامە نییە؟ لە بیاڕیتز تا ترونیا، هیچ ڕووبارێک کە پشکی هەبێ بەسەر ئەوانی تردا، وەک دیاریکەری سنوور، بەدی ناکرێ، ئەگەر مێژوو گەرەکێ بووایە لوریا، سێننا، موسا، ئێلبا و ئۆدێر – وەک ڕاین – دەوری ئەو سنوورە سروشتییەیان دەبوو کە هۆکاری پێشێل کردنی زۆر مافی بنەڕەتی بوون کە خواستی بەشەرە. باسی مافی ستراتێژی دەکرێ، لە ڕاستیدا هیچ شتێک موتڵەق نییە و ئاشکرایە کە بە پێی پێویستییەکان هاوێری زۆر لە بەرچاو دەگیرێ، بەڵام ئەو هاوێرانە نابێ لە ئاستی خۆی زیاتر بڕوا، چونکە کاتێک لە حەدی خۆی چووە دەرەوە هەموو پەنا دەبەنە بەر هێزی چەکدار و دەبێتە هۆی شەڕێکی بێ بڕانەوە. کەوابوو دەبێ بێژین خاکیش (وەکوو ڕەگەز) نەتەوەیەک دروست ناکات. خاک ژێرخانە، گۆڕەپانی ململانێ وکار، کە مرۆڤ گیانی وەبەر دێنێ. لە بنیادنانی ئەوەی گەلی پێ دەگوترێ، مرۆڤ لە سەرەوەی هەموو شتێکەوەیە، گشت شتە مادییەکان بەس نین. نەتەوە بنەماییەکی ڕۆحی و بەرهەمی سەخلەتی و پێچاوپێچی قووڵی مێژووییە، ئەو گرووپێک نییە کە خاک هۆکاریی پێکەوە ژیانیان بێت؛ ئەو بنەماڵەییەکی ڕۆحییە.

دوای ڕاڤە کردنی هەموو ئەو خاڵانە کە بەس نین بۆ ئافراندنی بنەمایەکی ڕۆحی، یانی زمان، بەرژەوندیی ئابووریی، ئایین، جوگرافیا و سپا، با بزانین پێویستییەکانی تر کامانەن؟

٣

ناسیۆنێک؛ یەک دانە گیانە، بنەمایەکی ڕۆحییە. ئافرێنەری ئەم گیان و بنەما ڕۆحییە دوو شتن کە لە ڕاستیدا دەبن بە یەک، یەک لەمانە لە ئەوێستاییەوە و ئەوی تر ئەمێستایی، یەک لەمانە خاوەندارییەتی میراتێکی دەوڵەمەندە لە بیرەوەری هاوبەش؛ ئەوی تر هاودڵی و سۆز و هەستە بۆ پێکەوە ژیان لە ئەمێستادا، ئارەزووی پێکەوە ژیان و ئیرادەیە بۆ بەردەوام بوون لەسەر میراتی هاوبەش و هەوڵدان بۆ دەوڵەمەندتر کردنی. بەڕێزان؛ نەتەوە شتێک نییە مرۆڤ یەکڕۆژە پێی بگات، ناسیۆنێک هەر وەک کەسایەتییەک، مەنزڵگەیەکە کە بۆ پێگەیشتنی مێژووییەکی پڕ هەوراز و نشێوی بڕیوە، لەپێناویدا قوربانی دراوە و ئارق ڕژاوە. هەمووان کۆکن لەسەر ڕێزگرتن لە داب و نەریتی باو و باپیران، ئێمە میراتگەری باو و باپیرانمانین، مێژووییەکی پڕ لە سەروەری و گیانبازی (ئاشکرایە، مەبەست ڕاستییەکانە). شانازی و سەروەری هاوبەشی مێژوویی و ئیرادەی هاوبەشی ئەمێستایی، شاکاری مەزنت لە ئەوێستادا ئەنجام دابێ، هەوڵی بە سەرئەنجام گەیاندنی کاری گەورە لە ئەمێستا و داهاتوودا بدەیت؛ هزری نەتەوەیی لەسەر وەها سامانێک پێ دەگات، مەرجی بنەڕەتی بۆ ئەوەی یەک ناسیۆن و نەتەوە ببیت، ئەمانەن. بەدروستی ڕێز لە گیانبازی و چەرمەسەری هاوبەشانیان دەگرن و ماڵ و سامانێک، کە ڕەنجی لە پێناودا کێشراوە و بە میراتی بەجێ دەهێڵن، خۆشیان دەوێ.

دروشمی سپارتەکان – «ئێمە ئەوانەیین کە ئێوە بوون، ئەوە دەبین کە ئێوە هەن»، ئەم دروشمە لە ساکاری خۆیدا کورتکراوی سروودی هەموو وڵاتانێکە. میراتێک لە شانازی و ئەفسووس بۆ ڕابردوو کە ئەمێستا هەموو لە سەری کۆکن، دەیکەن بە نەخشەڕێ بۆ داهاتوو و هەوڵەکان دەخرێنە گەڕ بۆ بەدی هاتنیان؛ پێکەوە ڕەنجیان کێشاوە، شادی و گۆڤەندیان گێڕاوە، خاوەنی ئاوات و ئارەزووی هاوبەشن، ئەمانەن، کە سەرەڕای جیاوازی زمان و ڕەگەز خەڵکی پێ پەروەردە دەکرێن و گرینگترن لە کەوشەنی هاوبەش و ئەو خاڵە سنوورییانە کە لەپێناو بنەما ستراتێژییەکاندا دیاری کراون.

لە سەرەوە گوتمان ڕەنج و ئازاری هاوبەشت چێشتبێ، ڕاستی ئەوەیە ڕەنج و چەرمەسەری هاوبەش لە شادی و گۆڤەند زۆرتر دەبنە هۆی یەکێتی. شین و ماتەمی نەتەوەیی لە سەرکەوتنی نەتەوەیی گرینگترن، چونکە دەبنە هۆی دروست کردنی ئەرک و فرمان و وزەی هاوبەش بۆ داهاتوو. کەوابوو نەتەوە هاوپشتی و هاوخەمییەکی تەواوە، پێکهاتوو لە هەست و سۆز، لەخۆبردوویی و گیانبازیگەلێک کە کراوە و ئامادەیی بۆ ئەوەی لە داهاتووشدا ئەنجام بدرێ. ڕابردوو دەکەن بە چرا و ڕووناکی ڕێگای داهاتوو. سازیان و هاودڵی و ئارەزووی پێکەوە ژیان لە داهاتوودا ڕوون و بێ خەوش خۆ دەنوێنێ.

نەتەوە پەیمانە، واتە هەموو ڕۆژێ پەیمان نوێ کردنەوە، ڕێک هەر وەکوو تاکێک کە هەموو بەیانییەک هەڵدەستێ و لەگەڵ ژیان پەیمان نوێ دەکاتەوە و خۆی تەیار دەکا بۆ بەردەوام

بوون لە ژیان و پێشخستنی.
بەڵێ، دەزانم ئەمە کەمتر متافیزیکە لە مافی خوایی و نەرم و نیانترە لەو مافەی جەماوەر چاوەڕوانیەتی. بە پێی بڕیار و فەرمانی ئەم ئامۆژانەی پێشکەشم کردن، وڵاتێک مافی ئەوەی نییە هەروەک چۆن شایەک ئەو مافەی نییە بە هەرێم یان ناوچەیەک بێژێ تۆ بەشێکی لە ئێمە و پێویستە پەیوەست بیتەوە بە ئێمەوە. لە ڕوانگەی ئەزەوە هەرێمێک یانی دانیشتووانی ئەوێ، ئەگەر بڕیار بێ کەسێک لە سەر چارەنووسی هەرێمێک پرس ورای پێ بکرێ؛ ئەوە دانیشتووانی ئەو هەرێمەن. بەرژەوەندی نەتەوەیەک بە هیچ شێوەیەک لەوەدا نییە کە بە پێچەوانەی ئیرادە و ئارەزووی خۆی بە وڵاتێکی ترەوە پەیوەست بکرێ. ئەوەی پێویستە پرسی بێ بکرێ، خەڵکە و تەنها پێوەرەی ڕەوا و یاسایی لەم بارەوە ڕای نەتەوەیە. سیاسەتمان لە هەموو دەرهەست و ئەبستراکتێکی متافیزیک و ئایینی پاڵاوت. چی دەمێنێتەوە؟ مرۆڤ دەمێنێتەوە لەگەڵ پێویستی و ئاوات و ئارەزووەکانی.
ڕەنگە بڵێن ئاکامی وەها ئامۆژەییەک لەت و پەت بوونی سیستێم و ئورگانیزاسیوونە کۆنەکانە، کە دەبن بە کاڵای ئیرادەیەکی لێڵ و ناڕوون. ئاشکرایە کە لە وەها باسێکدا نابێ هیچ بنەمایەک لە ئاستی خۆی زیاتر پاڵی پێوە بندرێ.
بە شێوەی گشتی چەسپاندی وەها هزرێک کاتێک واقعێیە کە بە تەواوی جێ بە جێ بکرێ. ئیرادەی مرۆڤ نەگۆڕ نییە، نەگۆڕ بە سەرزەوییەوە چییە؟ نەتەوەکان شتێکی هەرمانی نین، ئەوان ئەنگووتن، کەوابوو ئاواش دەبن. دوور نییە کونفدراسیونی ئەورووپا جێگەیان بگرێتەوە. بەڵام ئەوە یاسای سەدەیەک نییە کە تێیدا دەژین. بوونی وڵات و نەتەوە بۆ ئەمێستا شتێکی باش و تەنانەت دەکرێ بێژین پێویستن. ئەگەر دونیا یەک یاسا و تەنها کوێخایەکی هەبێ، دنیایەکی ئازاد نییە، بوونی نەتەوە و دەوڵەتەکان ئەو ئازادییە دەستەبەر دەکات. نەتەوەکان بە ئاوات و ئارەزووی جیاواز و تەنانەت زۆر جاریش دژ بەیەکەوە خزمەتی مەزن بە شارستانییەت دەکەن؛ هەر نەتەوەیەک هەڵگری نوتێکە بۆ کۆنسێرت و گۆڤەندی مرۆڤایەتی، ئەو حەقیقەتەی ئێستا پێی گەیشتووین. ئەوانەی لەم گۆڤەندە دابڕاون، خاڵی لاوازی خۆیان هەیە.
زۆر جار بە خۆم دەڵێم کەسێک کە خاوەنی ئەو کەم وکوڕییانە بێت کە لە نەتەوەدا وەک بەها ئەژمار دەکرێن؛ یانێ لەخۆبایی، بەخیل، خۆپەرست و شەڕئاژۆ بێ، بە بچووکترین بیانوو پەنا بباتە بەر چەک و شمشێر؛ لەگەڵ کەسێ وەها ژیان نامومکین دەبێ. بەڵام هەموو ئەم وەردە ناکۆکییانە لەنێو پێکەوە بوونێکی کۆکدا دەتوێنەوە.
مرۆڤایەتی هەژار، چەند ڕەنجت چێشتووە! چەند تاقیکردنەوەی دیکە هێشتا چاوەڕێتن! گیانی ژیر بتوانێت ڕێبەریت بکات و بتپارێزێ لەو هەموو مەترسییە کە لە سەر ڕێگەتدا چێنراوە!
چکاوەی باس: بەڕێزان، مرۆڤ نە کۆیلەی

ڕەگەز، زمان، نە ئایینەکەیەتی، نە بزاقی ڕووبار، نە ئاقاری کێوەکان. کۆمای گەورەی مرۆڤ بە گیانی تەندرووست و دڵی فراوان، ویژدانێکی ئەخلاقی دەئافرێنن کە پێی دەگوترێ نەتەوە، تا کاتێک ئەم ویژدانە ئەخلاقییە هێزی تایبەتی لە ڕێی داخوازی لە تاکەکان بۆ لە خۆ بردوویی و گیانبازی لە پێناو جڤاتدا تاقی دەکاتەوە، نەتەوە بوونی ڕەوایە و مافی بوونی هەیە.

هەر کات گومان لە سەر سنوورەکان دروست دەبێ، ئەوە دەبێ پرس بە خەڵکی دەڤەر بکرێ. ئەوە مافی ئەوانە ڕای خۆیان لە سەر وەها کێشەیەک بدەن. بێگومان سیاسەتکاران پێیان وایە هەرگیز بە هەڵەدا ناچن و لەو هەڵەیەدا دەژین و لەخۆبایی بە ئامۆژەکانیان بە بەزییەوە دەڕواننە پێشنیارە هەژارانەکەی ئێمەمانان، دەبێژن: ڕای خەڵک بپرسین! حاشا لە ساویلکەیی! بە تایبەت ئەمە یەک لە نەگبەتییەکانی هزری فەرەنساییە، کە کەڵک وەرگرتن لە دیپلۆماسی و شەڕی پێ باشترە لە ئامرازی ئەوەندە ساکار و ئاسان.

بەڕێزان ڕاوستین، بێڵین با حوکمڕانی لە خۆباییگەل بڕوا و بەسەر بچێ، خۆڕاگر بین لە هەمبەر سووکایەتی ئەوانەی پێیان وایە خاوەنی هێزن.

ڕەنگە دوای هەوڵێکی زۆر و بێ بەهرە، بگەڕێینەوە بۆ ڕێگەچارەی هەژارانە و بە ئەزموون سەلماوێک کە ئێمە پێشنیارمان کردووە. هێندێک جار بۆ ئەوەی داهاتوو مافی خۆتت بداتێ، پێویستە بزانی دژەباو بیت.

---

*proselitismo ، پروسێلیتیسم، چالاکی لەپیناو ئەوە کە خەڵکی نوێ ئاینێک قبووڵ بکەن

* Zollverein، یەکیەتی گومرکی ئەڵمان کە لە ساڵی ١٨٣٤ لەنێوان ٣٨ دەوڵەتی کونفێدراسیۆنی ئاڵماندا لە سەردەمی شۆڕشی پیشەسازییدا دامەزرا، بۆ ئەوە یارمەتیدەری دۆخی بازرگانی بێت و ململانێی ناوخۆیی کەم بکاتەوە.

# بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی

چارلز تیلی
**لە عەرەبییەوە: حمە رشید**

لێگەڕێن با لە حاڵەتێکی قورس و زەحمەتەوە دەست پێبکەین: هیندستان، لە کاتی سەربەخۆبوونییەوە لە ساڵی ١٩٤٧، لە بواری "دەسەڵات - دیموکراسی"دا لە شوێنێک لە شوێنەکانی نێو چوارگۆشەی "توانای بەهێز - دیموکراسیی باڵا" پێگەیەکی داگیر کردووە. هەریەک لە توانا و دیموکراسی لە هیندستان لە ماوەی شەست ساڵی ڕابردوودا ڕووبەڕووی هەڵبەزودابەز بوونەتەوە، بەڵام سیستمی حوکمی نیشتمانی بە شێوەیەکی گشتی زیاتر لە سیستمی حوکمی - با بڵێین- کەنەدا دەچێت، تا ئەوەی لە جامایکا یا کازاخستان بچێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم وڵاتە کە ژمارەی دانیشتووانەکەی دەگاتە ١,١ ملیار کەس، چەند ئاریشەیەک لە بەردەم هەر شیکردنەوەیەکی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی قووت دەکاتەوە، ئەم ئاریشانەش لە شێوازی زۆر جیاوازدا دەردەکەون:

• سەربباری هەژارییەکی زۆر و نەبوونی یەکسانی لە نێوان دانیشتووانەکەیدا، کەچی ئابووریی

هیندستان لە نێو ئابوورییە گەورەکانی جیهاندا کێشی پەیدا کردووە.

• هەر ٢٥ ویلایەتەکەی (زۆریان لە زۆربەی وڵاتە ئەوروپییەکان گەورەتر و پڕدانیشتووانترن) لە ڕووی سامان و بوونیادی کۆمەڵایەتی و دەنگ و ڕەنگی سیاسییەوە، جیاوازیی زۆریان لەگەڵ یەکتریدا هەیە.

• سیاسەتی گشتی زۆر بە ڕێکوپێکی ئەو دیمەنە زیندووانە دەخاتەڕوو، کە مۆرکی ئایینییان هەیە.

• تێکۆشەرە ئایینییەکانی هیندۆس و موسڵمان و سیخ و ئەوانی دی، هەموویان جارناجارێک لە یەکتری تیرۆر دەکەن و پیرۆزییەکانی یەکتر پێشێل دەکەن.

• لەسەر سنووری وڵات (بۆ نموونە لە کشمیر و باکووری ڕۆژهەڵات دابەشبوونی ئەتنی هەیە) گروپە چەکدارەکان پەلاماری فەرمانبەرانی حکومەت دەدەن و پیاوانی ئاسایشی دەوڵەتیش زۆر بە توندی پەنا بۆ سەرکوتکردنیان دەبەن.

• لە هەرێمەکانی ناوەڕاستی وڵات، پارتیزانە ماوییەکان (بە نەکزالییەکان -Naxalites- ناسراون)، ئەوانەی قەوارەی سیاسییان لە چارەکی کەرتە سیاسییەکانی هیند هەیە، چەکی کوشندە بۆ لەناوبردنی هێزەکانی حکومەت و ئەو گوندانە بەکار دەهێنن، کە هاوکارییان ناکەن.

• لە کاتی سەربەخۆبوونەوە، ساڵی ١٩٤٧، سیستمی حوکمڕانی لە نێوان حاڵەتی نائاسایی و پشوودان پاکوتێ دەکات.

• لە کۆتاییدا، هیندستان تا ڕادەیەکی زۆر سیستمێکی دیموکراسیی پڕدانیشتووانی لە جیهاندا هەیە.

چۆن بتوانین مانایەک بۆ هەریەک لەو ئاڵۆزییانە هەڵگۆزین؟

ئەو ڕاپۆرتە هەواڵانەی لە هیندستانەوە بەدەست گەیشتوون، وێنای ئەوە دەکەن کە زۆر جار وڵات بە هۆی تایەفەکانییەوە، لەسەر لێواری شکست لەنگەری گرتووە. بەڵام هەمیشە بەو شێوەیە نەبووە. هیندستانی سەربەخۆ، ساڵی ١٩٤٧، دوای جیابوونەوەی پاکستان، بە زۆرینەی دانیشتووانی هیندۆسییەوە، هاتە بوون (نزیکەی ٨٢٪ی هیندییەکانی ئەمڕۆ هیندۆس و ١٢٪ی موسڵمانن). سیستمی نوێ بە سەرۆکایەتیی جەواهرلال نەهرۆ (Jawaharlal Nehru) دەزگایەکی لە فەرمانبەرانی ڕێکوپێک و سوپایەکی کارای لە بریتانییەکان، کۆڵۆنیالیستەکانی پێشوو، بۆ مایەوە، کە لە بوونیاتنانی دەسەڵاتێکی بەهێز پشتی پێدەبەستن، لەپاڵ ئەوەی نەهرۆ، بە پێچەوانەی پاکستانی دراوسێی، سەربازەکانی لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتێکی کارای مەدەنی هێشتەوە. سەرکردەکانی حوکمڕانیی نەهرۆ زۆرینەیان سەر بە هەمان گروپی دەستەبژێر بوون، کە شێوازی بریتانییان (سیاسەتی بزێوی و پشێوی - Contentious politics) بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی لە بریتانیا (زۆربەی نەوەکانی چینە باڵاکان خوێندنیان لە بریتانیا تەواو کردبوو) بەکار هێنا.

هیندستان سیستمێکی فیدراڵی لە پۆست کۆڵۆنیالەوە بۆ مایەوە، کە هەمەڕەنگییە

مەزنەکەی نێوان هەرێمەکانی لەخۆ دەگرت، ئەو هەرێمانەی کە بریتانیا لە کاتی داگیرکردنی وڵاتدا وەک یەکەی لاوەکی لە حکومەت کۆی کردبونەوە. لە بارودۆخی ئاساییدا ویلایەتەکان پارێزگارییان لە دەسەڵاتە فراوان و بەرپرسیارێتییەکەی خۆیان دەکرد، سەرباری ئەوەی حکومەتی ناوەند و دادگاکان توانییان لە حاڵەتی نائاساییدا سنوور بۆ ئەو دەسەڵاتانە دابنێن. تۆڕەکانی خاوەنکار و لایەنگرە بەرفراوانەکانیان (بە شێوەیەکی بەرچاو لە چوارچێوەی کەرتە جیاوازەکانی کۆنگرەی حیزبی کۆنگرێس دا) ڕۆڵیان لە گرێدانی زۆربەی هەرێمەکانی هێندستان بە ناوەندەوە هەبوو.

لەگەڵ ئەم هەموو ڕێکخستنە ناوەندییەدا ئەندامانی فەرمانبەرە لەخۆباییەکان لە کاریگەریی سیاسی و دارایی پارێزراو نەبوون، بەڵکو بە پێچەوانەوە، سیستمی حوکمڕانیی هیند بە گواستنەوە زۆرەکانی لە پێگەیەکەوە بۆ پێگەیەکی دی گوشاری سیاسی و دارایی لەگەڵ هەر گواستنەوەیەکدا لەگەڵ خۆیدا دەهێنا. بۆیە سیاسییەکان لە هەرێمەکاندا لە نێوان بەخشینی پۆستی باش بە خەڵکانی خۆیان و وەرگرتنی پارە وەک پاداشتێک لەسەر دامەزراندنیان لە شوێنە گرنگەکان پارسەنگیان ڕادەگرت، لە هەمان کاتیشدا خودی فەرمانبەرانی دەوڵەت مانۆڕیان دەکرد لە پێناو وەرگرتنی ئەو پێگانەی لە بایەخیانی زیاد دەکرد و وای لێدەکردن دەستیاری خزمەکانیان بکەن یا دەرفەتی لەبارتریان بۆ بەدەستهێنانی پارە بەردەست بکات (Zwart ١٩٩٤).

چاودێری ڤاڵبوو مایرۆن ڤاینەر (Myron Weiner) لەم ناوکۆیەدا بە نائومێدییەوە کۆمێنتی خۆی دەنووسێت:

"لەبەر کرانەوەی هیند لە هەڵبژاردنی حوکمڕانەکانی لە چینی دەستەبژێر، بەراوردکردنی ئەنجومەنی سۆڤێتە باڵا دێرینەکان و دەستەبژێری سیاسی و ئیدارەی هیندی لە جێی خۆیدا نییە. پێویستە تێبینیی ئەوەش بکەین کە ئەوانەی لە هیند پیادەی دەسەڵاتی سیاسی دەکەن، سەر بە چینی باڵای خاوەن ئەدگارن، بەوەی خانوو بە خۆڕایی دەدرێ بە فەرمانبەرانی حکومەت، قەرز بە سوودێکی کەم وەردەگرن، منداڵەکانیان لە خوێندنگە تایبەتەکانی حکومەت وەردەگیرێن و لە فڕۆکە و شەمەندەفەرەکان کورسیی پلەیەکیان پێدەدرێ، ماشینی حکومەت بۆ مەبەستی کەسێتی بەکار دەهێنن و چاودێریی پزیشکی بە مایەدانی حکومەتە و مووچەیەکی باشی خانەنشینییان بۆ دەبڕێتەوە. لەو دەمەی دەوڵەت ڕێکخستنی ئابووریی گرتۆتە ئەستۆ، فەرمانبەران کۆنترۆڵی دەرماڵەیان بە دراوی بیانی کردووە، لەگەڵ دابەشکردنی کەلوپەلی هەمەڕەنگ، بە ئاسن و خەڵوزی بەردین و کاغەز و چیمەنتۆشەوە، بڕیاریان لەسەر هاوردەکردنی مەوادە ڕێگەپێدراوەکان و ڕێگەپێنەدراوەکان لە دەرەوەی وڵات دەرکردووە. دەزگایەکی ئاڵۆز بۆ سەرپەرشتیکردنی دامەزراندن هەیە، کە سیاسییە هەڵبژێردراوەکان و فەرمانبەرە حکومییەکان بەشداریی لە ئیدارەدانیدا دەکەن،

هەر ئەو دەزگایەش بڕیار دەدا کارەبا بە کێ بدرێ و بیری ئیرتوازی بۆ کێ لێبدرێ و خوێندنگە و کۆلێج لە هەرێمەکان و وێستگەی شەمەندەفەر و وەرشەی ئاودێری و ڕێگەوبان و هێڵی پاص و بنکەی تەندروستی و وەزیفەی حکومیی بە ویستی ئەو دەزگایە دەبێت، هەروەها دەنگدەران پەنا بۆ سیاسییەکان دەبەن کاتێک پێویستیان بەوە هەبێت نەخۆشییەکانیان بۆ چارەسەر داخڵی نەخۆشخانە بکرێن یا منداڵەکانیان لە کۆلێجەکانی ناوچەکە وەربگیرێن" (Weiner. ٢٠٠١: ٢٠٤ ).

سیاسەتمەدارانی هیند بە "سیستمی سایەدار – بەرکار (Patron – Client System)"ی کلاسیکی کاریان دەکرد (بۆ زانیاری لەسەر دارەتەی هاوشێوە، بڕوانە بۆ نموونە، Auyero ٢٠٠١, Bax ١٩٧٦, Bearman ١٩٩٣, Kettering ١٩٩٣; Montgomery ١٩٩٨; Schmidt [et. Al.] ١٩٧٧, Willerton ١٩٩٢). لە ڕاستیدا ڕەنگە ئەمە گەورەترین سیستمی "سایەدار – بەرکار" بێت لە جیهاندا، بۆیە ڕاجیڤ گاندی "Rajiv" Gandhi ساڵی ١٩٨٥ بە زمانی ڕەخنەئامێزانە دەڵێت: "بە ملیۆنان لە کرێکارە ئاساییەکانی حیزبی کۆنگرێس کەمئەندامن، چونکە دەڵاڵەکانی دەسەڵات و دەستڕۆیشتووەکان سواری کۆڵیان بوون، ئەوانەی وەزیفە بە ناسیاوی دەبەخشن تا بزووتنەوەی میلی بۆ کەمایەتییەکی بەرژەوەندیخوازی فیوداڵ بگۆڕن، گەندەڵی بە تەنها ڕێگەپێدراو نییە، بەڵکو بووە بە سیمایەکی دیاری سەرکردایەتیکردن" (Kohli ١٩٩٠: ٥)، ئەمە لەپاڵ ئەوەی بوونیادی فیدراڵیزمی سیستمی حوکمڕانی لەسەر ئاستی هەموو ویلایەتەکاندا، لە ئاڵۆزیی تۆڕەکانی خاترخواهیی هاوشێوە[1] زیاد کرد و زۆرجاریش سیاسەتی ویلایەت لەسەر ڕکابەریی سیاسەتی ناوەندی بەرجەستە دەبوو، نەهرۆ سەرۆکایەتیی سیستمێکی ئاڵۆزی زۆر هاوسەنگی دەکرد.

سەرباری ئەوەی جەنگ لەسەر کشمیر لەگەڵ پاکستان زۆر بە خێرایی هەڵگیرسا و سەرباری تیرۆرکردنی سەرکردەی ڕزگاری موهانداس گاندی (Mohandas Gandhi) لە لایەن پەڕگیرێکی هیندۆسییەوە (هەردووکیان لە ساڵی ١٩٤٨ ڕوویان دا)، نەهرۆ توانیی تا کۆچی دوایی لە ساڵی ١٩٦٤، ڕێگە لە ململانێی تایفی بگرێ. پاڵپشت بە پێگەی نەهرۆ و دەستە سیاسییە بەرجەستەکەی لە حیزبی کۆنگرێس، ئەندیرا گاندی (Indira Gandhi)ی کچی لە ساڵی ١٩٦٦ بووە سەرەک وەزیران.

بوونی ئەندیرا لە لوتکەی دەسەڵاتدا بۆ ماوەی نزیکەی دوو دەیە لەگەڵ (تا ڕادەیەک بووە هۆی) وەرچەرخانێکی قووڵ لە سیمای سیاسەتی گشتیی هیندستاندا هاوزەمان بوو. لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی نەهرۆدا لایەنگرانی ڕەگەزی و ئایینی بواریان نەبوو مانۆڕ بکەن، بەڵام لایەنگرانی نەدار و چەوساوەکان دەسەڵاتێکی

---

1 - - James Manor, “Towel over Armpit’: Small – Time Political “Fixers” in India’s States,” in: Ashutosh Varshney, ed., India and the Politics of Developing Countires: Essays in Memory of Myron Weiner (New Delhi: Sage Publications, 2004).

گەورەیان هەبوو. ڕاکا ڕای (Raka Ray) و ماری فاینسۆد کاتزیانستاین (Mary Fainsod Katzeinstein) قسە دەکەن لەسەر:

"وەرچەرخانی دراماتیکی لە پێکەوەژیان لە دەسپێکی ماوەی دوای سەربەخۆبوون لە نێوان ویلایەتەکان و حیزب و بزووتنەوەی ئۆرگانیزەکراو دەربارەی سۆسیال دیموکراتی چەپڕەو و داوەشانی لە ناوەڕاستی شەستەکان تا هەشتاکانی سەدەی بیستەم و بالاکردنی وێنەکەی بەرامبەری لە دامەزراوە ڕاستڕەوەکان کە تێیدا بەستنەوەی زنجیرەیەک ویلایەت و حیزب و بزووتنەوە لەسەر ناسیۆنالیزمی ئایینی و بازاڕ٢ ڕێکدەخرا".

هەر بە تەنها پێواری نەهرۆی دامەزرێنەری دەوڵەت لەسەر شانۆی سیاسەت، کاریگەریی هەبوو لە دەرکەوتنی فۆرمی نوێی پەرتەوازەبوون و تێکۆشان لە هیندستاندا و ئەو تۆڕەی دەوڵەت و حیزبی کۆنگرێس و زنجیرەی "سایەدار - بەرکار"ی پێکەوە گرتبوو، خەریک بوو لە ناوەوە هەلاهەلا دەبوو٣. بە دڵنیاییەوە بەختی ئەندێرا گاندی و خێزانەکەی (یا لێهاتوویی) لە باوکی کەمتر بوو لە کۆنترۆڵکردنی دیندار و نەژادپەرستەکاندا، ساڵی ١٩٨٤ ئەندێرا لە لایەن پاسەوانە تایبەتەکەیەوە، کە لە تایفەی سیخ بوو، تیرۆر کرا. ساڵی ١٩٩١یش، خۆکوژێک، کە لە بەرژەوەندیی ناسیۆنالیستەکانی تامیل لە سیریلانکا کاری دەکرد، بۆمبێکی بە ڕاجیف گاندی کوڕ و جێگیرەوەی تەقاندەوە. تا ئەو کاتەش حیزبی کۆنگرێس کە نەهرۆ دامەزرێنەری بوو، بەسەر ئەنجومەنی نیشتمانیدا باڵادەست بوو، ڕۆڵی کەناڵێکی میانگیری سەرەکیی لە لای حکومەت وازی دەکرد. لە دوای مردنی ڕاجیف گاندی، هاوسەرەکەی سۆنیا، لەدایکبووی ئیتاڵیا، بە نابەدڵییەوە، بووە سەرۆکی حیزبی کۆنگرێسی لێکترازاو و حیزبیش تووشی هەڵەنگوت بوو. دوای ئەوەش لە هەڵبژاردنی پارلەمان لە ساڵی ١٩٩٦دا حیزبی نەتەوەیی هیندۆسی بەهاراتیا جاناتا (ح ب ج) وەک قەوارەیەک بە تەنها زۆرترین دەنگەکانی بەدەست هێنا. ساڵی ١٩٩٨ یەکەم دەرفەت لە بەردەم (ح ب ج) ڕەخسا بۆ ئەوەی لە هەڵبژاردنێکی گشتیی نوێدا کۆنترۆڵی حکومەت بکات.

ڕۆژنامەی سەنگینی نیویۆرک تایمز (New York Times)، لە ماوەی پاڵاوتندا کۆمێنتی لەسەر هەڵبژاردنەکان داوە:

"ئاکامی هەڵبژاردنەکان هەرچۆنێک بێت، ئەوا ژمارەیەکی کەم لە هیندییەکان بەگومانن لەوەی خاڵی وەرچەرخانی مێژوویی بێت.

2 - Ray, Raka and Mary Fainsod Katzenstein (2005): "Introduction: In the Beginning, There Was the Nehruvian State," in Raka Ray and Mary Fainsod Katzenstein, eds., Social Movements in India. Poverty, Power, and Politics. Lanham, MD: Rowman and Littlefield.

3 - - Kohli, Atul, "Centralization and Powerlessness: India's Democracy in a Comparative Perspective," in Joel S. Migdal, Atul Kohli, and Vivienne Shue, eds., State Power and Social Forces: Domination and Transformation in the Third World. (Cambridge: Cambridge University Press, 1994).

ئەمەش وای لێدەکات کاریگەریی خاتوو گاندی زۆر لەسەر بێ و هەڵبژاردن و جەژنی پەنجا ساڵەی سەربەخۆیی هیندستانیش بەڕێکەوت بووە. ڕەخنەگران دەڵێن ئەگەر ناسیۆنالیستە هیندۆسەکان براوە بن، ئەوا مانای ڕەتکردنەوەی زۆرێک لەو کارانەیە، کە هیند لە ماوەی نیو سەدەی ڕابردوودا وەک میلەتێکی ئازاد، لە پێناویدا تێکۆشانی بۆ کردووە .

ئاکامی هەڵبژاردنەکان سەرکەوتنی (ح ب ج) بوو، کە حکومەتی هاوپەیمانیی دروست کرد و نەیتوانی ڕاستەوخۆ ئاوڕ لە پیادەکردنی بەرنامەی نەتەوەگەرایی هیندۆسی بداتەوە، بەڵکو خۆی سەرقاڵ کرد، کە چۆن دەست بخاتە سەر حەشارگەکانی دەسەڵات. هیند لەسەر ڕێگەی خۆی بەردەوام بوو، وڵات لە ساتەوەختی سەربەخۆبوونییەوە، ڕەنگە لە پێش سەربەخۆبوونیشەوە بە ماوەیەکی زۆر، بەدەست هیچ شکستییەکەوە نەیناڵاندووە، بە شێوازێک لە شێوازەکان، دەوڵەتی هیند و هاوڵاتیانی لەسەر ڕاوێژکردن پاشەکشێیان نەکردووە، کە بە شێوەیەکی ڕێژەیی فراوان و یەکسان و پارێزراو و دەربەستبوونی بەرابەر بووە، تەنانەت دیاردەی پەرۆشی و وروژێنەری نەتەوایەتیی هیندی و شەڕی ناوخۆ لە کشمیر، بزووتنەوەکانی یاخیبوون کە هەمیشە بوونیان هەبووە، هیندستانی لەسەر دیموکراسیی تا ڕادەیەک بەتوانا لەق نەکردووە، بۆیە دەتوانین بڵێین هیند یا سەرسوڕهێنەرە یا مەتەڵێکی شپرزەکارە.

ئەو هیندەی تووشی سەرسوڕمانمان دەکات، لەم بەشەدا چوار مەسەلە دەوروژێنێت:

یەکەم: بەو هەموو ئاڵۆزییە زۆرەی قەوارەکەیەوە چۆن دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی پێگەی سیستەمەکەی لە نێو زنجیرەیەکی پێکەوەگرێدراو لە پرۆسەی گواستنەوە لە نادیموکراسییەوە بۆ دیموکراسی دیاری بکەین؟

دووەم: تەنانەت گەر بتوانین پێگەی سیستەمەکەی لە ساڵی ١٩٤٧ەوە لە شوێنێک لە شوێنەکانی چوارگۆشەی دیموکراسیی ئاستبەرز جێگیر بکەین، چۆن دەتوانین قۆناغەکانی هیند لە بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی دیاری بکەین؟




وێنەی ٣-١: هەڵسەنگاندنەکانی خانەی ئازادی بۆ هیندستان، ١٩٧٢ - ٢٠٠٦
٢٠٠٦ کۆ کراوەتەوە.

سێیەم: دوای ئەوەی بەم کارە هەڵدەسین، ئایا دەتوانین لەنێو ئەم دوو شێوازە دژبەیەکە ئەوە ئاشکرا بکەین، کە چ ڕێکخستنێک، لەسەر ئاستی ئەزموونی، نەک لە هیندستان، بەڵکو لە هەموو جیهاندا هەیە.
چوارەم: دوای ئەوەی ڕێکخستن لە بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی دیاری دەکەین، چۆن دەتوانین ڕاڤەی بکەین؟
ئەم بەشە لە پێناوی ڕوونکردنەوەی ئەوەی پێویستە ڕاڤە بکرێ، پرسیاری چوارەم (ڕاڤەکردن) پشتگوێ دەخات، بە مانای تەواوی وشەش، جەخت لەسەر پرۆسەی ئەندازەگیری دەکاتەوە: نەک بە ژمارەی ورد، وەک دیاریکردنی وردی پێگەی حاڵەتی زنجیرە پێکەوەگرێدراوەکان، کە دەرئەنجامی شیتەڵکارییەکەی بۆ دەگەڕێتەوە. ئەم دیاریکردنە توانامان پێبدەبەخشێت پشکنینی گۆڕانکارییەکان لە چوارچێوەی ئەو دارەت و هەمەڕەنگییە بکەین، کە لە نێوانیاندا ڕوو دەدات. خانەی ئازادیش دەتوانێت دەستیاریمان بکات لە دەستنیشانکردنی ئەوەی پێویستە ڕاڤە بکرێ. وێنەی ٣-١، لە ساڵی ١٩٧٢ەوە لە ڕووی مافە سیاسی و ئازادییە مەدەنییەکانەوە، بەدواداچوون بۆ هەنگاوەکانی هیندستان دەکات، خانەی ئازادی ئەو ساڵە جێگیر دەکات، کە هەڵسەنگاندنە ساڵانەکەی لە زنجیرەیەک هەنگاوی سەرەکیدا لەسەر شانۆ دەست پێکرد:
١٩٧٥: ئەندێرا گاندی، پاش تومەتبارکردنی بە ساختەکارییەکی گەورە لە هەڵبژاردنەکان لە بەرژەوەندیی حیزبی کۆنگرێس، باری نائاسایی ڕاگەیاند و حکومەت نزیکەی هەزار ڕکابەری سیاسی زیندانیی کرد و بەرنامەی منداڵبوونی دیاری کرد. خانەی ئازادی مافە سیاسییەکانی لە هیند بە پلە ٢ هەڵسەنگاند، بەڵام سەبارەت بە ئازادییە مەدەنییەکان، لە ٣ وە بۆ ٥ (زۆرنزم) ی دابەزاندن.
١٩٧٧: لەگەڵ سوککردنێکی هەندەکی لە یاساکانی باری نائاسایی، ئەندێرا گاندی بانگەوازی بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی گشتی کرد، بەڵام حیزبی کۆنگرێس زۆر بە خراپی دۆڕا و خۆیشی وازی لە دەسەڵات هێنا. خانەی ئازادی لە هەڵسەنگاندنەکانی سەبارەت بە مافە سیاسییەکان هیندستانی بۆ ژمارەیەکی زۆر پێوانەیی، کە ٢ بوو، بەرز کردەوە و هەمان ژمارەشی دا بە ئازادییە مەدەنییەکان.
١٩٨٠: دوای کەرتبوونی حیزبی کۆنگرێس، ئەندێرا گاندی گەڕایەوە بۆ دەسەڵات و سەرکردایەتیی بەشە جیابووەکەی حیزبی کرد، خانەی ئازادی هەڵسەنگاندنی هیندی لەمەر ئازادییە مەدەنییەکان بۆ پلەی ٣ دابەزاند.
١٩٩٢: دوای تیرۆرکردنی ڕاجیف گاندی لە لایەن تێکۆشەرێکی سەر بە تامیل (١٩٩١) و وێرانکردنە گەورە و وروژێنەرەکەی مزگەوتێکی ئایۆدیا (Ayodhya) لە ویلایەتی ئەوتار برادچ و پاشهاتەکانی لە کردەوە توندوتیژەکانی نێوان هیندۆس و موسڵمانەکان لە تەواوی هیندستاندا (١٩٩٢)، پاشان بەرزبوونەوەی کارڕاییە سەرکوتکارییەکان لە لایەن حکومەتەوە، خانەی ئازادی هەڵسەنگاندنەکانی لەسەر هیندستان بۆ ٣ لە مافە سیاسییەکان و ٤ لە ئازادییە

مەدەنییەکان دابەزاند. ئەم هەنگاوە سیستمی هیندی لە گروپی ئەو ڕژێمانەی ئازادیی بەردەست دەکەن بۆ گروپی مامناوەندی گۆڕی، کە ئازادیی بە هەندەکی بەردەست دەکات.

١٩٩٤: پێکدادانەکانی نێوان هیندۆس و موسڵمانەکان (بەتایبەتی لە بۆمبای و کەلکەتا لە ساڵی ١٩٩٣) کوژرانی ١٢٠٠ کەسی لێکەوتەوە، خانەی ئازادی هەڵسەنگاندنەکانی لەمەڕ مافە سیاسیەکان لە هیند بۆ ژمارە ٤ی پێوانەیی دابەزاند، ئەوەیش کۆتاییەکی مەزنی گلۆربوونەوەیە، کە بریتییە لە ٤،٤.

١٩٩٧: دۆڕاندنی ترسناکی حیزبی کۆنگرێس لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٩٦دا سیاسەتی گشتیی وڵاتی بەرەو ئاژاوە و پشێوی برد. خانەی ئازادی هەڵسەنگاندنەکانی بۆ مافە سیاسییەکان لە هیند بۆ ٢ بەرز کردەوە (ئەوەیش دەرئەنجامێکە لە ماوەی ئەو ساڵانەدا زۆر دووبارە دەبووەوە)، بەڵام ئازادییە مەدەنییەکان لە ٤ مایەوە.

١٩٩٩: دوای ئەوەی (ح ب ج) حکومەتە هاوپەیمانییەکەی لە ساڵی ١٩٩٨ پێکهێنا، ئەم حیزبە ڕێگەی بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی چەکی ئەتۆمی دا، کە بە شێوەیەکی بەرفراوان ئیدانە کرا و لەگەڵ پاکستان بەرەو ئاشتی ڕۆیشت و هەڵمەتی لە دژی موسڵمانەکان سوک کرد و دەنووسێت "چاودێران ئەو هەڵبژاردنانەی پارلەمان بەرز دەنرخێنن، کە ساڵانی ١٩٩٦ و ١٩٩٨ و ١٩٩٩ ئەنجام دران، بەوەی دادپەروەرانەترینیانە لە مێژووی هیندستاندا". خانەی ئازادی هیند بۆ هەڵسەنگاندنە براوەکەی دەگێڕێتەوە، کە بریتییە لە ٢ و ٣ و سیستمی حوکمڕانی بۆ گروپی سیستمی ئازاد دەگێڕێتەوە. لە دوای ئەوەشەوە هیند تا ساڵی ٢٠٠٦ لەو پێگەیە مایەوە.

شێوەی گوڵ لە وێنەی ٣-١ ئەوە ئاشکرا دەکات کە هەڵسەنگاندنەکانی خانەی ئازادی بۆ مافە سیاسی و ئازادییە مەدەنییەکان (بە ئاسایی پێکەوە دەبەسترێنەوە و دەگۆڕێن) بە زەرورەت هاوقەدەم ناڕۆن هەروەکو لە هارمۆنیی سەربازییدا هەیە. بەپێی ئاژانسی هەڵسەنگاندنی دیموکراسی (Democracy Rating Agency)، لە هیندستان مافە سیاسییەکان لە ماوەی ململانێی هیندۆس- ئیسلام لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەمدا زۆر دابەزی، بەڵام لەوانی دی زۆر بە بەربڵاوی مایەوە. سەبارەت بە ئازادییە مەدەنییەکانیش (ڕەهەندێکی ئاسۆییە لە هێڵکارییەکە)، لە کارڕاییە سەرکوتکارییەکانی ئەندێرا گاندییەوە لە کاتی ڕاگەیاندنی باری نائاسایی لە ساڵی ١٩٧٥، ڕووبەڕووی هەڵبەزودابەزی زۆر بووەوە. بەپێی هەڵسەنگاندنەکانی خانەی ئازادی، تەنانەت دیاریکردنی کۆنترۆڵی نێوەندی لە دوای وێرانەی ئایۆدیا لە ساڵی ١٩٩٢ و پاشهاتەکانی لە خوێنڕشتن، نەگەیشتە ئاستی سەرکوتکردنەکەی ساڵی ١٩٧٥.

ئایا دەتوانین ڕیزبەندیی مێژوویی لە هیندستان لە ساڵی ١٩٧٢ەوە بۆ ڕیفۆرمی بەرپاکردن و لەباربردنی دیموکراسی وەربگێڕین؟ بۆ ئەوەی ئەو کارە ئەنجام بدەین، پێویستە گریمانەی ئەوە بکەین کە پێوەری خانەی ئازادی بۆ مافە سیاسییەکان بە گشتی لەگەڵ

هەڵسەنگاندنەکەمان بۆ فراوانی و یەکسانی و ڕاوێژی دەربەستبوونی بەرابەر تەبایە و پێوەری بۆ ئازادییە مەدەنییەکانیش بە گشتی دەگونجێت لەگەڵ ڕوانینمان بۆ ئەو پاراستنەی دەوڵەت بەردەستی دەکات. بەم زاراوانە دەتوانین بە شێوەیەکی لۆجیکی وا دابنێین کە ساڵی ١٩٧٥ (سەپاندنی یاسای باری نائاسایی لە لایەن ئەندیرا گاندییەوە) و ١٩٩١، تەنانەت ١٩٩٤یش (تیرۆرکردنی ڕاجیف گاندی و هەڵکشانی ململانێی هیندۆس- ئیسلام و ڕێوشوێنەکانی ئەو سەرکوتکردنەی حکومەتی ناوەندی سەپاندبوونی) قۆناغی لەباربردنی خێرای دیموکراسییە، هەروەها دەکرێ وا دابنرێ ساڵانی دوای ئەو قەیرانانە قۆناغی خاوتر و لەسەرخۆتری بەرپاکردنەوەی دیموکراسی بێت.

لەسەر ئاستێک کە لە هیچ دیموکراسییەکی دیی هاوچەرخ وێنای هەبوونی ناکەین، سیستمی حوکمڕان لە هیند کاتێک درزی تێدەکەوێت، گرژی لە نێوان سێ هێزە ئامادەکە بالادەست دەبێ: ١- دەسەڵاتێکی ناوەندیی پتەو کە لە حوکمی کۆلۆنیالی بریتانییەوە بۆی مابۆوە (بە جیابوونەوەی لە پاکستان و بە پاڵپشتیی نەهرۆ کە بە تاقمێک فەرمانبەری بەتوانا، ئەگەرچی بە زۆری بەرتیلخۆر بوون، تۆکمە و پتەو کرا)، ٢- جموجووڵی تۆڕە دەسەڵاتدارەکانی خاترگەری، ڕوونترین وێنەشی لەنێو لقەکانی حیزبی کۆنگرێس دەبینرا، ٣- کۆمەک و پاڵپشتیی سیاسەتی بەرگریکردن و کەرتبوون لەسەر هەردوو ئاستی لۆکاڵی و هەرێمایەتی٤. لەگەڵ ئەوەی ڕەگەزی دووەم (تۆڕە ئاڵۆزەکانی خاترگەری کە لە ئاستەکانی ناوچەییەوە بۆ هەرێمایەتی بۆ نیشتمانی شۆڕ دەبنەوە) زۆرێک لە ئاڵۆزییەکانی بە میراتی بۆ سیاسەتی هیندی بەجێهێشت – لە نزمترین ئاستییەوە بۆ بەرزترین ئاستی- ئەوا سەرکردەکانی سیستمی نیشتمانی لە لوتکەوە بۆ بنکەکەی هەوڵیان دەدا بەکارهێنانی تۆڕەکانی خاترگەری و ناسیاوی لەگەڵ کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتی بەڕێوەبردن ڕێکبخەن. هەروەها پۆڵ براس (Paul Brass) دەڵێت ئەم ستراتیجە تەنگژەی قووڵ دەخولقێنێت:

"زۆر بەسانایی تەنگژەکە بریتییە لەوەی کە ناتوانرێ لە وڵاتێکی فرەئایینی و لە چوارچێوەی سیستمێکی پارلەمانیی فیدراڵیدا بۆ ماوەیەکی زۆر پارێزگاری لە بوونیادی دەسەڵاتێکی سەقامگیر بکرێ، دامەزراندنی دەسەڵاتێکی نیشتمانی لە وڵات ئەرکێکی پڕزەحمەت و درێژخایەن و هەوڵ و کۆششێکی زۆری گەرەکە، هەروەها لەو ساتەوەختەی بە یەکگرتوویی دەردەکەوێت، دەست بە لێکترازانیش دەکات. ئەوپەڕی هەوڵ دەدا، بە جۆرێک تەنانەت لەگەڵ پاکترین نیاز لە جیهاندا، ئەستەمە سەرکردە وڵاتپەروەرەکان بتوانن جەخت لەسەر ئامانجەکانی گەشەسەندنی

4 - Sumit Ganguly "Explaining India's Transition to Democracy," in Lisa Anderson, ed., *Transitions to Democracy*. New York: Columbia University Press.1999 .

ئابووری بکەن و پێداویستییە سەرەکییەکانی میلەتەکەیان دابین بکەن. لە ڕاستیدا پێویستە خودی ئەو ئامانجانە بە مەبەستی پاراستنی ئەو دەسەڵاتەی لە ڕێگەی هەوڵی تاقەتپڕوکێنەوە دامەزراوە، بخرێنە خزمەت پێداویستییە سەرەکییەکانەوە

هەروەکو زانراوە فەرمانڕوا هیندییەکان، چەشنی فەرمانڕەواکانی شوێنانی دی، بە یەک چاو سەیری پاراستنی سیستم و پاراستنی دەسەڵاتی خۆیان دەکەن، ئەوان بڕی کێش یا ئەو بایەخەی بە هەردوو لایەنی تەنگژەکەی دەدەن، هەڵدەبژێرن: پاراستنی دەسەڵات لە بەرامبەر وەپیرەوەچوونی ئارەزووەکانی گەل. تەنگژەکە ڕاستەقینە و گرنگە، لەبەر ئەوەی زۆر لاوازکردنی هێزی ناوەند (دەسەڵاتی دەوڵەت) توانای وەپیرەوەچوونی ئارەزووەکانی گەل لە ڕێگەی هەوڵدانی دەوڵەت بۆ جێبەجێکردنی لاواز دەکات.

لە ماوەی دوای جەنگدا، سیستمی حوکمڕانی لە هیند نەیتوانی لە چوارگۆشەی دەسەڵاتێکی بەهێز و دیموکراسییەکی باڵای بواری سیستمەکانمان بچێتە دەرەوە، بەڵکو تەنها لەنێویاندا پێگەی خۆی گۆڕیووە. سیستمەکانی پێشوومان بینیووە، بۆ نموونە فرەنسای سەدەی هەژدەهەم لە قۆناغێکەوە دەجوولێت، کە بەربەستی گەورە لە بەردەم هەر فۆرمێک لە فۆرمەکانی دیموکراسیدا بەدی دەکرێ، بۆ قۆناغێکی دی کە جوولەی پڕهەڵبەزودابەز تێیدا لەسەر تەوەرەی دیموکراسی-نادیموکراسی نەک بە تەنها گونجاوە، بەڵکو لەباریشە. زۆر لەوانەیە، وەک دەرئەنجامی پرۆسەیەکی درێژخایەن، کە سەرکردە هیندۆس و موسڵمانەکان لە ڕووی حوکمی فاشیی بریتانیا وەستانەوە، هیند بەرلەوەی ساڵی ١٩٤٧ سەربەخۆیی بەدەست هێنابێت، بە سەرکەوتوویی ئەو ئاستانەیەی تێپەڕاندبێت. هاوزەمان لەگەڵ پشتبەستنی فەرمانڕەوایان بە سیستمی ناسیاوی، کەچی دەسەڵاتی تۆکمەی دەوڵەت پارێزگاری لە دیموکراسیبوونی سیستمی حوکمڕانی کرد، هەرچەندە پرکەموکورتییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە مایەی سەرسورمان بووە.

بە دیاریکردنی پەیوەندیی نێوان مێژووی هیندستانی پۆست کۆلۆنیالیزم و شێوازە گشتییەکانی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی دەست پێدەکەین. هەروەکو ئاماژەپێکردنی ئەو دارەتانەی لە بەشی ٢دا نمایشمان کردوون، بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی بە یەکانگیرییەکی تەواوی نێوانیان ئەنجام نادرێ. بە گشتی، بەرپاکردنی دیموکراسی لە ناوکۆی (کۆنتێکست) وەپیرەوەچوونی فەرمانڕەوا و چینی دەستەبژێر لەگەڵ ئەو قەیرانانەی ڕووبەڕووی سیستمەکەیان دەبێتەوە و بە ڕوونی هەڕەشە لە دەسەڵاتەکەیان دەکات، بەدەست دێت. بە شێوەیەکی ئاسایی دیموکراسی بە وەڵامدانەوەی دەوڵەت (هەرچەند نەخوازراویش بێت) بەرامبەر داواکاریی دانیشتووان، دوای سوکبوونی قەیرانەکان ڕوو دەدا. وەک دەرئەنجامێکی ئەو کارەش، لەنێوبردنی دیموکراسی - بە گشتی-

زۆر بە خێرایی و بە ڕێنمایی ئیدارەی نێوەند، لە بەرپاکردنی دیموکراسی، ڕوو دەدا.
لەگەڵ بەردەوامبوونی توێژینەوەکەمان لەسەر ڕاڤەکردنەکان، لەم گشتاندنانەدا ڕووبەڕووی ئاوارتەیی دەبینەوە، بەتایبەتی لەو حاڵەتانەی کە داگیرکردنی سەربازی یا شۆڕش بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و خێرا دەبنە مایەی ئەوەی بە هێز دیموکراسی بەرپا بکرێ. بەڵام بە گشتی دەبینین تیۆریستانی دیموکراسی لەوەدا لەسەر حەقن کە: بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی تەنگژەیەک دەخولقێنێت، کە تێیدا دەسەڵاتی ناوەندی و ویستی گەل ڕووبەڕووی یەکتری دەبنەوە. بەبێ دەسەڵاتێکی بەهێزی دەوڵەت ناتوانرێ داواکاریی هاوڵاتیان بۆ وەرچەرخان لە ژیانی کۆمەڵایەتییاندا وەربگێڕدرێت، بەڵام بە بوونی دەسەڵاتێکی بەهێزی دەوڵەت، پێویستە حوکمڕانەکان هەست بە پاڵنەرێک بکەن تا دەسەڵاتەکەیان لە پشتگیریی پێگەکەیان بەکار بهێنرێ و هەوڵ بدەن ئەو بەرنامەیە بەدی بهێنن، کە پەسەندی دەکەن و پاداشتی لایەنگرەکانیشیان بکەن. بۆیە دیموکراتییەت گەیشتنە بە ڕێککەوتنێک، کە لە پیادەکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتێکی چڕ و توندوتۆڵدا گفتوگۆی لەسەر دەکرێ. بۆیە زۆرجار مۆبێلیزەکردنی میلی لەخۆ دەگرێ. بەڵام ئەو مەرجانە چین، کە ڕێککەوتنەکە ڕاشکاوانە و دەربەست دەکات و لەسەر بەجێهێنانی حکومەت ڕادەوەستێت؟

نیشانەکانی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی

حاڵەتە دژوارەکەی دیموکراسی لە هیندستان بۆ ئەرکە گشتییەکەی ئەم کتێبە دەمانگێڕێتەوە. ئێمە هەوڵ دەدەین، لەسەر فراوانترین ئاستی چەمکەکان، وەسفی مەودای ئەو هەمەڕەنگی و گۆڕانکارییە بکەین، کە دەوڵەت لەسەر داواکاریی هاوڵاتیانی هەنگاوی بۆ دەنێت و لێکدانەوەیان بۆ دەکات. بۆ ئەوەی لەم وەسفە ڕامێنین، کارێکی بەسوودە هەڵگۆزینەکەمان بۆ چوار پێکهاتە دابەش بکەین: "مەودای کاریگەریی ڕاگەیەنراوەکانی هاوڵاتیان چەندە"، "مەودای یەکسانیی نێوان توێژە جیاوازەکانی هاوڵاتیان چەندە لە وەرگێڕانی داواکارییەکانیان بۆ ئەو ڕەفتارەی دەوڵەت تەبەنی دەکات"، "تا چ مەودایەک گوزارشت لە داواکارییەکانی پاراستن لە لایەن دەوڵەتی سیاسییەوە دەکرێ" و "ئەندازەی دەربەستبوونی پرۆسەی وەرگێرانی ئەم داواکاریانە بۆ هەردوو لایەنەکە: هاوڵاتیان و دەوڵەت، چەندە".
ئەم چوار پێکهاتەیە ڕاستەوخۆ بەرەو ئەو پێناسەیەمان دەبات، کە توێژینەوەکەمان ئاڕاستە دەکات: سیستمێک دیموکراسی دەبێ، تا ئەو ڕادەیەی پەیوەندییە سیاسییەکان لە نێوان دەوڵەت و هاوڵاتیان، ڕاوێژی فراوان و یەکسان و پارێزراو و دەربەستبوونی بەرابەری تێدا دەربکەوێت. بەوەش بەرپاکردنی دیموکراسی بە مانای جمانێکی پوخت دێت بەرەو ڕاوێژی فراوان و یەکسانیی زیاتر و پاراستن و دەربەستبوونی بەرابەری گەورەتر، بەڵام لەنێوبردنی دیموکراسی بە مانای جمانێکی پوخت دێت بەرەو ڕاوێژی بەرتەسکتر

و یەکسانی و پاراستن و دەربەستبوونی بەرابەری کەمتر.
بەڵام ئەو پرسیارە دەمێنێتەوە: چۆن بە دروستی ڕوودانی ئەم گۆڕانکارییانە بزانین؟ ئەم مەسەلەیە بۆ دوو بەش دابەش دەبێ: پرەنسیپەکانی سۆراخکردن، بەردەستبوونی ئەو بەڵگەنامانەی ڕێگەمان پێدەدەن ئەو پرەنسیپانە پیادە بکەین.
با بەشی دووەم (بەڵگەنامە بەردەستەکان) بۆ ساتێک بخەینە لاوە بۆ ئەوەی جەخت لەسەر پرەنسیپەکان بکەینەوە، لە جیهانێکی پڕزانیاریی بێشوماردا، چۆن بەپێی ئەم پرەنسیپانە دەست بە سۆراخکردنی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی بکەین؟ چوارچێوەی ٣-١ ئەو هێڵە ئاڕاستەکارانە پێشکەش دەکات، کە لە پێناوی سۆراخکردنی ئەم شێوازانە گفتوگۆی لەسەر کراوە. ئەم پرەنسیپانە، گەرچی بە شێوەیەکی نارەسمیش بێت، لە شیکردنەوەکانی پێشوومدا بۆ هەریەک لە: فرەنسا، ڕژێمەکانی پۆست سۆسیالیزم، هیندستان، پیادەم کردووە. ئایدیا ڕێکخەرەکانی شیکردنەوەکە زۆر ئاسانە: بە کارلێکی نێوان هاوڵاتی و دەوڵەت دەست پێبکە، پاشان زیاتر جەخت لەسەر بەراوردکارییە جووڵەدارەکان بکە تا ئەوەی جەخت لەسەر بەراوردکارییە بێجووڵەکان بکەیت و تێکڕاییەکی نێوەنجی بۆ وەرچەرخانەکانی ڕاوێژی فراوان و یەکسان و پارێزراو و دەربەستبوونی بەرابەر بدۆزەرەوە، مەودای ئەو حاڵەتانە دیاری بکە، کە لە ناویاندا کار دەکەیت و پێوەرێک بۆ وەرچەرخانەکانی ئەو مەودایە بدۆزەرەوە و لادانی پەیوەندییە بەرتەسکەکانی نێوان ئەو وەرچەرخانانەی ئاماژە بە ئاریشە گرنگەکانی ڕاڤەکان دەکەن، بەلاوە بنێ.
لە حاڵەتی هیندستاندا - بۆ نموونە- ئەم پرەنسیپانە بە شێوەیەکی تایبەتی سەرنج بۆ قەیرانەکانی دیموکراسیی ساڵانی نێوان ١٩٧٥ و ١٩٧٧، نێوان ١٩٩١و ١٩٩٤ ڕادەکێشن.
بەڵام من زۆر وەڕستان ناکەم، چونکە هیچ یەکێک لەم شیکردنەوانەی باقیی ئەم کتێبە ناگاتە ئاستی پێوەرە بەرخوازەکانی ئەو نموونانەی لە چوارچێوەی ٣-١دا هاتوون.

> چوارچێوەی ٣-١: ئەو پرەنسیپانەی وەسفی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی دەکەن
>
> ١- جەخت لەسەر تێبینیی کاریگەریی دوو لایەنەی نێوان هاوڵاتیان و دەوڵەتەکان بکەرەوە. بۆ نموونە سەرنج بدە چ شتێک ڕوودەدا کاتێک هاوڵاتیان داواکارییەکانیان پێشکەش بە فەرمانبەرانی دەوڵەت دەکەن و کاتێک فەرمانبەرانی دەوڵەت هەوڵ دەدەن دوژمن یا ڕکابەرەکانیان سەرکوت بکەن.
>
> ٢- گشت ئەو پێوەرانە بدۆزەرە یا وەربگرە، کە لەسەر کاریگەریی دوو لایەنەی نێوان هاوڵاتیان و دەوڵەت جێبەجێ دەبێ و/ یا نموونە لەسەر زنجیرەیەکی فراوان لە کاریگەرییە بەرابەرەکان وەربگرە. بۆ نموونە نامەگۆڕینەوە یا چاوپێکەوتنی نێوان فەرمانبەران و خەڵکانی ئاسایی شیبکەرەوە.
>
> ٣- منەی ئاڵوگۆڕ لە فراوانبوون و یەکسانی و پاراستن و ڕاوێژی دەربەستبوونی بەرابەری نێوان دەوڵەت و هاوڵاتیان بکە، وەک ئەوەی،

بۆ نموونە، شیتەڵکاریی گۆڕانکاری دەکەیت لە پرۆسەی زیندانیکردنەوەی جیابووەکان بەبێ ئەوەی کارڕایی ئوسوڵی لە لایەن فەرمانبەرانی دەوڵەتەوە بکرێ.

٤- تێکڕای نێوەنجی بۆ ئەو وەرچەرخانانە بدۆزەرەوە، بە گریمانەی ئەوەی فراوانی و یەکسانی و پاراستن و ڕاوێژی دەربەستبوونی بەرابەر، بەشداریی وەکیەکی لە بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی پێشکەش دەکەن. بۆ نموونە پوختەیەکی جودای ورد لە دەرئەنجامەکانی فراوانی و یەکسانی و پاراستن و ڕاوێژی دەربەستبوونی بەرابەر پێک بهێنە، پێش ئەوەی بیخەیتە پاڵ دەرئەنجامە گشتگیرەکانی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسییەوە.

٥- ئەگەر گۆڕانەکان بە ڕوونی جیاواز بن (یەکێک لە ڕەگەزەکان بە ئاڕاستەی پێچەوانە دەگۆڕێت، یا ئەوی دی زیاتر یا کەمتر لە ڕەگەزەکانی دی دەگۆڕێت)، هێمایەک بەتایبەتی بۆ سەرنجدان لەسەری دابنێ، بۆ نموونە، ئەگەر فراوانبوون و یەکسانی و پاراستن پێشبکەوێت و ڕاوێژی دەربەستبوونی بەرابەر پاشەکشێ بکات، لە ئەگەری جووڵەکردن بەرەو حوکمێکی ستەمگەری چاکەکار بگەڕێ.

٦- زنجیرەیەک لە حاڵەتی بەراوردکاری دابنێ لە نزمترین ئاستی دیموکراسییەوە تا بەرزترین ئاستی ڕێک خرابێ، لەگەڵ نێوانکەوتنی ئەو حاڵەتانە لەو سیستمانەی پێشتر بە پشتبەستنی ئامانجی شیکردنەوەکەت، لە کۆمەڵەی زۆر بەرتەسک بەدیت کردووە، بۆ نموونە: لە پێناوی کاریگەریی جەنگی جیهانیی یەکەم لەسەر دیموکراسی، بەراوردکاری لە نێوان ئەوانەدا بکە، کە لە ١٩١٥ەوە تا ١٩٢٥ بەشداریی شەڕیان کردووە.

٧- پێوەرێک دابنێ بۆ ئەو گۆڕانکارییانەی لە حاڵەتی توێژینەوەدان و کاریگەریی لەسەر دەرئەنجامەکەی هەیە، بۆ نموونە، لەکاتی ڕوانینی دۆخی ئەڵمانیا لە نێوان ١٩١٥ و ١٩٢٥دا، پلەی دیموکراسیبوونی لە تۆماری دیموکراتییەت لە بەرزترینەوە (١) بۆ نزمترین (٠) تۆمار بکە، سەرنج دەدەیت ئەو سیستمانە پێی دەگەن، کە لەو دەمەدا کاریگەریی جەنگیان لەسەر بووە.

٨- تەواوکردنی ئەو بەراوردکارییەی نێوان سیستمەکان لەگەڵ سۆراخکردنی مەودای ئەو گۆڕانکارییانەی دەوڵەت لە دەرئەنجامی ڕاوێژی نێوان دەوڵەت و هاوڵاتیان جێبەجێی کردووە، بۆ نموونە،ساڵبەساڵ لە ١٩١٥ەوە تا ١٩٢٥، بەجێهێنانی دەوڵەتی ئەڵمانی سەبارەت بەو داواکاریانە بەراورد بکە، کە دەنگدان و چالاکیی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی گوزارشتیان لێی کردووە.

٩- ئەگەر ئەو شیتەڵکارییە گۆڕانی لە جێبەجێکردندا ئاشکرا کرد، ئەوا پاسادان بکە لەوەی خودی ئەو گۆڕانکارییە لە دەسەڵاتی دەوڵەتدا هۆی ئەو گۆڕانکارییە بووە. بۆ نموونە، ئەوە دیاری بکە کە قەرەبووەکانی دوای جەنگ، هەڵاوسان و ئاوەداکردنەوە، توانای دەوڵەتی ئەڵمانی لەسەر وەپیرەوەچوونی داواکارییەکانی هاوڵاتیان کەم کردۆتەوە.

بە زۆری گێڕانەوەیەکی ڕاڤەبۆکراو بەو شێوازە پێشنیاز دەکەم، کە بۆ لەنێوبردنی دیموکراسی لە دۆخی فرەنسا و هیندستاندا پێشکەشم کردووە، لەگەڵ هێشتنەوەی پرەنسیپەکانی چوارچێوەی ٣-١ لە زەیندا، بەبێ دەرخستنی ژمارە یا تەنانەت بەراوردکاریی دیاریکراو لەگەڵ سیستەمەکانی دی. پاڵپشتی خۆم بۆ هەڵسەنگاندنەکانی خانەی ئازادی (هەروەکو حاڵەتی هیندستان) بۆ مافە سیاسی و ئازادییە مەدەنییەکان لە ڕژێمەکاندا دووبارە دەکەمەوە، بە خاتری ئەوەی دەرئەنجامی مافە سیاسییەکان گوزارشت لە قەبارەی فراوانی و یەکسانی و ڕاوێژی دەربەستبوونی بەرابەر دەکات، بەڵام ئازادییە مەدەنییەکان گوزارشت لە قەبارەی پاراستن لە لایەن دەوڵەتەوە دەکات. ئەم هەڵسەنگاندنانە ئەو وردییەی تێدا نییە، کە دروستیی - یا ساختەی- وتەزاکانی ئەم کتێبە بسەلمێنێت، بۆیە شیکارییەکانم بۆ لایەنگریکردن و پیاچوونەوە یا ڕەتکردنەوەی دەخەمە بەردەستی شارەزایان.

شتێکی ڕوون و ئاشکرایە ئەو حاڵەتانەی بۆ بەراوردکردن لەسەر فراوانبوونی دیموکراسی لە ئاستە نزمەکانییەوە بۆ ئاستە باڵاکانی هەڵیدەبژێرین، کاریگەرییان لەسەر تێگەیشتنمان دەبێت. بۆ نموونە، گریمان لاسایی ئادەم پرزیۆرسکی (Adam Przeworski) و یاریدەدەرەکانی دەکەینەوە، ئەوانەی توێژینەوەی بەجێهێنانی ١٤١ سیستەمی حوکمڕانییان لە ماوەی ١٩٥٠ و ١٩٩٠دا کردووە. ئەوان بە شێوازێکی زۆر سادە هەڵسەنگاندنیان بۆ مەودای گۆڕانەکان لە مەودای دیموکراسیدا کردووە. ئەوان لە شیتەڵکاریی چەندایەتی بۆ بەرپاکردنی دیموکراسی، تەبەنیی ستراتیجیە بەربڵاوەکانیان کردووە: بە ئاگابوونیان لە جیاوازییە وردەکان لە ساڵێکی دیاریکراودا سیستەمەکانیان پۆلێن کردووە، بەوەی یا فاشییە یا دیموکراسی. سیستەمی حوکمڕانی بە دیموکراسی وەسف ناکرێ کە دەسەڵاتێکی جێبەجێکار و دەستەیەکی یاسادانانی هەڵبژێردراوی نەبێت، بەلانیکەمەوە دوو حیزبی سیاسیی کێبەرکێکار و هێندێک لە دەستاودەستکردنی دەسەڵاتی تێدا نەبێت، پاشان دەیانپرسی: ١- ئایا سیستەمی فاشی و دیموکراسی لە ڕووی بەرنامەوە جیاوازییان لە بەجێهێنانی حکومدارییەوە هەیە؟ ٢- لە سایەی چ هەلومەرجێکدا سیستەمی حوکمڕانی دەروازەی فاشییەت و دیموکراتییەتی لە هەریەک لەو دوو ئاڕاستەیە تێپەڕاندووە؟ ٣- سیستەمی حوکمڕانی، ئەگەر ئەو دەروازەیە تێپەڕێنێ، چ جیاوازییەک لە بەجێهێنانیدا دەهێنێتە ئاراوە؟

بە درێژایی ئەو چوار دەیەیەی توێژینەوەی بۆ کراوە، زۆرینەی ئەو ڕژێمانە هەڵبژاردنی فەرمییان ئەنجام داوە، ئیدی تا چەند ساختەکاریشی تیا کرابێت. بۆیە لێرەدا بە دوو

هەڵگۆزین دەگەین:
یەکەم: لە توێژینەوەی قۆناغی نێوان ١٩٥٠ و ١٩٩٠دا ماوەی نێوان هەڵبژاردنی ساختە تا هەڵبژاردنی کێبەرکێکارانەی تەواو پاکوتێ دەکات، بەڵام نێوان ئەم دوو ئاستە جیاوازیی گەورەی تێدا نییە.
دووەم: بۆ ئەوەی دەرئەنجامەکانی پرزیۆرسکی و هاوڕێکانی لە چوارچێوەی ٣-١دا تەبەنی بکەین، پێویستە گریمانەی ئەوە بکەین، کە مۆرکی هەڵبژاردن بە تەواوەتی پەیوەستە بە لایەنەکانی فراوانی و یەکسانی و پاراستن و ڕاوێژی دەربەستبوونی بەرابەرەوە.
لە بەرامبەریشدا گریمان ئێمە هەموو ئەو سیستمانە دەپشکنین، کە توانیومانە لە نێوان ١٧٥٠ و ١٨٠٠دا بەڵگەیان لەسەر کۆبکەینەوە، لە فرەنسا، کۆماری هۆڵەندا، بریتانیای مەزن، ویلایەتە یەکگرتووەکانی تازەپێگەیشتوو و وڵاتانی دی، ئەو بەراوردکارییانەی لەسەر سیماکانی هەڵبژاردنی نیشتمانی ئەنجام دراون، بە هیچ دەرئەنجامێکمان ناگەیەنن. لە ڕاستیدا لەگەڵ بەکۆتاهاتنی سەدەکە هەڵبژاردنێکمان بەرچاو دەکەوت، کە بە مەبەستی دامەزراندنی دەستەی یاسادانانی نیشتمانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و بریتانیای مەزن، بۆ دەنگدەرانی دیاریکراو کورت کراوەتەوە. لە هێندێک ماوەی نەوەدەکانی سەدەی هەژدەهەمدا شتی لەو شێوەیەمان لە فرەنساش تێبینی کردووە. بەڵام لە چوارچێوەی کام پێوەردا سیمای هەڵبژاردن

- وەک پێوەری سەرەکی بۆ بەرپاکردن و دامەزراندنی دیموکراسی- مەوداکەی دەشێوێنێ، پاشان بۆ بەراوردکاریی ماوەی نێوان ١٧٥٠ تا ١٨٠٠ کاری لەسەر دەکرێ؟ بۆیە جگە لە پشتبەستن بە جۆری دی لە مافەکان و فۆرمۆڵەی دی لە بەشداریکردنی سیاسی و فۆرمی دیی پاراستن لە ڕێوشوێنەکانی دەوڵەتی ستەمگەر هیچ بژاردەیەکمان لەبەردەمدا نییە. ئەمەش لە مێژووە سەرەکییە گشتگیرییەکانی کارلێککردنی (هەروەکو وتەکانی پێشووم لەسەر فرەنسا) نێوان هاوڵاتیان و دەوڵەت بەدییان دەکەین.
بە دڵنیاییەوە لە سەدەی داهاتوودا پێوەرەکانی هەڵبژاردن بەراوردکارییەکانی نێوان سیستمەکانی ڕۆژئاوا ڕێکدەخات. با سێ پێوەری ساکار وەربگرین:
نوێنەرایەتیکردنی پارلەمانی لەسەر ڕەزامەندیی بەشێکی گرنگ لە دانیشتووان خۆی ڕاگرتووە.
مافی هەڵبژاردن بۆ پیاوان.
مافی هەڵبژاردن بۆ ژنان.
گەر ئێمە یەک نیشانە بدەین بە هەر یەکێک لەو پێوەرانە، ئەوا ئەندازەیەکی نزیک بە دیموکراسی دروست دەکەین، لە سفرەوە (سێی تێدا نییە) بۆ سێ (گشت سێیەکە) دەست پێدەکات. بۆ هەڵسەنگاندنی کارایی سیستم دەتوانین زیادبوون یا کەمبوونی یەکێک لەو ڕەگەزانە بە جووڵەیەک بەرەو دیموکراسی یا دوورکەوتنەوە لێی دابنێین. بە پەنابردن بۆ

ئامارە نایابەکەی دانیاڵ کارامانی (Daniele Caramani) (٢٠٠٣ - ٢٠٠٠)، وێنەی ٣-٢ زانیاریی پێویست بۆ ئەم ئەندازەیە ڕوون دەکاتەوە، کە ژمارەیەک لە وڵاتانی ئەوروپا لە ١٨٠٠ تا ١٩٧٩ دەگرێتەوە.
سەبارەت بە ١٨ یەکە سیاسییەکە (هەموویان لە ساڵی ١٨١٥دا وەک دەوڵەتی سەربەخۆ بوونیان نەبووە، لە دوای ئەوەشەوە سنووری هەموویان بەلانیکەمەوە هێندێک گۆڕانی بەسەردا هاتووە). کارامانی زانیاریی دەوڵەمەندمان لەسەر مافی هەڵبژاردن پێدەدا، ئەو جیاوازی دەکات لە نێوان نوێنەرایەتیکردنی گشت چینەکان لە ڕێگەی مولکوماڵ و شێوە هاوشێوەکانی دی و لە نێوان نوێنەرایەتیی گشتیی پارلەمان، کە بە مانای هەڵبژاردنی نوێنەرانی کۆمەڵەی نیشتمانی دێت لە لایەن جەماوەری دەنگدەرانەوە، ئیدی قەبارەیان هەرچەندێک بێت، گەورە یا بچوک. بەدەر لە هەوڵەکانی پێشوو کە تەواو نەکراون وەک کۆمەڵەی نیشتمانیی فرەنسیی ساڵی ١٧٨٩، وێنەی ٣-٢ جیاوازی لە نێوان چوار حاڵەتدا دەکات: ١- بوونی نوێنەرایەتیکردن بەبێ هەڵبژاردن بۆ پیاوانی باڵق، ٢- بوونی مافی هەڵبژاردن بۆ پیاوان، بەڵام نوێنەرایەتیکردنی هەمیشە هێشتا دەستی پێنەکردووە، ٣- بوونی هەردوو نوێنەرایەتیی پارلەمان و مافی هەڵبژاردن بۆ پیاوان لەو ساتەوەختە بەدواوە، ٤- مافی هەڵبژاردنی ژنان دەخرێتە پاڵ مافی هەڵبژاردنی پیاوان و نوێنەرایەتیی پارلەمانەوە.

بە ڕاستی دەشێت مێژووەکانی کارانی جێگەی پرسیار بن.




وێنەی ٣-٢ نوێنەرایەتیکردن و مافی هەڵبژاردن لە ڕژێمە هەڵبژێراوەکانی ئەوروپا

نەرویج تا ساڵی ١٩٠٥ سەربەخۆیی لە سوید وەرنەگرتبوو - بۆ ئەوەی بە ڕاستی پارلەمانێکی نیشتمانیی سەربەخۆی هەبێت- بەڵام فینلەندا، لەگەڵ ئەوەی لە واقیعدا ساڵی ١٩٠١ دەستوورێکی دیموکراسی دانا و تا ساڵی ١٩١٧ وەک بەشێک لە ئیمپراتۆرییەتی ڕووسیا مایەوە و تەنها دوای شەڕی ناوخۆ لە نێوان ساڵانی ١٩١٧ و ١٩١٨ وەک دیموکراسییەکی سەربەخۆ دەستی بە کار کرد
لویس ناپۆلیۆن شێوازی جیاوازی گرتەبەر

بۆ ئەوەی چارەسەرێک بدۆزێتەوە بۆ مافی هەڵبژاردنی پیاوان کە کۆمەڵەی شۆڕشگێڕان لە ساڵی ١٨٤٨دا بڕیاری لەسەر دابوو، بۆیە بەوپەڕی ئاسوودییەوە دەتوانین ئەوە دیاری بکەین، کە کارکردن بە مافی هەڵبژاردنی پیاوان لە فەڕنسا لەگەڵ سەرەتای حوکمی کۆماری سێیەمدا بوو.

هەروەها ئیتاڵیاش تا ساڵی ١٨٧٠ نەبووە وڵاتێکی یەکگرتوو، بەوەش مێژووی نوێنەرایەتیی پارلەمانی کە تا ئێستا بەردەوامە و لە ڕیفۆرمی پیدمۆنت (Piedmont)ی ساڵی ١٨٤٨ەوە دەست پێدەکات، پێش کاتی خۆی کەوتووە.

ڕەنگە دیسانەوە بپرسین، ئەگەر جومگەکانی حوکمی فاشی لە ئیتاڵیا و ئەڵمانیا و ئیسپانیا و فەڕنسا و وڵاتانی دی، کە بە شێوەیەکی تەواو حوکمی پارلەمانیان بڕی، ئەوا لە دوای جەنگی جیهانیی دووەمەوە کاتە دیاریکراوەکان پێویستیان بە سەرەتای تازە هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا بە گشتی بەروارەکانی کارامانی لە نوێنەرایەتیی پارلەمانیدا ئاماژە بە پێشکەوتنێکی ڕەگوڕیشەداری جێگیر دەکەن، ڕەنگە وەک هەر ئەڵتەرناتیڤێکی تاکگەرا کە ئێمە پێشنیازی بکەین، کارێکی پەسەند بێت.

ئەو سێ حاڵەتە کەمایەتییەی مافی هەڵبژاردنی پیاوان پێش ئەو ئەنجومەنانە کەوتن، کە بە بەردەوامی پیادەی ڕۆڵی خۆیان دەکرد (فەڕنسا، ئەڵمانیا و "سەرنجڕاکێشترینیان" یۆنان)، هەموویان لە ساتەوەختی شۆڕشی چلەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا ڕوویان دا، کاتێک سیستمی نوێ بە شێوەیەکی کاتی ئەنجومەنی یاسادانان و مافی هەڵبژاردنی گشتییان بۆ پیاوان پەسەند کرد، بەڵام دواتر کە سیستمە فاشییەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست، دەسەڵاتی یاسادانانیان هەڵوەشاندەوە و هەڵبژاردنیان وەک خۆی هێشتەوە. لویس ناپۆلیۆن ئەوەیشی لە فەڕنسا زیاد کرد، کاتێک بە کودەتاکەی لە ساڵی ١٨٥١ ئەنجومەنی نیشتمانی داخست، نەیوێرا وەک مەرجی بەخشینی مافی هەڵبژاردن، دووبارە بڕیار لەسەر مافی مۆڵکداریێتی بداتەوە. لە ئەڵمانیا، دەکرێ وا دابنێین دەستپێکردنی حکومەتی پارلەمانی دەگەڕێتەوە بۆ مێژوویەکی پێشکات، ئەویش کاتێک ساڵی ١٨٠٨، یاسای هەڵبژاردنیان بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنی نیشتمانی لە ڕێگەی جەماوەرێکی گەورەی دەنگدەر لە پیاوان دەرکرد (بەڵام تایبەت بوو بە خاوەنموڵکەکان). ساڵی ١٨٤٨ لە ماوەی حوکمی یەکگرتوویی کاتیدا، ئەنجومەنی یەکێتی ئەڵمانیا مافی دەنگدانی بۆ پیاوانی "سەربەخۆ پێگەیشتووەکان" پەسەند کرد، سەرباری ئەوەی هەر یەکێک لە ویلایەتەکان مافی ئەوەی هەبوو وشەی "سەربەخۆ" و "پێگەیشتوو" پێناسە بکات. لەگەڵ ئەوەشدا کارانی لە مێژووەکەیدا ماقوڵ بوو، کە بە شێوەیەکی گشتی سەرەتای حوکمێکی پارلەمانیی بەردەوام لە یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا لە ١٨٧١ەوە دیاری دەکات.

بەڵام لە یۆنان ئەو شۆڕشگێڕانەی لە بیستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا سەربەخۆییان لە ئیمپراتۆرێتی عوسمانی وەرگرتەوە، کۆمەڵەی نوێنەرایەتییان دامەزراند، کە لە

ڕێگەی دەنگدانی پیاوان و لە لایەن دەستە و دەسەڵاتی چینی دەستەبژێرەوە هەڵدەبژێردرا. بەڵام ئەو سیستمە فاشییەی دواتر هات، زۆر بە خێرایی هەموو دیاردەیەکی نوێنەرایەتیی گەلی هەڵوەشاندەوە. ساڵی ١٨٤٣ شۆڕشگێڕە یۆنانییەکان مافی هەڵبژاردنیان بۆ پیاوان گێڕایەوە و ژمارەیەک ئەنجومەنی یاسادانانیان بەبێ دەسەڵاتێکی ڕاستەقینە دامەزراند. لەگەڵ مێژوویەکی پڕ قۆرت کە کودەتا و شۆڕشی بەدوای خۆیدا هێنا، دیاریکردنی سەرەتای حوکمێکی پارلەمانیی بەردەوام لە یۆنان دەبێتە کارێکی زۆردارانە، بەڵام هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٢٦ لە لایەن کارامانی-یەوە کە تێیدا یەکەم ئەنجومەنی یاسادانان لە دوای هەڵوەشانەوەی پاشایەتی (١٩٢٤)، دەسەڵاتی گرتە دەست، سەرەتایەکە جێگەی ستایش و قبوڵکردنە.

خشتە زەمەنییەکانی وێنەی ٣-٢ چەندین خاڵی گرنگ دیاری دەکەن:

- زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی ئەوروپا نوێنەرایەتیی پارلەمانیان بە جەماوەرێکی دەنگدەری دیاریکراو دەست پێکرد.
- مافی هەڵبژاردن بۆ پیاوان بە گشتی دوای چەندین دەیە لە دامەزراندنی نوێنەرایەتیی پارلەمانیی هاتە ئاراوە.
- لەگەڵ ئەوەی هێندێک وڵات مافی هەڵبژاردنی تەواویان بە پیاوان و ژنان بەخشی، بەڵام ژنان بە گشتی مافی دەنگدانیان بە چەندین دەیە لە دوای پیاوانەوە بەدەست هێنا.
- تا دامەزراندنی حکومەتی نوێنەرایەتی دوابکەوتایە، ماوەی کۆتکردنی مافی هەڵبژاردن کورت دەبوویەوە.
- هەنگاوەکانی وەرچەرخان لە وڵاتە جیاوازەکاندا لە ڕووی کاتەوە بەیەکدەگەن، بەتایبەتی لە چلەکانی سەدەی نۆزدەهەم (شۆڕشەکانی ١٨٤٨ و هاوشێوە ڕیفۆڕمخوازەکانی) و بیستەکانی سەدەی بیستەمدا (جەنگی جیهانیی یەکەم و دەرئەنجامەکانی).

پەرەسەندنی نوێنەرایەتیکردن لە ماوەی شۆڕشەکانی ١٨٤٨دا تا ڕادەیەکی زۆر وەڵامدانەوەی داواکاری گەل بوو بۆ ئەوەی مافی تازەی پێببەخشرێت. بەڵام سەنتراڵیزەبوونی نوێبوونەوە لە دوای جەنگی جیهانییەوە تا ڕادەیەک دۆخە جیاوازەکەی ئاوەژۆ کردەوە: ئەو هاوڵاتییانەی (بە ژنیشەوە) باجی قورسی جەنگیان داوە، سازش لەگەڵ ئەو وڵاتانە دەکەن، کە شەڕوشۆر وێرانی کردوون، ئەویش لە پێناوی ئەو مافانەی پێشتر پێویستیان پێی هەبووە و خزمەتگوزارییان لە هەردوو بواری سەربازی و مەدەنیدا پاساوی داوەتەوە.

هەروەکو لەسەر نەخشەکە خاڵەکانی نوێنەرایەتیی پارلەمانی و مافی هەڵبژاردن دەردەکەون، بەرپاکردنی دیموکراسی لە ئەوروپا بە شێوەیەکی پچڕپچڕ و ناڕێکوپێک ڕووی دا، بەتایبەتی لەو ماوانەی جیهان پڕ لە پشێوی بوو. بە هەمان ڕیتمیش مافی دامەزراندنی سەندیکا و مانگرتن بۆ کرێکاران ڕووی دا، هەردووکیان لە دەوری شۆڕشەکانی ١٨٤٨ و جەنگی جیهانیی یەکەمدا٥ کۆبوونەوە،

5 - Bernhard Ebbinghaus: "The Siamese Twins: Citizenship Rights, Cleavage Formation, and Party-Union Relations in Western Europe," in

هەروەها گۆڕانی هاوشێوەیەش لە ئازادییە مەدەنییەکان، لێدوان، ڕۆژنامە و گردبوونەوە و پێکهێنانی سەندیکا ڕووی دا (Anderson and Anderson, Chapter ٦). لەم هەموو بوارانەشدا قەیرانەکانی سیستمی حوکمڕانی و مۆبیلیزەکردن لە بنکەوە بۆ لوتکە بەیەک دەگەن بۆ ئەوەی بە تەنازولکردنی دەسەڵاتداران مافەکانی وەربگرێت.

بەلانیکەمەوە سەبارەت بە ئەوروپا، بەروارە سیاسییە بەردەستەکان بە مەبەستی جێبەجێکردنی پرەنسیپەکانی چوارچێوەی ٣-١ پێش هێندێک ئامراز دەکەوێت: جەختکردنە سەر تێبینییەکان دەربارەی کارلێکی نێوان هاوڵاتیان و وڵاتەکان، داهێنان یا وەرگرتنی ئەو ڕێوشوێنانەی دەربارەی زۆرێک لە کارلێکی نێوان هاوڵاتی و دەوڵەت بەیەک دەگەن و/ یا پەنابردنەبەر سەمپڵی زنجیرەیەکی بەربڵاو لە کارلێکەکان و گەڕان بەدوای گۆڕاندا لە فراوانی و یەکسانی و پاراستن و ڕاوێژی (دەوڵەت- هاوڵاتی) دەربەستبوونی بەرابەر و پێکهێنانی تێکڕای نێوەنجی ئەو گۆڕانکارییانە، بە گریمانەی ئەوەی کە ئەو ئاڵوویرانە بەشدارییەکی یەکسان بۆ بەرپاکردنی دیموکراسی و لەنێوبردنی دەهێنێنە گۆڕێ و سەبارەت بە نۆ پرەنسیپەکەی دیش هەر بەو شێوەیە دەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەردوو پرەنسیپی ٦ و ٧ (دانانی مەودایەکی ڕوون بۆ حاڵەتەکانی بەراورد و ئەندازەکردنی مەوداکە) ڕاستەوخۆ هیچ پێوەرێکمان فێر ناکەن بۆ ئەوەی تەبەنیی بکەین و ئاماژەش بە هێڵێکی ڕوون ناکەن تا پێوەرەکەمان بۆ بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی ئاراستە بکات، بەندی ٢ لە خشتەی ناوەڕۆکی چوارچێوەی ٣-١ (داهێنان یا وەرگرتنی ئەو ڕێوشوێنانەی دەربارەی زۆرێک لە کارلێکی نێوان هاوڵاتی و دەوڵەت بەیەکدەگەن و/ یا وەرگرتنی سەمپڵی زنجیرەیەکی فراوان لە کارلێکەکان) بۆمبێکی زۆر لە چەقی ئەو ڕێگە دەشارێتەوە

هەروەکو ئاشکرایە ئێمە ناتوانین لیستێک وەربگرین بە گریمانەی ئەوەی پێکهاتەی سیستمی حوکمی دیموکراسییە، وەک هەڵبژاردنی کێبەرکێکارانە یا ڕۆژنامەی سەربەخۆ، چونکە ئەم جۆرە لیستانە دەمانگێڕنەوە بۆ بەراوردکاریی نێوان "بەڵێ- نەخێر"، بە ئامانجی ئەوەی جیاکاری بکات لە نێوان ئەوەی هەموو دیموکراسییەکان لە هەموو نادیموکراسییەکان جیاواز دەکات. لەجیاتیی ئەوەش، پێویستیمان بە جیاکاریی ئەو ئاستانە دەبێت، کە جموجووڵی سیستمێکی حوکمڕانی بەرەو دیموکراسی زیاتر یا کەمتر ڕوون دەکاتەوە. بەلانیکەمی هەروەکو تاتۆ ڤانهانین ئەندازەی گرتووە، لە ئاستی ئازادیی ڕۆژنامەگەری و گۆڕان لە مەودای بەشداربوون لە هەڵبژاردنی کێبەرکێکارانەدا پێویستیمان بە وەرچەخان دەبێت. بەڵام تەنانەت ئەو پێوەرە چالاکانەش سەرنجمان بۆ ئەو ڕژێمانە ڕادەکێشن، کە هێندێک ڕۆژنامەی نیشتمانی

Charles Tilly, ed., Citizenship, Identity and Social History. Cambridge: Cambridge University Press. 1995.

هەیە و هەڵبژاردنی کێبەرکێکارانەی تێدا ئەنجام دەدرێ.
شێوازی نموونەیی ئەوەیە کە ئاماژەی ئەوتۆمان هەبێت، لەسەر گشت رژێمەکان پیادە ببێت، لەوپەڕی دیموکراسییەوە بۆ ئەوپەڕی نادیموکراسی، ئەمە چەند ئاماژەیەکی بەکار و کاریگەرە:
فراوانبوون: زیادبوون (کەمبوون)ی ئەو بەشەی دانیشتووان لە چوارچێوەی ئەو مافانەی دەکرێ لە ڕووی یاساییەوە بسەپێنرێن، مافی ئەوەی هەیە سکاڵانامە لەسەر بەجێهێنانی حکومەت بگەیەنێتە بەرزترین بەرپرس.
یەکسانی: دابەزین (بەرزبوونەوە)ی ژمارەی ئەو بەندە یاساییە ڕوونانەی مافی کەرتە جیاوازەکانی دانیشتووان بەرامبەر بە دەوڵەت و ئەرکەکانی دیاری دەکەن.
پاراستن: کەمبوونەوە (زیادبوون)ی ڕێژەی زیندانییەکان بەبێ ئەوەی بڕیارێکی یاساییان بۆ دەرکرابێت یا بێئەوەی بتوانن پەنا بۆ دادگا بەرن.
راوێژی دەربەستبوونی بەرابەر: زیادبوون (کەمبوون)ی ژمارەی سکاڵای هاوڵاتیان دەربارەی پێنەدانی ئەو بەرژەوەندییانەی بە یاسا پێیان دراوە و دەبێتە مایەی ئەوەی ئەو سوودەیان پێبگات.
کۆمەڵە زانیارییەکی چاپکراو نییە کە ئەو ڕێوشوێنانەی بۆ ژمارەیەکی گرنگ لە سیستمی حوکمڕانی لەخۆگرتبێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی هەڵسەنگاندن دەکەن، لە ناوکۆی هەڵسەنگاندنەکانیان بۆ مافە سیاسی و ئازادییە مەدەنییەکان لەسەر ئەو پێوەرانەی لە ١ تا ٧ پێکهاتوون، بە ڕاستی چارەسەری زانیاریی تایبەت بە خودی ئەم گۆڕانکارییانە دەکەن٦ . ئەوەی لەم کتێبەدا ماوەتەوە و لەجیاتیی هەوڵی پەیداکردنی کۆمەڵەیەکی نوێ لە هەڵسەنگاندنی ژمارەیی، بەوەندە وازدەهێنم ئەو بڕیارانە وەربگرم، کە لە سەرچاوەگەلێکی وەک خانەی ئازادییەوە دەرچوون، لەگەڵ مێژووە سیاسییەکان و حوکمە تایبەتەکانی خۆم دەربارەی وەرچەرخانەکانی بواری دیموکراسی و نادیموکراسی ڕێکیان بخەم و پێکەوە گرێیان بدەم.
سویسرای سەرسوڕهێنەر
لێگەڕێن با ببینین، بۆ نموونە، ئاخۆ دەتوانین مێژووی ئاڵۆز و دژواری سیاسیی سویسرا بۆ شتێکی لە بابەت کۆمەڵە تێبینییەکی ڕێکوپێک لەسەر بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی بگۆڕین؟ پیادەکردنەکانمان لەسەر سویسرا وەک وڵاتێکی تا ڕادەیەک نادیار جێبەجێ دەکەین، کە ئەزموونی خۆی لەسەر بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی هەیە:
بە سەرنجدانێکی ورد لە مێژووی سویسرا لە نێوان کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم و ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم دەتوانین ئەو پرسیارانە ڕوون بکەینەوە، کە تا هەنووکە لەم بەشەدا قوت بوونەتەوە: چۆن

6 - Raymond Duncan Gastil: “The Comparative Survey of Freedom: Experiences and Suggestions,” in Alex Inkeles, ed., On Measuring Democracy: Its Consequences and Concomitants. New Brunswick, NJ: Transaction. 1991.

دەتوانین بەدواداچوون بۆ بزاوتی ڕەهەندی دیموکراسی- نادیموکراسی بکەین، ئاخۆ ئەو سیستمانەی سەبارەت بە دیموکراسییەت چوونەتە بواری شیانەوە، زیاتر ڕووبەڕووی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی دەبنەوە، ئاخۆ بەرپاکردن و لەنێوبردنی، بە جیاوازی فۆرمەکانی بەرهەڵستی لە نێوان دەسەڵاتی دەوڵەت و توانای هاوڵاتیان، بە خێرایی جیاواز ڕوو دەدەن؟
ئەزموونی سویسرا بە هۆی ئەو گریمانە باوەی کە سویسرا دیموکراسییە دێرینە لۆکاڵییەکەی ناوچەی ئەڵب-ی لە فۆرمی سیستمی نیشتمانی دارشتەوە و بە هۆی شایستەیی سویسرا وەک وڵاتێکی هێمنی ڕێکخراو کە بەخۆیەوە دەنازێ، لە گشت ئەو بوارانەدا هێندێک ناکاوی لەخۆ گرتووە. لە ڕاستیدا هەنگاونان بەرەو دیموکراتییەت سویسرای لە دابەشبوونێکی تەواو نزیک خستەوە و دوو دەیەی بە شەڕی ناوخۆوە تێپەڕاند.
شۆڕشی فڕەنسی پەیوەندیی ئابووری و سیاسیی نێوان فڕەنسا و سویسرای لەق کرد و چاوی گەلی سویسرای لەسەر شێواز و پرەنسیپە تازەکانی فڕەنسا کردەوە. لە ساڵی ١٧٨٩ بەدواوە بزووتنەوە شۆڕشگێڕەکان لە زۆربەی ناوچەکانی سویسرا دەستیان بە کار کرد و لە ساڵی ١٧٩٣دا جنێڤ (لە یەکێتیی سویسرا ئەندام نەبوو، بەڵکو پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ سویسرا هەبوو) ڕووبەڕووی شۆڕشێکی لە بابەت شۆڕشی فرەنسی بوویەوە. کاتێکیش لە سەرەتای ساڵی ١٧٩٨دا هەڕەشەی داگیرکاریی فڕەنسا باڵای دەکرد، بال (Basel) و ڤاود (Vaud) و لۆسرن (Lucerne) و زوریخ (Zurich) و هەرێمەکانی دیی سویسرا ڕێگەی شۆڕشگێڕانەیان گرتەبەر، بۆ نموونە "بال" لە دەستوورێکەوە کە تەنها دانیشتووانی پایتەخت لە هەموو دانیشتواندا ئەندامانی ئەنجومەنی کانتۆنیان هەڵدەبژارد، بۆ دەستوورێکی دی وەرچەرخا، کە مافی یەکسانیی نوێنەرایەتیکردنی بە دانیشتووانی شار و گوندەکان دەبەخشی.
لە ساڵی ١٧٩٨دا فڕەنسا کە بەرەو پاوانخوازی دەڕۆیشت، بە هاوکاریی شۆڕشگێڕە سویسرییەکان سویسرای داگیر کرد. لە سایەی باڵادەستیی فڕەنسادا حکومەتێکی سەنترالیزم و مافی هاوڵاتیبوونی زیاتر تەبەنی کران. سیستمە تازەکە سەرزەمینی کانتۆنەکانی سانت گالن (St. Gallen) و گریسۆنس (Grisons) و سۆرگەو (Thurgau) و تیسینۆ (Ticino) و ئاراگەو (Aargau) و ڤاود (Vaud)ی بە یەکسانی لەگەڵ کانتۆنە کۆنەکان دەگرتەوە، بەڵام شێوازی شۆڕشگێڕانەی فڕەنسیی پیادە دەکرد، بەوەی کانتۆنەکانی بۆ یەکەی ئیداری و هەڵبژاردن گۆڕی. بەڵام حکومەتی ناوەند بە ناجێگیری مایەوە و تەنها لە ساڵانی نێوان ١٨٠٠ و ١٨٠٢ چوار کودەتا تیایدا ڕوویدا و لە دوای پاشەکشێی هێزەکانی فڕەنسا لە ساڵی ١٨٠٢، شۆڕشی زۆری تیا هەڵایسا. سویسرا زۆر بە خێرایی لە لێواری شەڕ نزیک بوویەوە، بۆیە ناپلیۆن دەستی تێخست و ساڵی ١٨٠٣ دەستوورێکی تازەی سەپاند و ئەوەش وڵاتی

بە یەکپارچەیی هێشتەوە.
ساڵی ١٨٠٣ سیستمی حوکمڕانی کە لە مێژووی سویسرا بە "میانگیری چاکسازی" (The Meditation) ناسراوە، دەسەڵاتێکی تا ڕادەیەک باشی بۆ کانتۆنەکان گێڕایەوە، بەڵام دامەزراندنی سیستمی کۆن بە هیچ شێوەیەک نەگەڕایەوە. یەکێتیی سویسرا (فۆرمۆڵە کرایەوە) لە ڕێگەی ئەنجومەنێکی نیشتمانی و فرەیی زمانی فەرمی و یەکسانی ڕێژەیی نێوان کانتۆنەکان و ئازادیی هاموشۆی هاوڵاتیان لە کانتۆنێکەوە بۆ کانتۆنێکی دی وڵاتی بەڕێوە دەبرد. سەرباری هێندێک هەموارکردنەوە لە هەرێمەکان، کەچی دەستەیەکی یاسادانانی ناوەندیی لاواز و دادگا و دەسەڵاتی جێبەجێکردن توانییان خۆیان ڕابگرن و لە دوای شکستی ناپلیۆنیش بمێننەوە، بەڵام دوای ئەوەی وڵات جارێکی دی لە شەڕی ناوخۆ نزیک بوویەوە و بە هۆی هێزە دەرەکییە گەورەکانەوە لە نێوان ١٨١٣ و ١٨١٥ خۆیان لێپاراست، ئەو دامەزراوانەش هەر مانەوە.
لە ناوکۆی چارەسەری شەڕی ١٨١٥دا، نەمسا و فرەنسا و بریتانیای مەزن و پورتوگال و ڕوسیا و ئیسپانیا و سوید، لەسەر بەستنی پەیماننامەی نێوان ٢٢ کانتۆن ڕازی بوون (لەپاڵ ڤالیە "Valais" و نیوچاتل "Neuchatel" و جنیڤ) کە پێی دەوترێ "پەیماننامەی یەکێتی"، چونکە ئەو وڵاتانە بێلایەنیی هەمیشەیی سویسرا و پاراستنی سنوورەکەیان زامن دەکرد.
ئەم پەیماننامە فیدراڵییە تازەیە، بە بەراورد لەگەڵ ماوەی باڵادەستیی فرەنسا، دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندیی زۆر لاواز کرد، حوکم لە سویسرا لە ماوەی جێبەجێکردنیدا بەبێ دەزگایەکی هەمیشەیی فەرمانبەران، سوپایەک لە کرێکاران و دراوێکی یەکگرتوو، پێوەرە یەکگرتووەکان یا ئاڵای نیشتمانی، بەردەوام بوو. هەروەها دەبوایە "پەیماننامەی فیدراڵی" بەرهەڵستیی زۆرێک لە بەربەستە ناوخۆییەکانی گومرک و سەرمایەی سوڕاوە و مشتومڕی هەمیشەیی نێوان نوێنەرانی کانتۆنەکان بکات، ئەو نوێنەرانەی مافی ئەوەیان نەبوو لە ڕێنمایی بازنە لۆکاڵییەکانی هەڵبژاردن دەربچن. لەسەر ئاستی گشتیی نیشتمانیشدا سویسرییەکان لە سایەی سیستمێک دەژیان زیاتر ڕوو لە نارەزایەتی بوو تا ئەوەی ڕووی لە گۆڕانێکی لێکتێگەیشتنی سیستماتیکانە بێت.
لە سەروبەندی شۆڕشی تەمووز/ یۆلیۆی ١٨٣٠ لە فرەنسا، دژایەتیکردنی ئەکلیرۆس یا پیاوانی ئایینی، بەرجەستەترین سیمای ڕادیکاڵە سویسرییەکان بوو. مێژوونووسانی سویسرا لە سییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا ئاخاوتنیان لەسەر بزووتنەوەی نوێی ڕابوون دەکرد کە "بە جاڕدان و لە ڕێگەی یانەکان و بە ڕێپێوانی بەکۆمەڵ" لە زیندووکردنەوەیدا کارا بوون پشێوییە سیاسییەکانی نێوان ١٨٣٠ و ١٨٣١، جۆشێکی مەزنی لە دەرکردنی نامیلکە و گۆڤاری وەرزی[7] لەگەڵ خۆیدا هێنایە ئاراوە. ئەو لیبراڵانەی لە دەسەڵات بوون، لە چوارچێوەی هەر کانتۆنێکدا دەستیان کرد بە دەرکردنی

7 - Georges Andrey: "La quête d'un État national," dans: Jean-Claude Fayez, ed., Nouvelle Histoire de la Suisse et des Suisses. 2e ed. rev, et augm ( Lausanne: Payot, 1986). pp. 551-552.

بڕیاری ڕیفۆرمە بەناوبانگەکانی سەدەی نۆزدەهەم، وەک: قەدەغەکردنی کارکردن بە منداڵان و کردنەوەی زیاتری خوێندنگەی گشتی. لەگەڵ ئەوەشدا دەستوورەکانی کانتۆنە تازەکان کە لە ماوەی ئەو مۆبێلیزەیەدا دانران، زیاتر پێداگرییان لەسەر ئازادی و برایەتی دەکرد تا ئەوەی پێداگری لەسەر یەکسانی بکەن.

لە نێوان ١٨٣٠ و ١٨٤٨دا سویسرا کۆمەڵێک شێوازی سیاسیی ناکۆک و دژبەیەکی بەخۆیەوە بینی. بێگومان لەگەڵ ئەوەی ململانێکانی ئەو دەمە زۆرێک لە لایەنگرانی دیموکراسی بەخەبەر هێنایەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا پرەنسیپ و چەمکەکانی دیموکراسی لە دژی یەکتری هان دەدا، لە لایەکەوە، بە شێوەیەکی گشتی، ئەوانەی بەرگرییان لە ئازادی دەکرد، پێیان وابوو: پێویستە هەر گوند و شار و کانتۆنێک - یا بەلانیکەمەوە پیاوە پێگەیشتووە موڵکدارەکان- ئازاد بن لەوەی چارەنووسی بەکۆمەڵی خۆیان دیاری بکەن، لە لایەکی دی، لەنێو لایەنگرانی دیموکراسیی نوێنەرایەتیدا خەڵکانێکمان لەسەر ئاستی نیشتمانی بەدی دەکرد، کە ڕای بەرگریکارانیان لە ئازادیی سەرزەمینە بەرزەکان ڕەتدەکردەوە و دەسەڵاتێکی بەرفراوانی دەوڵەت و یەکسانیی نێوان هەموو سویسرا و ئەو پاراستنەی دەسەڵاتەکانی فیدراڵی پیرۆزیان دەکرد و ئەنجامدانی ڕاوێژی نیشتمانی کە هەموو بەشەکانی یەکدەخست و پێکەوەی دەبەستەوە، پەسەند دەکرد.

لە پشت دابەشبوونەکەی نێوان هەردوو لایەنەکە، دابەشبوونی دی لە ئایین و چینەکان و چوونەپاڵ چوارچێوەی ڕێکخستنی سەرمایەداری خۆی مت کردبوو. ئەو کانتۆنە دەوڵەمەندانەی ڕێژەیەکی زۆر لە پرۆتستانتەکانی وڵاتی تێدابوو، لە پێناو گەیشتن بە دیموکراسی خەباتیان دەکرد. ئەو کانتۆنانە دامەزراوەی نوێنەرایەتییان لەبری دیموکراسیی ڕاستەوخۆی پیاوان دامەزراند، کە ماوەیەکی دوورودرێژ لە کۆمەڵگەی بەرزاییەکان و کانتۆنەکانی باڵادەست بوو. چالاکوانانی ئەو کانتۆنانەی دواتر ڕیفۆرمیان تیا کرا، بە بەکارهێنانی هێزی چەکدار ڕووبەڕووی ئەو دراوسێیانەیان بوونەوە، کە ڕیفۆرمی دیموکراسیی نوێنەرایەتیان پێنەگەیشتبوو، بەوەی سەرەتا لە سنووری کانتۆنەکانەوە هەڵمەتیان دەست پێکرد، پاشان بۆ ماوەیەکی کورت شەڕێکی ناوخۆی کراوەیان هەڵایساند.

مەسەلە سیاسییەکانی وڵات زۆر توند بوویەوە، لەبەر ئەوەی هاوپەیمانییە نیشتمانییەکانی ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی نۆزدەهەم، لە چوارچێوەی ئەنجومەنی یاساداناندا کە هەر کانتۆنێک دەنگێکی هەبوو، دوازدە دەوڵەمەندترینی کانتۆن کە زۆرینەی دانشتوانەکانیان لە پرۆتستانت-لیبراڵەکان بوون، لە دژی دە هەژارترین کانتۆن کە زۆرینەی دانیشتووانەکانیان کاسۆلیک-پارێزگار بوون، وروژاند. ئەوەی جێگەی گاڵتەجاری و سەرسوڕمانە، کانتۆنەکانی بەرزاییەکان کە بە بانگەشەی دیموکراسیی ڕاستەوخۆ بە شێوازی سویسریی دەیاننازی،

زۆر دژی دیموکراتیزەکردن بوون، کە بە مانای نوێنەرایەتیکردنی پارلەمان بوو لەسەر بنەمای گشت دانیشتووانی وڵات. ئەمە لە کاتێکدا پارێزگاران مافی کانتۆنەکانیان سەلماند و بەرگرییان لە کولتووری ئایینی دەکرد، سێ ئاستی هاوڵاتیبوون پێشبڕکێیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد: لۆکاڵی و کانتۆنی و نیشتمانی.

ئەو ململانێیەی زۆرجاران ڕەق و توندوتیژ بوو، کۆتایی نەهات. لە ساڵی ١٨٣٠ تا ساڵی ١٩٤٨ بزووتنەوە ڕیفۆرمخوازەکان لە ڤاود و تیسینۆ دەستیان بە کار کرد. لە ڕاستیدا تیسینۆ لە تەبەنیکردنی دەستوورێکی نوێ لە ٤ی تەمووز/ یۆلیۆی ١٨٣٠دا، پێش فرەنساش کەوت (Sauter ١٩٧٢). لەگەڵ ئەوەشدا شۆڕشی تەمووز/ یۆلیۆی ١٨٣٠ فرەنسا و دەنگدانەوەی لە کۆتاییەکانی ئەو ساڵە لە بەلجیکا، ڕیفۆرمخواز و شۆڕشگێڕە سویسرییەکانی هان دا. بۆیە کاتێک شۆڕشی فرەنسا و بەلجیکا ڕوویان دا، لەسەر ئاستێکی تەسک لە شار و کانتۆنەکانی ئاراگوا و لۆسیرن و سانت گالن و شافهاوسن (Schaffhausen) و سۆلۆتوڕن (Solothurn) و سۆرگۆ و ڤاود شۆڕش هەڵایسا. دوای ئەوەش کۆماریی و ڕادیکاڵەکان زۆرجار تیمی سەربازییان دروست کرد و هەوڵیان دا بە زەبری چەک دەست بەسەر هێندێک پایتەختی کانتۆنی دیاریکراودا بگرن. ئەو تیمانە لە لۆسیرن (١٨٤١) شکستیان هێنا، بەڵام توانییان ئیدارەیەکی تازە بۆ دەسەڵات لە لۆزان (١٨٤٧) و جنێڤ (١٨٤٧) و نیوشاتیل (١٨٤٨) دابنێن.

گەورەترین پێکدادانی سەربازی لە ساڵی ١٨٤٧ ڕووی دا، چونکە ئەنجومەنی فیدراڵیی سویسرا فەرمانی دا بە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی بەرگری هاوبەشی (ئەنجومەنێکی تایبەت بوو) سۆندەربۆند (Sonderbund)، کە پێش دوو ساڵ کانتۆنە کاسۆلیکەکان دروستیان کردبوو، بۆیە کاتێک کانتۆنەکانی سویسرا ئەوەیان ڕەتکردەوە، ئەنجومەنی یاسادانان سوپای بۆ فرایبۆرگ (Fribourg) و زوگ (Zug) ڕەوانە کرد (هێزەکانیان دوای شەڕێکی کەم خۆیان بەدەستەوە دا)، پاشان بۆ لۆسیرن (Lucerne) (شەڕێکی کورتخایەن ڕووی دا). ئەنجومەنە تایبەتەکە نزیکەی ٧٩٠٠٠ چەکداری هەبوو، بەڵام فیدراڵ نزیکەی ٩٩٠٠٠ سەربازی هەبوو. شەڕی ئەنجومەنی تایبەت لە پێکدادانە بچوکەکانی پێشووتر، قوربانیی کەمتری لێکەوتەوە. مێژوونووس یواکیم ڕیماک (Joachim Remak)، دەربارەی ئەم بابەتە کتێبەکەی ناو ناوە "شەڕی زۆر مەدەنییانە" شەڕەکە بە ٣٣ کوژراو لە هێزەکانی کاسۆلیک و ٦٠ کوژراو لە هێرشبەرەکان کۆتایی هات. دۆڕاندنیان بە شێوەیەکی گشتی بووە جێگیربوونی ڕۆڵی لیبراڵەکان لە سویسرا و تەبەنیکردنی وریایانەی دەستوورێکی لیبراڵیی هاوشێوەی نموونەی ئەمەریکا لە ساڵی ١٨٤٨دا. گفتوگۆکانی ئاشتی – کە ماوەیەکی دوورودرێژ بەردەوام بوو– زۆر سوودی لە دوو فاکتەری دەرەکی وەرگرت: وەرچەرخانی هێزە گەورەکانی ئەورووپا و سەرقاڵبوونیان بە شۆڕشەکانی ١٨٤٨ەوە، و نەمسا و پروسیا

و فرەنساش پێیان خۆش نەبوو هیچ هێزێکی پێشبڕکێکار دەستکەوتی سیاسی لە سویسرا بەدەست بهێنێت.
ماوەکەی دوایی لە ماوەی ئاوەدانکردنەوەی ئەمەریکای پشێو دەچوو، کە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دوای شەڕی ناوخۆ بەخۆیەوە بینی: ناڕەزایەتی لە پێکەوەژیان، لەڕووڕاوەستانە یەک لە دوای یەکەکان، بەڵام بێئەوەی لە جیابوونەوەیەکی یەکلاکەرەوانە نزیک ببنەوە. "وڵاتپەروەران"ی ١٨٤٨ ساڵانێک وڵاتیان بەڕێوە برد، بۆ نموونە، جەنەراڵ گیوم دوفۆر (Guillaume Dutour) کە سەرکردایەتیی هێزەکانی فیدراڵی دەکرد و شکستی بە ئەنجومەنی تایبەت هێنا (لە کۆلێجی تون "Thun" ڕاهێنەری لویس ناپلیۆن بوو)، زۆربەی ساڵەکانی دەیەی یەکەمی دوای جەنگ سەرکردایەتیی سوپای سویسرای دەکرد. لە نێوان ساڵانی ١٨٤٩ و ١٨٧٠دا گشت کانتۆنەکانی سویسرا دەستبەرداری ئەو یەکە بەکرێگیراوانە بوون - بە درێژایی چەندین سەدە پەیڕەوی لەو شێوازە دەکرا- کە لە دەرەوەی سویسرا خزمەتی سەربازییان دەکرد. ئیدی تەنها پاسەوانی پاپا و چەند یەکەیەکی کەمی سەربازی مانەوە، کە بەشدارییان لە بۆنەکاندا دەکرد، ئەوەیش بەها سەربازییەکانی سویسرای لە دەرەوەی سویسرا دەنواند. لەو دەمە بەدواوە، وێنەی گوندی خاوێن و شاری ڕێکوپێک لە یادەوەرییدا جێگەی ململانێ تاڵە سەربازییە نەپچڕاوەکانی گرتەوە.
مێژووی پڕگرێکوێرەی سویسرا لە نێوان ساڵانی ١٧٩٠ و ١٨٤٨دا لەڕووڕاوەستانێکی جیدی لە پرسی مەسەلەی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی پێکدەهێنێت و پانتایی نێوان دەسەڵات و دیموکراسیش لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو لەڕووڕاوەستانە هاوکاریمان دەکات. وێنەی ٣-٣ بەدواداچوون بۆ ڕەوتی سەرسوڕهێنەری سویسرای نێوان ١٧٩٠ بۆ ١٨٤٨ دەکات، سەرباری دیموکراسیی ڕاستەوخۆی پیاوە پێگەیشتووەکان لە ژمارەیەک گوند و کانتۆنی بەرزاییەکاندا، بە گشتی سیستمی حوکمڕانی گەڕانی بە دەسەڵاتێکی نزمی دەوڵەت و دیموکراسییەکی ناچیز دەست پێکرد. شۆڕشی فەرەنسا لە ساڵی ١٧٩٨ بەدواوە تا ڕادەیەک دەسەڵاتی دەوڵەتێکی دیموکراسیی نابەردەوامی هێنایە ئاراوە. سویسرا ساڵی ١٨١٥ لە بەرقەرارکردنی ئاشتیدا سیستمی حوکمڕانیی دیموکراسیی لەبار برد و دەسەڵاتی دۆڕاند و لە سییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بزاوتە بەتواناکانی مۆبێلیزەکردن، بە شێوەیەکی گشتی هێندێک دیموکراسییان بەبێ دەسەڵاتێکی گەورەی دەوڵەتی ناوەند، بۆ سیستمی حوکمڕانی گێڕایەوە.
ئەو دابەشبوونەی سویسرا هەر لە سەرەتاوە لەسەر ئاستی کانتۆنەکان یا نێوان کانتۆنەکان، پزیسکی شەڕێکی ناوخۆی لێکەوتەوە، پێش ئەوەی لەسەر ئەنجومەنی تایبەت شەڕێکی ناوخۆ لەسەر ئاستی نیشتمان دروست بکات.
ساڵی ١٨٤٧ سویسرا لە بواری توانای دیموکراسیی دەوڵەتدا بۆ نزمترین ئاستی دابەزی، لەو ماوەیەدا، بە دڵنیاییەوە سویسرا

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، لە ڕووی دەسەڵاتی ناوەندییەوە، لە فڕەنسا و پروسیا و نەمسای دراوسێی نزیک نەبوویەوە، بەڵام بووە نموونەیەکی دیموکراسی ناسەنترالگەرا لە ئەورووپا.

سویسرا بەر لە ١٧٩٨، لەسەر ئاستی نیشتمان، لە دەسەڵاتی بنەڕەتیی دەوڵەت یا دیموکراسی نزیک نەبوویەوە. هەر لەو ساڵەدا داگیرکاریی فڕەنسا حکومەتێکی نیشتمانیی تا ڕادەیەک ناوەندگەرای سەپاند، لە هەمان کاتیشدا پەیوەندیی لە نێوان لایەنگرانی دامەزراندنی حکومەتێکی نوێنەرایەتیی نیشتمانی و هاوپەیمانە بەهێزە فرەنسییەکان دروست کرد. هەر لەو ماوەیەدا سویسرا پێی نایە نێو قۆناغێکی دوورودرێژی پڕ لە هەڵبەزودابەزی خێرا و توندتیژی نێوان بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسییەوە، بەتایبەتی بە هۆی نەبوونی ناوەندێتیی بوونیادی سیستمی حوکمڕانی و هەمەڕەنگی و دابەشبوونە توندەکانییەوە. بۆیە مەینەتییەکانی سویسرا لە نێوان ١٧٩٨ و ١٨٤٨ سیاسەتی نیشتمانیی والێکرد بە زەحمەت جوداییەکی ورد لە نێوان سیاسەتێکدا بکات، کە دەوڵەت و هاوڵاتیان بەڕێوەی بەرن.
چالاکوانە سویسرییەکان لە ئەنجامی ئەو دابەشبوونەدا بۆ ماوەی نیو سەدە لە شەڕدا بوون.




وێنەی ٣-٣: وەرچەرخان لە ڕژێمی ناسیۆنالیی سویسرا، ١٧٩٠ – ١٨٤٨
لەگەڵ ئەوەشدا لێرەدا دوو گشتاندن پیادە دەبن و هەموو ئەو حاڵەتانەی دی تێدەپەڕێنن، کە توێژینەوەمان بۆ کردووە: بە تێکڕایی لەباربردنی دیموکراسی لە سویسرا بە خێراییەکی گەورەتر و توندوتیژانەتر لە بەرپاکردنی دیموکراسی ڕووی دا. بە شێوەیەکی گشتی، ئەو دەستەبژێرەی خاوەنی ئیمتیازات بوو، لە دژی ئیدارەیەکی ئاشکرا بۆ زۆرینەی هاوڵاتیان پاڵپشتیی لەباربردنی دیموکراسیی دەکرد. پێکهێنانی ئەنجومەنی تایبەت لە کاسۆلیک و پارێزگاران (١٨٤٥) و بەشدارییان لە شەڕی مەدەنیی ئاشکرا لە دژی هێزە لیبراڵەکان (١٨٤٧)، لە ئەنجامی پەرچەکرداری چینی دەستەبژێردا قەیرانێکی لە سویسرا هێنایە ئاراوە. لێرەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کە بەرپاکردن و لەنێوبردنی

دیموکراسی لە سویسرا، هەروەکو شوێنەکانی دی، دوو پرۆسە و شێوازی ناچوونیەکن.
با ئەنجامگیرییەکی میتۆدییانە هەڵگۆزین. سەرباری چێژوەرگرتنمان لە مامەڵەکردن لەگەڵ پێودانگە چەندییەکانی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی و زیادبوون و نزمبوونەوەی توانای دەوڵەت لەبەر ڕۆشنایی زانیارییە هەنووکەییەکانمان، ئەوا حەکایەتە دوورودرێژەکانی شرۆڤەکردن، لەو جۆرەی پێشتر مێژووی سویسرامان پێ نمایش کردوون، زۆرێک لە ڕاڤەکاریی گشتی بۆ بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی هەڵدەگرێت، چونکە ڕێگەمان پێدەدا وەرچەرخانە سەرەکییەکان لە پەیوەندیی نێوان فاکتەرە سیاسییەکان و ئالوویرەکان لە هۆیە گریمانەییەکانی بگونجێنین. لەگەڵ ئەوەی لە بەشەکانی دی بە بەردەوامی پشت بەو هەڵسەنگاندنانە دەبەستم، کە خانەی ئازادی پێشکەشی کردوون، بەڵام لێکچوونی یەکلاکەرەوە و ڕاشکاوانە لە نێوان بیروڕا و بەڵگەکان لە شێوەی حەکایەتی ڕاڤەکارییدا دەردەکەوێت.

پاشان چیتر؟

کاتی ئەوە هاتووە بەرەو ڕاڤەی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی هەنگاو بنێین. بە شێوەیەکی تا ڕادەیەک هەڕەمەکی ژمارەیەک پرسیاری هەنووکەییەمان کۆکردۆتەوە، کە لە ڕاڤەکردنەکەدا سوودمان پێدەگەیەنن. وەڵامدانەوەی هەر پرسیارێک لەو پرسیارانە، لە حاڵەتی دروستیدا، سوودێکی گەورەی بۆ توێژینەوەی دیموکراسیی مۆدێرن دەبێت (ئەگەر وەک شرۆڤەکارێکی دیموکراسی تاسەی ناوبانگی و دەسەڵات بکەم، نەک بە زەرورەت سامان، بە دیاریکراوی وەڵامی پرسیارێک یا چەند پرسیارێک دەدەمەوە). سەرباری ئەوەی پرسیارەکانم لەسەر ئاستێکی فراوان لەڕووی مێژووییەوە داڕشتووە، کەچی زۆربەی خوێندکارانی ڕابردوویەکی نزیک، بەراستی هەوڵ دەدەن توێژینەوە تایبەتەکانیان لەسەر خودی ئەو پرسیارانە بکەن. چوارچێوەی ٣-٢ دیارترین ئەو پرسیارانە پوخت دەکاتەوە، کە تا ئێستا ڕووبەڕوومان بوونەتەوە. بە دڵنیاییەوە ئەو لیستەی توێژەرانی بەرپاکردنی دیموکراسی توێژینەوەی لەسەر دەکەن، گشت پرسیارە گرنگەکان ناگرێتەوە. بۆ نموونە، خەڵکانێکی زۆر دەپرسن، تەشەنەسەندنی فەندەمانتاڵیزمی ئایینی لە نێو هاوڵاتیانی ڕژێمێکدا بەرپاکردنی دیموکراسی لاواز دەکات یا ڕێگەی لێدەگرێت، یا ئەوەی گەر دیموکراسی لە قۆناغێکدا هەبێت و سەقامگیر و بەتوانا بێت، ئیدی لەباربردنی لە توانادا نابێت یا ئەستەم دەبێت. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی، سیازدە پرسیارەکە ئەو گرفتانە پوخت دەکەنەوە، کە لە پێناوی دۆزینەوەی چارەسەر بۆیان، توێژەرانی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی ئارەزوو دەکەن بەهاترین دیاری پێشکەش بە یەکتری بکەن. لەگەڵ هێشتنەوەی پرسیارەکانی ژمارە ١ تا ژمارە ١٢ بۆ ئەوەی لە بەشەکانی دی لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ، ڕێگەم پێبدەن یەکسەر بەرەو پرسیاری ١٣ بڕۆم: حاڵەتە پێویست و ئەندازەییەکان.

بە تەنها دوورخستنەوەی ئەو حاڵەتە لە ڕووی پێناسەوە دەچێتە ڕیزی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسییەوە، پێم وانییە هیچ حاڵەتێکی پێویست و بە پلەیەکی کەمتریش ئەندازەیی نامێنێت. هەروەکو پێشتر بینیمان، بەراوردکاریی ئەو حاڵەتانەی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی تێیدا ڕوو دەدا لەگەڵ حاڵەتی وێکچووی دی کە تێیدا ڕوو نادات، ڕەنگە ئەوە ڕوون بکاتەوە، کە پێویستە لەسەرمان ڕاڤەی بکەین. بەلانیکەمەوە تا ئێستا کەس نەیتوانیوە ئەم جۆرە حاڵەتانە دیاری بکات.

چوارچێوەی ٣-٢: پرسیارگەلێک دەربارەی سوود و قازانجەکانی لێکۆڵینەوەی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی

١- ئەو شێوازانە چین، کە دامەزراوە دیموکراسییە دابڕاوەکان لە دەوڵەت- شار (city - states) پێشکەشیان کردووە،و تیمە شەڕکەرەکان، کۆمەڵەی جوتیاران، توێژە بچوکەکانی بازرگانی، گروپە ئایینییەکان و بزووتنەوە شۆڕشگێڕەکان، نموونەگەلێکن لە فۆرمەکانی دیموکراسی بەرفراوان؟ لەگەڵ بوونیان، بۆچی لەسەر ئاستی نیشتمان، داڕێژگە ڕاستەوخۆکانی دیموکراسی نەگۆڕان؟

٢- بۆچی ئەوروپای ڕۆژئاوا ڕێگەی بەرەو بەرپاکردنی دیموکراسی بڕی و هەردوو ئەمەریکاکەش بە وردی شوێنیان هەڵگرت؟

٣- چۆن وڵاتانی وەک فرەنسا لە بەرگرییەکی ڕەهای دژ بە دامەزراوە دیموکراسییە نیشتمانییەکان بەرەو هەڵبەزودابەزی چەندبارەی نێوان بەرپاکردن و لەنێوبردنی جوڵاون (و دەجووڵێن)؟

٤- بۆچی بە شێوەیەکی گشتی، زریانی لەباربردنی دیموکراسی خێراتر لە بەرپاکردنی دیموکراسی ڕوو دەدا؟

٥- چۆن لە پێناو بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسیدا ڕاڤەی شێوازە پشتگیرییە ناچوونییەکەکان دەکەین؟

٦- بۆچی بەرپاکردنی دیموکراسی بە هەمان شێواز (نموونە) لەسەر شێوەی شەپۆل ڕوو دەدا، نەک بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە هەر سیستمێکی حوکمڕانی و بەپێی تێکڕای خێراییە تایبەتەکەی؟

٧- بە چی بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی لە خاڵی دەسپێکیانەوە بۆ ناوچەکانی دیی جیهان لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم (بەتایبەتی) ڕاڤە دەکرێ؟

٨- بۆچی (جگە لە میسر و ژاپۆن بە شێوەیەکی هەندەکی) بەرپاکردنی دیموکراسی بە تەنها لە دوای جەنگی جیهانیی دووەمەوە بە ماوەیەک لە ئاسیا و ئەفەریقیا دەستی پێکرد؟

٩- چۆن بتوانین مەینەتییە دراماتیکییە جیاوازەکانی وڵاتانی پۆست سۆسیالیزم لەگەڵ بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی شیبکەینەوە؟

١٠- لە سایەی چ هەلومەرجێک و تا چ مەودایەک و چۆن گەورەبوونی توانای دەوڵەت هانی لێهاتوویی سیستمی حوکمڕانی دەدا لە بەرپاکردن و خستنی دیموکراسیدا؟

١١- تا چ مەودایەک و چۆن کارلێکی سیستمی نادیموکراسی لەگەڵ سیستمی دیموکراسی هانی بەرپاکردنی دیموکراسی دەدا؟
١٢- شێوە و سەرچاوە سروشتییە نەگۆڕەکانی وڵاتان (وەک کشتوکاڵ و کانەکان یا بازرگانی) چۆن کاریگەرییان دەبێت لە ئەگەری ڕووبەڕووبوونەوەی سیستمە حوکمڕانەکەی لە بەرپاکردن و خستنی دیموکراسیدا؟
١٣- ئایا هەلومەرجی پێویست و تەواوی بەردەست بۆ بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی هەیە، یا (بە پێچەوانەوە) ئایا هەلومەرجە لەبارەکان بەپێی قۆناغی زەمەنی و هەرێمایەتی و شێوازی سیستمی حوکمڕانی زۆر جیاواز و هەمەڕەنگ دەبن؟

لەو باوەڕەدام هێندێک شێوازی پێویست هانی بەرپاکردنی دیموکراسی دەدەن و بە پێچەوانەی ئەو شێوازانەشەوە هانی لەباربردنی دیموکراسی دەدەن. با بە شێوەیەکی کاتی چاو لە لێدانی دیموکراسی بپۆشین و جەخت لەسەر بەرپاکردنی دیموکراسی بکەینەوە بۆ ئەوەی ئەو بیرۆکەیە ڕوون بکەینەوە، کە بە ڕاستی دەزانین. بۆ ئەوەی دیموکراسی لە سیستمێکدا دامەزرێت، پێویستە گۆڕانکاری لە سێ بواردا ڕوو بدات: تۆڕەکانی متمانە، نایەکسانیی چینایەتی و نێوەندە سەربەخۆکانی دەسەڵات.
تۆڕەکانی متمانە (Trust Networks): بریتین لە پەیوەندیی لقوپۆداری نێوان کەسەکان. بە شێوەیەکی سەرەکی لەو هاوبەندییە توندوتۆڵانە پێکدێن، کە خەڵکی لە چوارچێوەیاندا سەرچاوەی سامان و پرۆژە ئابوورییەکانیان دەخەنە ژێر مەترسیی سەرپێچی و هەڵە و شکستی ئەوانی دییەوە، بازرگانی بانکیشوەر (یا ئەوەی بە بازرگانی پەرش Trading Diasporas ناسراوە)، کۆمەڵەی خزمان، گروپە ئایینییەکان و شۆڕشگێڕە پیلانگێڕەکان و فەرمانگەکانی قەرزدان، زۆرجار تۆڕی متمانە لەخۆ دەگرن. لە زۆربەی قۆناغە مێژووییەکاندا، ئەوانەی مامەڵەیان لە تۆڕەکانی متمانەدا دەکرد، بە دوورکەوتنەوەی تێکەڵبوونیان لە سیستمی سیاسی، بە وریاییەوە مەترسییان لە خۆیان دوور دەخستەوە، نەوەکو فەرمانڕەواکان دەست بەسەر سامانە بەنرخەکانیاندا بگرن یا مل بە بەرنامەی دەوڵەت بدەن. بەڵام لە گۆشەگیرییەکی تەواو لە سیستمی حوکمڕانی، بەربەست لە بەردەم بەرپاکردنی دیموکراسی پێکدەهێنن، چونکە گۆشەگیرییان ڕێگە دەگرێت ئەندامەکانیان بە پرۆژە بەکۆمەڵەکانی دیموکراسییەوە پابەند بن و بڵاوبوونەوەی دیموکراسیش کاتێک لەبار دەبێت، کە تۆڕەکانی متمانە بە قووڵی لەگەڵ سیستمی حوکمڕانیدا تێکەڵ دەبێت، بەوەش ئەندامانی هان دەدا بچنە نێو ڕاوێژی دەربەستبوونی بەرابەرەوە، ڕەزامەندیی هاوڵاتیان مەرج لەسەر ئەو بەرنامانە دادەنێت، کە دەوڵەت پێشنیازیان دەکات یا بەیاساییان دەکات٨، بۆیە لێرەدا دوو ڕێبازی بەرفرە هەیە، کە کاریگەرییان لەسەر تۆڕەکانی متمانە هەیە و بناغەی بەرپاکردنی

8 - Tilly: Trust and Rule.

دیموکراسیش پێکدەهێنن: ١- هەڵوەشانەوە یا کۆکردنەوەی تۆڕە گۆشەگیرەکانی متمانە، ٢- دروستکردنی تۆڕی متمانە کە لە ڕووی سیاسییەوە بەیەکەوە گرێ درابن. لە سویسرا بزووتنەوەی تێکۆشانی توندوتیژ لە نێوان ساڵانی ١٨٣٠ و ١٨٤٧ و چارەسەری ئاشتییانە لە ساڵی ١٨٤٨، هەردوو ڕێبازەکەی دروست کرد.

لەنێو ئەم دوو ڕێبازەدا زنجیرەیەک میکانیزمی دووبارەبووەوە دەردەکەون، بۆ نموونە:

- هەڵوەشانەوەی تۆڕە گۆشەگیرەکانی متمانەی وڵات (دابەزینی توانای سایەدارەکان – بۆ نموونە- لە پێدانی کەلوپەل بە بەرکارەکان و پاراستنیان، دەبێتە مایەی کشانەوەی بەرکارەکان لە هاوبەندییەکانی نێوان هەردوولا).
- زیادبوونی ژمارەی ئەو خەڵکانەی ناتوانن لە پێناو پرۆژە دوورمەودا و گەورە مەترسیدارەکانیان بە تۆڕە کاراکانی متمانە ڕابگەن (ژمارەی کرێکارە نەدارەکان – بۆ نموونە- لە ناوچە گوندنشینەکاندا لە ژمارەی ئەو خەڵکانە زیاترن، کە پەیوەندییان نییە بە خاوەنکارە بەهێزەکان و/ یا پەیوەندیی هەرەوەزیی بەرابەریان نییە).
- دەرکەوتنی دەرفەت و هەڕەشەی نوێی دوورمەودای پرمەترسی کە تۆڕە باوەکانی متمانە ناتوانن مامەڵەی لەتەکدا بکەن (زۆربوونی – بۆ نموونە- جەنگ و برسێتی و نەخۆشی و/ یا دزێتی و چەتەگەری، توانای خاوەنکارەکان لەسەر پاراستن و کۆچکردن و هاوکاریی لۆکاڵی لاواز دەکات).

ئەم سێ میکانیزمە تۆڕەکانی متمانەیان لە سویسرا لە نێوان ١٧٥٠ و ١٨٤٨ دروست کردەوە. لە سەدەی نۆزدەهەمدا گەشەکردن لە بەرهەمهێنانی کۆتاڵ لە کۆلێتی گوندەکاندا پێش سەنترالیزەکردنەوەی شارەکانی سەرزەمینە نزمەکان کەوت بە زیوریخیشەوە. ئەو وەرچەرخانە پیشەسازییە کە بە دوو قۆناغ ئەنجام درا، قەوارەی چینی پرۆلیتاریای گەورە کرد لەگەڵ لەقکردنی چینی سایەداران و کۆنترۆڵی موڵکدارەکان و قەشەی پاریشەکان٩ (parish). داگیرکارییە یەک لە دوای یەکەکانی فەرەنسا و چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان لە ساڵی ١٨١٥ لە لایەن زلهێزەکانەوە و بزاوتە شۆڕشگێڕەکان لە نێوان ١٨٣٠ و ١٨٤٧، خۆی لە خۆیدا کاریگەری دووانەییان هەبوو: پەیوەندیی کۆنی نێوان تۆڕەکانی متمانە و سیاسەتی گشتی لەسەر ئاستی کانتۆنەکان جێی پێ لەق بوو، بەڵام – بەلانیکەمەوە سەبارەت بە پرۆتستانت و لیبراڵە سەربەخۆکان- پەیوەندیی نوێ بەدی دەکرا لە نێوان تۆڕەکانی متمانە و نێوان کەس

9 - (Braun 1960, 1965; Gruner 1968; Gschwind 1977; Joris and Witzig 1992; Rosenband 1999).

هەروەها بڕوانە:

Elisabeth Joris: "Auswirkungen der Industrialisierung auf Alltag und Lebenszusammenhänge von Frauen im Zürcher Oberland (1820–1940)," in Joseba Agirreazkuenaga and Mikel Urquijo, eds., Historias Regionales – Historia Nacional :La confederación Helvetica. Bilbao, Spain: Servicio Editorial ,Universidad del País Vasco. 1994.

و ڕژێمی نیوە تازە، کە لەسەر ئاستی نیشتمانی لە چوارچێوەی هاوپەیمانی پرۆتستانتی – لیبراڵی، خەریک بوو دەردەکەوت.
ئەو سێ میکانیزمەی باسیان لێوە کراوە، هەڵوەشانەوەی تۆڕە گۆشەگیرەکانی متمانە و دامەزراندنی تۆڕی متمانە کە لە ڕووی سیاسییەوە پێکەوە گرێ درابن، خێراتر دەکات. بەشەکەی دواتر دیدێکی وردەکارانەتری هەیە لەسەر ئەو شێواز و میکانیزمانەی کاریگەرییان لەسەر جیابوونەوە و تێکەڵبوون لە سیاسەتی گشتیدا هەیە.
چ شتێک لەسەر نایەکسانیی چینایەتی؟ ئەم زاراوەیە مانای ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتییە دەربارەی ئەو سنوورانەی هەموو گروپەکانی دانیشتووان لێکجیادەکاتەوە، کە دەرفەتی ژیان بە تەواوەتی لە بەردەمیاندا جیاواز دەبێت، هەمان حاڵەتیش سەبارەت بە چین و پێکهاتەکانی هەیە لە ڕووی ڕەگەز و جێندەر و چین و ئەتنی و نەتەوایەتی و ئایینی و هێندێک کەڕەتیش لە ڕووی پێگەی کۆمەڵایەتییەوە. سەبارەت بە وەرگێڕانی ڕاستەوخۆی ئەو جیاوازییانە بۆ جودایی چینایەتی لە ماف و پابەندبوونی سیاسی، ئەوا بەرپاکردنی دیموکراسی دەبێتە کارێکی ئەستەم. هەر ڕێبازێک بۆ بەرپاکردنی دیموکراسی بە زەرورەت پشت بە کەمکردنەوەی جیاوازیی چینایەتی نابەستێت، بەڵکو پشت بە دوورخستنەوەی سیاسەتی گشتی لەم جیاوازییە چینایەتییە دەبەستێت. دوو ڕێبازی سەرەکی بەشداریی لەم گۆشەگیرییە دەکەن: یەکسانی خودی چینەکان لە هێندێک بواردا و ڕێنەدان و دوورخستنەوەی سیاسەت لە کاری ئەو چینانە.
ئەمەش جۆرەکانی ئەو میکانیزمانەن، کە لە چوارچێوەیەکی فراوانی یەکسانی و ڕێنەدان کار دەکەن:

• یەکسانی لە بەرژەوەندییەکان و/یا خۆشنودیی نێوان چینەکان بە شێوەیەکی گشتی لەناو دانیشتواندا (بۆ نموونە، زیادبوونی داواکاری لەسەر بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی جوتیاران قەوارەی جوتیارانی چینی ناوەنجی گەورەتر دەکات).
• کەمکردنەوە لە، یا ڕێگەگرتنی حکومەتەکان لەو هێزە چەکدارانەی فەرماندەیی تایبەتیان هەیە (بۆ نموونە، هەڵوەشانەوەی سوپای تایبەتی سەرکردە دەستڕۆیشتووەکان، باڵادەستیی خانەدانەکان بەسەر عەوامدا لاواز دەکات، بەوەش دەسەڵاتی خانەدانەکان لاواز دەبێت و جیاوازیی نێوان خانەدان و عەوام ڕاستەوخۆ بۆ سیاسەتی گشتیی وڵات دەگۆڕێت).
• تەبەنیکردنی ئەو ئامرازانەی سیاسەتی گشتی لە جیاوازیی چینایەتی دادەبڕن (بۆ نموونە، دەنگدانی نهێنی، پێدانی مووچەی فەرمانبەران، ئازادی و یەکسانی لە گەیشتنی پاڵێوراوەکان بە دەزگاکانی ڕاگەیاندن، هانی دامەزراندنی پرۆسەی هاوپەیمانی نێوان چینەکان دەدات).

ئەمە و میکانیزمە هاوشێوەکانی ڕۆڵێکی دیارییان لەو مێژووەی سویسرا گێڕاوە، کە نمایشمان کردوون. ئەو سیستەمەی ١٨٤٨ لە سویسرا دامەزرا، بەربەستی کارای لە نێوان سیاسەتی گشتی و ئەو جیاوازییە چینایەتییە

دانا، کە بووە هۆی یەکترکوشتنی چالاکوانە سویسرییەکان لە حەڤدە ساڵی ڕابردوودا.
هەروەها نێوەندە سەربەخۆکانی دەسەڵات، لە دەرەوەی کۆنترۆڵی سیاسەتی گشتیی وڵات و لە دەرەوەی پەیوەندیی سیستماتیکانە و کارلێکی نێوان هاوڵاتی و دەوڵەت کار دەکەن. دەتوانن هەموو پەیوەندییەکانی نێوان ئەو کەسانە لەخۆ بگرن، کە توانای گۆڕین بە ڕەگەزە سیاسییەکان -تاکەکان و کەرتەکانی هاوڵاتیان- دەبەخشێت - یا لەم بارەیەوە پاراستنی- دابەشکردنی سەرچاوە هەنووکەییەکانی سامان و دانیشتووان و چالاکییەکانیان لە چوارچێوەی سیستمی حوکمڕانیدا. هێندێ جاریش لەنێو خودی سیستمدا دەبینرێن، ئەمەش کاتێک بە ڕوونی دەردەکەوێت، کە سەربازەکان کاروباری دەوڵەت بەڕێوە دەبەن یا لە دەرەوەی دەسەڵاتی مەدەنیدا کار دەکەن. ئەو فۆرمە یەکانگیرە لە پێکهێنانی ڕەگەز و توێژی ئایینی و ڕێکخراوی ئابووری و گروپی ئۆرگانیزەکراو و هێزی سەربازیی لە سیستمێکی حوکمڕانیدا کاریگەرییەکی زۆری دەبێ لە ئاڕاستەکردنی ئەو سیستمە بەرەو ئیدارەی ڕاوێژی فراوان و یەکسان و پارێزراو و دەربەستبوونی بەرابەر، لەبەر ئەوەی ئەو ڕێکخستنە ڕەگەزە سیاسییە ئامادە هەمەجۆرەکان دەگونجێنێت و لەبەر ئەوەی کاریگەریی دەبێت لەسەر هەر کەرتێک لە کەرتە ئامادەکانی دانیشتووان بۆ بەشداریکردنی ڕاستەوخۆ لە سیاسەتی گشتیی وڵاتدا. بەو ئاستەی کە نێوەندەکانی دەسەڵات، بەتایبەتی ئەوانەی ئامرازەکانی زۆرەملێ و ناچارکردنیان لەبەردەستدایە و خودموختاری و سەربەخۆیی خۆیان هەیە، دوورەپەرێز و گۆشەگیر دەبن لە سیاسەتی گشتیی وڵاتدا، ئیدی بەرپاکردنی دیموکراسی دەبێتە کارێکی دژوار یا ئەستەم دەبێت.
ئەو میتۆدە هاندەرانەی دیموکراسی کە باس لە نێوەندە سەربەخۆ و خاوەن ئۆتۆنۆمەکانی دەسەڵات دەکەن، بریتین لە: ١- فراوانکردنی بەشداریی سیاسی، ٢- یەکسانی لە گەیشتن بە سەرچاوەکانی دەسەڵات و دەرفەتی بەکەڵک لە دەرەوەی دەوڵەت، ٣- هەڵوەشانەوەی ئەو هێزە سەربەخۆیانەی کە لە دەرەوە و ناوەوەی دەوڵەت ئۆتۆنۆمی و هێزی زۆرەملێ و ناچارکردنیان هەیە. لەگەڵ ئەوەی قەوارە و کاتنانەوەی لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی دیی بەرپاکردنی دیموکراسی جیاواز دەبن، ئەوا تا ڕادەیەک پێویستە ئەم سێ بڕگەیە ڕوو بدەن بۆ ئەوەی بەرپاکردنی دیموکراسی بەدی بێت.
میکانیزەکانی نێو ئەم میتۆدانە بریتین لە:
• پێکهێنانی هاوپەیمانێتی لە نێوان کەرتەکانی چینە فەرمانڕەواکان و ئەو ڕەگەزە سیاسییە پێکهێنەرانەی لە ئێستادا لە دەسەڵات ئاوارتە کراون (پشتگیریی ئەندامە تازەکانی بۆرجوازییە جیاوەبووەکان - بۆ نموونە- لە لایەن ئەو کرێکارانەی مافی دەنگدانیان نییە، بەوەش بەشدارییپێکردنی ئەو کرێکارانە لە کاروباری سیاسیدا تۆکمە و جێگیر دەکەن).
• جەمسەرگیریی ناوەندی یا ڕزگاربوون لە میانگیرە سیاسییە سەربەخۆکان (بۆ نموونە سەرکردەی هەرێمەکان بە چوونە نێو

هاوپەیمانە حکومییەکانەوە پابەندی بەرنامەی حکومەت دەبن).

• بانگەوازکردن بۆ بڵاوکردنەوەی هاوپەیمانێتی لە نێوان چینە نایەکسانەکان و/ یا ئەو تۆڕانەی متمانە کە گومانیان لەسەر نییە (وەک هاوکاریی سەندیکا هەرێمایەتییەکان دژ بە داگیرکردنی ماڵومولک لە لایەن دەوڵەتەوە، ڕۆڵی ئەو سەندیکایانە لە هەوڵ و کۆششە سیاسییەکانی دی تۆکمە و پتەو دەکات).

ئەو هەموو میکانیزمانە و میکانیزمی دی لە ناوکۆی وەرچەرخانی سویسرا لە دابەشبوونێکی مەزنەوە بۆ دیموکراسییەکی هەندەکیی خاوەن دەسەڵاتێکی لاواز دەجووڵان. لەوەش گرنگتر، سەرکەوتنی سەربازی و چارەسەری ئاشتییانە لە نێوان ساڵانی ١٨٤٧ و ١٨٤٨، سنووری بۆ دەسەڵاتی گروپ و کانتۆنە سەربەخۆ و ئۆتۆنۆمەکان دانا هێزە چەکدارەکانیان بڵاوە پێبکەن - کە هەر مابوونەوە.

ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە، گۆڕانی گەورە لە ژیانی کۆمەڵایەتی لە دوای گۆڕانکاریی یەکلاکەرەوانە لە تۆڕەکانی متمانە و جیاوازی و ئەو هێزانەی مل نادەن بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت، هاتە ئاراوە. لە گفتوگۆکانی دواتردا سەرنج بۆ ئەو گۆڕانانە ڕادەکێشین، کە لە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و پەیوەندیی بەکۆمەڵ و جموجووڵی میلی و پەروەردە ڕوویان دا. لە کۆتاییدا چوار شێوازی سیاسی بەهێز (ڕووبەڕووبوونەوەی ناوخۆ، زەوتکاریی سەربازی، سامان و کۆلۆنیالیزم) دەبینین، کە هەمیشە گۆڕانیان لە تۆڕەکانی متمانە و جیاوازیی چینایەتی و سیاسەتی گشتیی وڵات خێراتر کردووە. هێندێک جار ئەو شێوازانە بەرپاکردن یا لەباربردنی دیموکراسییان خێراتر کردووە.

هەموو ئەو گۆڕانکارییانە تا بە وردەکاری زیاتر کارەکانیان ئاشکرا دەکەین، بە شاراوەیی دەمێننەوە و جێگەی گومانیش دەبن. بەهەرحاڵ، لە خۆئامادەکردن بۆ بەشەکانی دواتر، باسەکەمان بە زنجیرەیەک خاڵی ڕاستەوخۆ و ڕاوشکانە ئاسان دەکەینەوە:

١- ڕەوتی سیستەمە حوکمڕانەکان لە بواری دەسەڵاتی دیموکراسیدا، کاریگەریی دیاری لەسەر هیوا و ئاواتەکانی ئەو سیستمانە دەبێت، لە لایەکەوە لە بەدیهێنانی دیموکراسی، لە لایەکی دی لە فۆرمە دیموکراسییەکەی - ئەگەر بەدی بێت.

٢- لە مەودایەکی دووردا، زیادبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت و بەرپاکردنی دیموکراسی یەکتری پتەو دەکەن، لەبەر ئەوەی گەشەسەندنی دەسەڵاتی دەوڵەت بەرهەڵستی و سازش و چارەسەری کاتیی گەورە دەکات، بەڵام بەرپاکردنی دیموکراسی هانی داواکاریی فراوانکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت دەدا بۆ ئەو دەستوەردانەی کە دەسەڵات فراوان و بەهێزتر دەکات.

٣- لە ئەوپەڕی ڕادەی هەردوو بوارەکەدا، ئەگەر دەسەڵات گەورەتر لە ئاستی خۆی و بە خێراییەکی زیاتر لە بەرپاکردنی دیموکراسی پەرەیسەند، ئەوا ڕێگەی دیموکراسی (ئەگەر هەبێت) بە فاشییەتدا تێدەپەڕێت. ئەگەر بەرپاکردنی دیموکراسیش لە فراوانبوونی

دەسەڵات و مانەوەی سیستمی حوکمڕانی، زیاتر و خێراتر پەرەبسێنێت، ئەوا ڕێگەی بوونیاتنانی توانا بە قۆناغێکی مەترسیداردا تێدەپەڕێت.

٤- سەرباری ئەوەی پەیکەری ڕێکخستن - هەڵبژاردن و مەرجەکانی دامەزراندن و نوێنەرایەتی پارلەمانی ناوچەکان، کۆمەڵەکانی وتوێژ و ڕاوێژکردن... هی دی، کە سیستمی دیموکراسی تەبەنییان دەکات، زۆرجار کۆپی دەکرێن یا سوود لەو دامەزراوانە وەردەگرێت، کە پێشتر هاوشێوەی لە گوند و شار و سەرزەمینی هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتەکەی یا لە سیستمە دراوسێکانیدا هەبووە، کەچی ڕاستەوخۆ لەو دامەزراوانەوە دروست نابێت.

٥- بەرپاکردنی دیموکراسی لەسەر گۆڕانی سێ بوار لەنگەر دەگرێ: جیاوازیی چینایەتی، تۆڕەکانی متمانە و سیاسەتی گشتی، هەروەها لەسەر کارلێکی نێوان ئەو گۆڕانکارییانەش ڕادەوەستێ.

٦- ڕێکخوازی لە ئاڕاستەکانی بەرەو دیموکراسی لە زنجیرەیەک دارەتەی گشتیی یەکگرتوو یا بەردەست پێکنایەت، بەڵکو میکانیزمی هۆکاریی دووبارەیی لەخۆدەگرێ و بە هاوکاریی ڕەگەزە جیاوازەکان و زنجیرەییان، گۆڕانکاری لە جیاوازیی چینایەتی و تۆڕەکانی متمانە و دەسەڵاتی نادەوڵەتی ڕوو دەدا.

٧- لە سایەی ئەو بارودۆخەی بکرێ دیاری بکرێ، ئەوا شۆڕش، داگیرکاری، کۆلۆنیالیزم و ڕووبەڕووبوونەوەی ناوخۆ، هێندێک لەو میکانیزمە هۆکارییە گرنگانە خێراتر و چڕتر دەکەنەوە.

٨- لانیکەم گشت ئەو میکانیزمانەی بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە هۆکاری پەرەسەندنی دیموکراسیین - بریتین لە خەباتێکی میلی، کە نوێنەرە سیاسییەکان لەسەر شێوەی داواکاری بەکۆمەڵ ئەنجامی دەدەن تا بەسەر نوێنەرانی ئەوانی دی بیسەپێنن، بە بریکارەکانی حکومەتیشەوە.

٩- سەرباری گۆڕانکاریی گرنگ لە شێوازی تایبەت بە دامەزراوە دیموکراسییەکانی وەک ئەنجومەنی یاسادانان و کاریگەریی ڕێژەیی ڕەگەزە جیاوازە دەرکەوتووەکانی وەک داننانی نێودەوڵەتی بە سیستمی دیموکراسی، شێوازە سەرەکییەکان لە تۆکمەکردنی بەرپاکردنی دیموکراسی بە درێژایی چەندین سەدە وەک خۆیان ماونەتەوە.

ئەم بیروڕایانە جەخت لەسەر بیرۆکەیەکی سەرەکی دەکەنەوە، ئەویش بەرپاکردنی دیموکراسی بەدەست نایەت بەلانیکەمەوە بەبێ بەدیهاتنی - گەرچی بە شێوەیەکی هەندەکیش بێت- سێ شێوازی سەرەکی: تێکەڵکردنی تۆڕەکانی متمانەی نێوان کەسەکان بە سیاسەتی گشتی، دوورخستنەوە و گۆشەگیرکردنی سیاسەتی گشتی لە جیاوازیی چینایەتی و هەڵوەشانەوە یا بیلایەنکردنی ئەو نێوەندە سەربەخۆیانەی دەسەڵات کە هێزی ناچارکردن و زۆرەملێیان هەیە، ئەوەش بە شێوەیەک بێت کە دەسەڵاتی عەوام بەسەر سیاسەتی گشتیدا پتەو بکات و کۆنترۆڵی سیاسەتی گشتی لەسەر بەجێهێنانی دەوڵەت زیاتر بکات. بەڵام

گۆشەگیرکردنی تۆڕەکانی متمانە بە شێوەیەکی گەورەتر لە سیاسەتی گشتی و قەبەکردنی جیاوازیی چینایەتی لەنێو سیاسەتی گشتی و دەرکەوتنی نێوەندە سەربەخۆکانی دەسەڵات کە هێزی ناچارکردن و زۆرەملێیان هەیە، هەموویان دەبنە هۆی لەباربردنی دیموکراسی. لەگەڵ ئەوەی کاریگەریی ئەو پرۆسانە ڕەنگە بە هۆی دامەزراوە پایەدارەکانی ڕابردووە دوابکەوێت، ئەوا ئەو سێ پرۆسەیە و ڕەنگدانەوەیان، جووڵەی بەرەو دیموکراسی یا لێدوورکەوتنەوەی کۆنترۆڵ دەکەن.
بە خستنەڕووی ئەم بیروڕایانە بەشەکانی داهاتوو بە زنجیرەیەکی ڕوونتر هەنگاو دەنێت. بەشەکەی دواتر (بەشی ٤) چارەسەری بابەتی متمانە و بێمتمانەیی دەکات و بەشی ٥یش دەچێتە سەر بابەتی یەکسانی و جیاوازی و بەشی شەشەم باس لە پەیوەندییەکانی نێوان سیاسەتی گشتی و نێوەندە سەربەخۆکانی دەسەڵات دەکات. پاشان ئاوڕ لە دوو بابەت دەدەینەوە، کە دەخزێنە نێو بابەتەکەوە، بەشی ٧ ڕێگە ئەڵتەرناتیڤەکانی بەرەو دیموکراسی و نادیموکراسی شرۆڤە دەکات، بەڵام بەشی ٨ دەرئەنجامە گشتییەکان پێشکەش دەکات.

**سەرچاوە: دیموکراسی - چارلز تیلی. ترجمة: محمد فاضل طباغ. مراجعة: حیدر حاج اسماعیل. چاپی یەکەم. بیروت. تموز ٢٠١٠. المنظمة العربیة للترجمة. بەشی سێیەم لە کتێبی دیموکراسی: بەرپاکردن و لەنێوبردنی دیموکراسی.**



# پەنچە تەنترە

## لە ئەدەبیاتی سانسکریت و ئەدەبیاتی فارسیدا

حەسەن ڕەزایی باغ بیدی
**لە فارسییەوە: سەروەر عومەر**

پێشەکی

وشەی سانسکریت، کە بۆ یەکەمجار لە داستانی ڕامایانە "Rāmāyana"دا بەکارهاتووە، ناوێکە؛ هیندییە دێرینەکان بۆ زمانەکەی خۆیان هەڵیانبژاردبوو. ئەم وشەیە کە لە بنەڕەتدا بەشێوەی "Samskrta" هاتووە ئاوەڵناوی بەرکارە لە ڕەگی kr "کردن" و پێشگری کرداری sam "پێکەوە"یە و لەگەڵ یەکدا بە واتای "پێکەوەکراو، تەواوکراو، پەروەردەکراو و پاراو" دێت. زمانی سانسکریتی لە زمانە هیندۆئەوروپاییەکانە، "ڕۆژهەڵاتیترین لقی زمانە هیندۆئەوروپاییەکان". زمانە هیندۆئێرانییەکان

لە ڕیزی کۆنترین زمانە هیندۆئەورووپاییەکان دێنە ئەژمار، تا ئەو جێگەیەی کە لە میانەی زمانە هیندۆئەورووپاییەکاندا تەنها لقی هیتتی "Hittite" و لقی یۆنانی خاوەن بەرهەمێکی کۆنتر لە لقی هیندۆئێرانین.١

## چیرۆکسازی لە هیندی دێریندا

هیندیانی دێرین، لە سەردەمی هۆنینەوەی ڤێداکانەوە٢ لەگەڵ چیرۆکسازیشدا ئاشنابوون. گرنگترین چیرۆکەکانی سانسکریت ئاکاری بوونیانە. شێوەیەک کە نووسەران بۆ چیرۆکنووسیی هەڵیان دەبژارد، دەربڕینی حیکایەتگەلی جۆراوجۆر لە چوارچێوەی حیکایەتێکی بنەڕەتیدابوو. حیکایەتی بنەڕەتی چوارچێوەی بابەتەکە بوو و کەسایەتییەکانی چیرۆکەکە لەملاولاوە سەرقاڵی حیکایەتی لاوەکی دەبوون. ئەم شێوازەی چیرۆکنووسیی، پاشان دزەی کردە نێو عێراق و ئێرانەوە و نموونەی دیاری، ئەتوانرێت لە حیکایەتەکانی "هەزار و یەک شەوە"دا ببینرێت.

گرنگترین بەرهەمەکانی سانسکریت لەم بابەتەدا بریتین لە: پەنچە تەنترە "pañca Tantra"، "پێنج بەش" کە بە درێژی لەبارەیەوە دەدوێین؛ شوکە سەپتەتی "çuka Saptati"، "حەفتا حیکایەتی تووتی٣"؛ ڤیتالە پەنچە ڤیمچەتی "vetālapañcaveçati" "بیست و پێنج حیکایەتی دێوی جەستەکان".

## کاتی نووسینی پەنچە تەنترە

هێرتل "Hertel" و وینتەرنیتز "winternitz" و تۆماس "Thomas"، کاتی نووسینی پەنچەتەنترە بۆ دەوروبەری سەدەی چوارەمی زایینی دەگێڕنەوە. لەوێدا کە کۆنترین وەرگێڕانی ئامادەی پەنچەتەنترە بە زمانی سوریانی و لە ٥٧٠ی زایینیدا ئەنجام دراوە و ساڵانێکی زۆری پێچووە تا کتێبەکە خۆشەویستی جیهانیی پەیدا بکات و وەربگێڕدرێت. هەروەها بەهۆی ئەوەی لە شوێنێکی ئەم کتێبەدا وشەی دینارە "دینار" "Dinãra" کە وشەیەکی خواستراوە لە لاتینییەوە، بەکارهاتووە٤، دانەپاڵ سەدەی چوارەمی زایینی زۆریش نادروست نایەتە بەرچاو.

## نووسەر و شوێنی نووسینی کتێبەکە

نووسەر و شوێنی نووسینی پەنچە تەنترە نادیارە. بەپێی ئەو ئەفسانەیەی لە پێشەکی کتێبەکەدا هاتووە، پادشایەک بەناوی ئەمەر شەکتی "amar çakti" کە بەسەر مەهیلارووپیەدا "mahelāropya" فەرمانڕەوایی دەکرد خاوەنی سێ کوڕی نەزان بووە بە ناوەکانی ڤەسو شەکتی"vasu çakti"، ئوگرە شەکتی"ugra çakti"، ئەنەنتە شەکتی "anata çakti"و ڕێگەیەکی بۆ پەروەردەکردنیان پێنەدەزانی، بە ناچاری گەورەکانی بانگ کرد و لەگەڵیان کەوتە گفتوگۆ. لەو نێوەدا، وەزیرێک بە ناوی سومەتی "sumati" هەستا و بە پادشای گوت چارە ئەوەیە بە زمانێکی شیرین سیاسەت فێری کوڕەکانت بکەیت و کەسێک جگە لەویشنو شەرمەن "viṣṇu çarman" ناتوانێت ئەم کارە بکات. لەم ڕووەوە، پادشا ئەوی بۆلای خۆی بانگ کرد و پەروەردەکردنی کوڕەکانی پێ سپارد. ویشنو شەرمەن "viṣṇu çarman" لە ماوەی شەش مانگدا سیاسەت

و مەملەکەتداری لە چوارچێوەی کۆمەڵە چیرۆکێکدا لەسەر زاری گیانداران فێرکردن. ئەم چیرۆکانە، پاشان بوونە پەنچە تەنترە.

شێوەی دەربڕینی چیرۆکەکان

لە هەریەک لە پێنج بەشەکەی پەنچە تەنترەدا حیکایەتێکی سەرەکی هاتووە و لەگەڵیشیدا حیکایەت یان حیکایەتگەلی لاوەکیش بەرچاو دەکەون. حیکایەتە لاوەکییەکان یەکێک لە کەسایەتییەکانی حیکایەتە سەرەکییەکە دەیگێڕێتەوە. هەندێک جار، لەناو حیکایەتە لاوەکییەکەدا، حیکایەتی لاوەکی دیکەش بوونی هەیە. بە گوزارەیەکی دیکە، هەندێک جار کەسایەتیی یەکێک لە حیکایەتە لاوەکییەکان، حیکایەتێکی لاوەکی دیکە بۆ ئەوانی دی دەگێڕێتەوە.

حیکایەتەکان بە زۆری لەسەر زاری گیاندارانەوە دەگوازرێنەوە. لەم حیکایەتانەدا هەموو جۆرە ڕەفتارێکی مرۆڤانە دەدرێنە پاڵ گیانداران. هەندێک جار گیانداران ڕێگەی پارێزکاری و تەرکی دونیا دەگرنەبەر. هەندێکجار ڤێداکان دەخوێننەوە، سەرقاڵی بەجێگەیاندنی ڕێوڕەسمی ئایینی و گفتوگۆ لەبارەی خودایان و پاڵەوانەکانەوە دەبن. جارجارەش خووی ئاژەڵانەی خۆیان نمایش دەکەن.

لەناو هەر حیکایەتێکدا، پەندی ئاکاریی هۆنراویش جێگەی کراوەتەوە. هەرچەندە ناوەرۆکی سەرەکی کتێبەکە لە حیکایەتی بە پەخشان نووسراو پێکی دەهێنێت، پەندە هۆنراوەکان، وەک نگینێک، لە نێوان ڕستەکانی کتێبەکەدا دەدرەوشێنەوە. پەندەکان لەو ڕووەوە بە هۆنراوە کراون تا بە ئاسانی بەیاد بسپێردرێن.

## بابەتی هەریەک لە بەشەکان

بەشی یەکەم ناوی میترە بهیدە "mitra bheda" (جیابوونەوەی هاوڕێیان)ە و مەبەست لێی شیکردنەوەی سیاسەتی "ناکۆکی دروست بکە و فەرمانڕەوایی بکە"یە. کەسایەتییە سەرەکییەکانی ئەم بەشە دوو چەقەڵن بە ناوەکانی کەرەتەکە "karataka" و دەمەنەکە "damanaka" کە یەکێک لەو دووانە، بە قسە هێنان و بردن و دووزمانی، هاوڕێیەتی نێوان شێرێک بەناوی پینگەلەکە "piñgalaka" و گایەک بە ناوی سەمجیڤەکە "sajivaka" دەگۆڕێت بۆ دوژمنایەتی. ئەم بەشە گرنگترین و زۆرترین بەشی کتێبەکەیە. گرنگیی ئەم بەشە بە ئەندازەیەکە لەو وەرگێڕانە بەجێماوانەدا کە لەسەر نوسخە پەهلەوییەکەوە ئەنجامدراون (وەرگێڕانە سوریانی و عەرەبییەکان)، لە ڕووی ناونانی گشت بە بەشەوە، پەنچە تەنترە بە ناوی ئەو دوو چەقەڵەوە ناونراوە کە باسمانکرد.

بەشی دووەم ناوی میترە لابهە "mitra lābha" (بەدەستهێنانی هاوڕێیان)ە و مەبەست لێی فێربوونی ئەم خاڵەیە کە مرۆڤ دەبێت هاوڕێکانی بە وردی و پاش لێکۆڵینەوەی ورد هەڵبژێرێت. کەسایەتییە سەرەکییەکانی ئەم بەشە کیسەڵ و کۆتر و قەلەڕەش و ئاسک و مشکن.

بەشی سێهەم، ناوی کاکولوکییە "kākolūkiya" (حیکایەتی قەلەڕەش و کوندەپەپوو)ە، مەبەست لێی ئەو زیانانەن کە هاوڕێیەتی لەگەڵ دوژمنانی

ناوخۆ بەدوای خۆیدا دەهێنێت، کەسایەتییە سەرەکییەکانی ئەم بەشە کوندەپەپوو و قەلەڕەشن.
بەشی چوارەم، ناوی لەبدهە پرەناشە "labdha pranāça" (لەدەستدانی دۆزراوەکان)ە و مەبەست لێی دەربڕینی ئەم مانایەیە کە چۆن مرۆڤێک، بە نەزانی، ئەوەی بەدەستیهێناوە لەدەستی دەدات. کەسایەتییە سەرەکییەکانی ئەم بەشە مەیموون و تیمساحن.
بەشی پێنجەم، ناوی ئەپەریکشیتە کارەکە "aparikşita karaka" (کاری هەڵنەسەنگێنراو)ە و مەبەست لێی باسکردنە لەو زیانانەی دەرئەنجامی گوێنەدان بە قسەی ئەوانی دی، دەیهێنێتە بوون. کەسایەتییە سەرەکییەکانی ئەم بەشە بەرەهمەن و ڕاسوون.
گێڕانەوەکانی پەنچە تەنترە
پەنچە تەنترە، پاش ماوەیەک، بە شێوەیەک خۆشەویست بوو کە لەسەر زەوینی لەدایکبوونیدا چەندین نوسخەی جۆراوجۆری لێکەوتەوە. چەند نووسینێک کە دەکرێت بۆ دروستکردنەوەی دەقی سەرەکی پەنچە تەنترە سوودی لێ وەربگیرێت. ئەوانیش بریتین لە تەنتراکهیاییکە "tantrākhyāyika"؛ پەنچە تەنترەی باشوور؛ پەنچە تەنترەی نیپاڵی؛ هیتۆپەدیشە "hitopadeça" (پەندساز)؛ کەتهاسەریتساگەرە "kathāsaritsāgara" (ئۆقیانووسێک لە ڕووبارەکانی حیکایەت)؛ برهەتکەتهامەنجەری "bṛhatkathāmañjarī" (شکۆفەکانی حیکایەتی گەورە)؛ دەقی سادە؛ پەنچاکهیانەکە "pañcākhyānaka" (پێنج حیکایەت).
تەنتراکهیاییکە
لەم دەقەدا دوو گێڕانەوە بە دەستخەتی شارەدا "çaradā" لە کشمیر بەدەسهاتووە کە لە هەندێک شوێندا لە یەک یا چەند حیکایەت و هەندێک ڕستە و بەیتەکاندا جیاوازییان هەیە. ئەم دوو گێڕانەوەیە هێرتل، بە ئەلفا "(alfa) a) و بێتا b(beta)" ناوی لێناون. ئەم دەقە لانی کەم ٩٥٪ی پەنچە تەنترەی سەرەکی لەخۆ گرتووە و جیاوازییەکانی لەگەڵ دەقە سەرەکییەکەدا زیاتر لە جۆری بۆ زیادکردن و ڕوونکردنەوەیە. گێڕانەوەی ئەلفا لەم دەقەدا، خاوەنی چوار حیکایەتی زیادە و گێڕانەوەی بێتا هەشت حیکایەتی زیادەی لەخۆ گرتووە. سێ حیکایەت لە حیکایەتە زیادەکان لە ئەلفا و بێتادا یەکسانن. حیکایەتە زیادکراوەکان لەم دوو گێڕانەیەدا بریتین لە:
گێڕانەوەی ئەلفا و بێتا
بەشی ١، حیکایەتی چەقەڵی ئاوی
بەشی ١، حیکایەتی١٣ سەرکەوتنی چەقەڵ بەسەر شێر و وشتردا
بەشی ٢، حیکایەتی ٤: سومیلەکە "somilaka" "چنیار"
گێڕانەوەی ئەلفا
بەشی ٣، حیکایەتی ٥: سۆزانیی خیانەتکار
گێڕانەوەی بێتا
بەشی ٣، حیکایەتی ٧: پادشای شیڤی "çivi"
بەشی ٣، حیکایەتی ١١: ڕێوی و ئەشکەوتە قسەکەرەکە
بەشی ٣، حیکایەتی ١١: هەمسەی پیر "hasa"

بەشی ٤، حیکایەتی ١: تەمبێ کردنی دزی پیاز
بەشی ٤، حیکایەتی ٣: گۆزەگەری جەنگاوەر

## پەنچە تەنترەی باشوور

لەم نوسخەیەدا کە پەیوەستە بە باشووری هیندوستانەوە، پێنج گێڕانەوە بەدەست هاتووە کە هێرتل ئەوانی بە ئەلفا، بێتا، گاما( gamma γ) ، دێلتا "δ(delta)" و زێتا z( zeta)" ناو ناوە. ئەم نوسخەیە، لە ڕاستیدا، پوختە و چۆڕاوەی پەنچە تەنترەی سەرەکییە. بە شێوەیەک کە زیاتر لە سێ لەسەر چواری بابەتەکانی دەقە سەرەکییەکەی لەخۆگرتووە و نزیکەی دوو لەسەر سێی بەیتەکانیشی پاراستووە. لەم نوسخەیەدا، تەنها یەک حیکایەتی زیادکراو هەیە: بەشی ١، حیکایەتی ١٢: کچۆڵە شوانەکە و ئەڤیندارەکانی.

## پەنچە تەنترەی نیپاڵی

ئەم نوسخەیە بە هۆنراوە نووسراوە، تا ڕادەیەک هەموو بەیتەکانی ناو گێڕانەوەی ئەلفا لە نوسخەی پەنچە تەنترەی باشووری لە خۆگرتووە. سەرەڕای ئەوە، ڕستەیەکی پەخشانیش لە گێڕانەوەی ئەلفای پەنچە تەنترەی باشووری تێدا دەبینرێت کە ڕەنگە نووسەر، بە بۆچوونی ئەوەی ئەویش دێڕە شیعرێکە لە نووسینەکەی خۆیدا دایناوە. لەوێدا کە پەنچە تەنترەی نیپاڵی هیچ بەیتێکی لە گێڕانەوەی ئەلفای پەنچە تەنترەی باشوور زیاتر نییە و هەندێک جار خوێندنەوەی جیاوازی تێدا بەرچاو دەکەوێت کە دەکرێت لەسەر بنەمای گێڕانەوەکانی دیکە بە بنەما دابنرێت، ڕەنگە بتوانرێت بوترێت کە پەنچە تەنترەی نیپاڵی و پەنچە تەنترەی باشوور لە بنەڕەتێکی تاقانەوە سەرچاوەیان گرتووە و دەقی دایکی هەردووکیان یەکێک بووە.

هیتۆپەدیشە (پەندساز)

ئەم گێڕانەوەیە، کە پێ دەچێت لە بەنگاڵ بە دی هاتبێت، بە گشتی ٤٣ حیکایەتی تێدایە کە ٢٥ حیکایەتی لە پەنچە تەنترەوە وەرگرتووە. کۆنترین دەستنووسی بەدەستهاتوو لە هیتۆپەدیشە پەیوەستە بە ساڵی ١٣٧٣ز. لەبەر ئەوەی نووسەری هیتۆپەدیشە، بەپێی وتەی خۆی، لە "پەنچە تەنترە و کتێبێکی دیکە" سوودی وەرگرتووە، چەند تازەگەرییەکی تێدا بەرچاو دەکەوێت. لەوانەش؛ هیتۆپەدیشە بە پێچەوانەی پەنچە تەنترەوە، لە چوار بەش پێکهاتووە. چوارچێوە و ناونیشانی دوو بەشی یەکەم وەک پەنچە تەنترەیە لەگەڵ ئەم جیاوازییە کە ڕێکخستنەکەیان گۆڕاوە. بەشی سێهەمی هیتۆپەدیشە ناوی "جەنگ"ە و حیکایەتە سەرەکییەکەی زۆر لەگەڵ حیکایەتی بەشی سێهەمی پەنچە تەنترەدا جیاوازە. بەشی چوارەمی هیتۆپەدیشە، کە ناوی "ئاشتی"یە، بە تەواوەتی تازەیە. سەرەڕای ئەوە، هیتۆپەدیشە بەشی چوارەمی پەنچە تەنترەی بەتەواوەتی لابردووە و حیکایەتی سەرەکی بەشی پێنجەمی پەنچە تەنترە و حیکایەتە لاوەکییەکانی لە چوارچێوەی حیکایەتە لاوەکییەکان لە بەشی سێهەم و چوارەمدا جێ کردۆتەوە.

زۆرێک لە حیکایەتەکانی بەشی یەکەمی پەنچە تەنترە لە بەشی چوارەمی پەنچە تەنترە لە

بەشی چوارەمی هیتۆپەدیشەدا هاتوون و حیکایەتەکانی بەشی سێهەمی پەنچە تەنترە لە نێوان بەشەکانی سێهەم و چوارەمدا دابەش کراون.٨

بە دوو هۆکار، ئەو نوسخەی پەنچە تەنترەیەی نووسەری هیتۆپەدیشە سوودی لێوەرگرتووە هەمان دەقی دایکی پەنچە تەنترەی نیپاڵی بووە:

١- بەشی یەکەم و دووەمی پەنچە تەنترە لە نوسخەی نیپاڵی و هیتۆپەدیشە جێگۆڕکێیان پێکراوە.

٢- هیتۆپەدیشە، وەک پەنچە تەنترەی نیپاڵی، زۆربەی بەیتەکانی پەنچە تەنترەی باشووری لە خۆگرتووە و هەرکاتێک لە نێوان چەنچە تەنترەی نیپاڵی و پەنچە تەنترەی باشووردا جیاوازییەک هەبێت، هیتۆپەدیشە هاوشێوەی نوسخە نیپاڵییەکەیە.

هیتۆپەدیشە حیکایەتی سەرەکی بەشی یەکەم و دووەم و زیاتر لە نیوەی حیکایەتەکانی پەنچە تەنترەی لەخۆگرتووە. ئەم کتێبە نزیکەی دوو لەسەر پێنجی دەقە بە پەخشان نووسراوەکە و یەک لەسەر سێی بەیتەکانی پەنچە تەنترەی سەرەکی گرتۆتە خۆی.٩

گێڕانەوەی برهەتکەتها "bṛhatkathā" – "حیکایەتە گەورەکان"

لێکۆڵینەوەکان نیشانی دەدەن کە هۆنراوەی پراکریتی١٠ برهەتکەتها، بەرهەمی گونادهیە "guṇādhya" لە بنەڕەتدا کتێبێکی سەربەخۆی پەیوەست بە سەدەی یەکەم یان دووەمی زایینی بووە.١١ لەکاتێکی نەزانراو و وا دیارە لە باکووری ڕۆژئاوای هیند و (رەنگە لە کشمیر)، لە نووسینەوەی ئەم کتێبەدا، سوود لە گێڕانەوەیەکی پەنچە تەنترەش وەرگیراوە و چەند بابەتێکی پەنچە تەنترەی بۆ زیادکراوە.

هەنووکە دەقی سەرەکی برهەتکەتها و نوسخەی باکووری ڕۆژئاوای ئەو لەبەردەستدا نییە و تەنها دوو گێڕانەوەی لێ بەجێماوە کە بریتین لە: ١- کەتها سەریتساگەرە "ئۆقیانووسێک لە ڕووبارەکانی چیرۆک" بەرهەمی سۆمە دیڤە "somadeva" ٢- برهەتکاتها مەنجەری "شکۆفەی حیکایەتە گەورەکان" بەرهەمی کشیمێندرە "kşemendra".

هەر ئەم بەرهەمانە، لە پراکیتەوە بۆ سانسکریت وەرگێڕدراون و دەوروبەری سەدەی یازدەهەمی زایینیدا لە کشمیردا نووسراون. ئەو پەنچە تەنترەیەی لەم دوو داستانەدا سوودی لێ وەرگیراوە زۆر کورت و وا دیارە بێ پێشەکی و لانی کەم یەکێک لە حیکایەتەکانی دەقە سەرەکییەکە بووە (بەشی ١، حیکایەتی ٣). لەو دوو چیرۆکەدا کە باسکران تەنها نزیکەی یەک لەسەر پێنجی بەیتەکانی پەنچە تەنترە سەرەکییەکە پارێزراوە.١٢

چیرۆکی کەتها سەریتساگەرە "ئۆقیانووسێک لە ڕووبارەکانی چیرۆک"

ئەم بەرهەمە گرانبەهایە "سۆمە دیڤە"، شاعیری ناوداری کشمیری، لە سەدەی یازدەهەمی زایینیدا نووسیویەتی و خاوەنی ٢٢٠٠٠ بەیتە و بەسەر ١٢٤ بەشدا بە ناوی "شەپۆلەکان – taragas" دابەش بووە.

لە کەتها سەریتساگەرەدا لانی کەم سێ لەسەر

پێنجی دەقە پەخشان و نزیکەی یەک لەسەر شەشی بەیتەکانی پەنچە تەنترەی سەرەکی پارێزراوە.١٣ ئەم هۆنراوەیە پێشەکییەکەی پەنچە تەنترەیە و ئەم پێنج حیکایەتەی تیادا نییە کە بریتین لە: بەشی ١، حیکایەتی٣: سێ بەڵای خۆکرد. بەشی ١، حیکایەتی ٤: قەلەڕەش و مار. بەشی ٢، حیکایەتی ٤: بەندێتی پێشووی ئاسک. بەشی ٥، حیکایەتی ٢: ئەو ئارایشتگەرەی زاهیدەکانی کوشت.

چیرۆکی برهەتکەتهای مەنجەری (شکۆفەکانی حیکایەتی مەزن)

ئەم بەرهەمە لە نووسینی کشیمیندرەیە، شاعیری کشمیری، لە بەرهەمەکانی پێشوو کورتترە. لەگەڵ ئەوەی هەموو حیکایەتەکانی پەنچە تەنترەی سەرەکی لە خۆگرتووە، جگە لە پێشەکی و حیکایەتی سێهەم لەبەشی یەکەمدا (سێ بەڵای خۆکرد)، پێنج حیکایەتی لاوەکی خوارەوە کە هەموویان لە گێڕانەوەی بێتا لە نوسخەی تەنترا کهیاییکەدا هاتوون، تیایدا پارێزراون. بەشی١، حیکایەتی ٧: چەقەڵی ئاوی. بەشی ١، حیکایەتی ١٢: سەرکەوتنی چەقەڵ بەسەر شێر و وشتردا. بەشی ٣، حیکایەتی ١١: هەمسەی پیر. بەشی ٤، حیکایەتی ١: تەمبێ کردنی دزی پیاز. بەشی٤، حیکایەتی ٣: گۆزەگەری جەنگاوەر.

بەم پێیە دەکرێت بگەینە ئەو ئەنجامەی کە نووسەری چیرۆکی برهەتکەتها، لە گێڕانەوەی تەنترا کهیاییکە سوودی وەرگرتووە. لەم چیرۆکەدا نزیکەی ٥٥٪ لە دەقە پەخشان و ٩٠٪ لە بەیتەکانی پەنچە تەنترەی سەرەکی پارێزراون.١٤

دەقی سادە

ئەم نوسخەیە ڕاهیبێکی جینی لە مەودای نێوان ساڵەکانی ٩٠٠ و ١١٩٩ دا نووسیویەتی. ناونیشانی ئەم نوسخەیە لە دەستنووسە ئامادەکاندا، بەم شێوازانە هاتووە؛ پەنچە تەنترە، پەنچا کهیانەکە و پەنچا کهیانە "pañçākhyāna"، کە ئاسان نین بۆ وتن، بۆیە ناونیشانی "دەقی سادە" یان بۆ هەڵبژاردووە.

ئەم بەرهەمە پێنج بەشی پەنچە تەنترەی سەرەکی لەخۆگرتووە، لەگەڵ چەند ئاڵوگۆڕێکی جێگەی سەرنج، درێژی هەموو بەشەکان تاڕادەیەک یەکسانە. بەشەکانی چوارەم و پێنجەم لە پەنچە تەنترەی سەرەکیدا زۆر کورتن؛ بەڵام، لەم کتێبەدا، ئەوانیش تاڕادەیەک بە ئەندازەی بەشەکانی دیکەن. نووسەر هێندێک لە حیکایەتەکانی بەشی سێهەمی بۆ بەشی چوارەم گواستۆتەوە و چەند حیکایەتێکی تازەی لە بەشەکانی چوار و پێنجدا جێ کردۆتەوە. هەروەها، حیکایەتی دوو لە بەشی پێنج (ئەو ئارایشتگەرەی زاهیدەکانی کوشت) بە حیکایەتی سەرەکی داناوە و حیکایەتی بەرەهمەن و ڕاسووی بۆ حیکایەتی لاوەکی گۆڕیوە.

لەم بەرهەمەدا نزیکەی دوو لەسەر سێی دەقە پەخشانەکان و یەک لەسەر دووی بەیتەکانی پەنچە تەنترەی سەرەکی پارێزراون.١٥ هەموو حیکایەتەکانی دەقی سەرەکی پەنچە تەنترە، جگە لەم سێ حیکایەتەی خوارەوە، لە "دەقی

سادە"دا هاتوون: بەشی ٢، حیکایەتی ٤: بەندێتیی پێشووتری ئاسک. بەشی ٣، حیکایەتی ٧: بەرەهمەن، دز و زەبەلاح. بەشی ٣، حیکایەتی ١٠: بەراز و مار.١٦

پەنچا کهیانەکە (پێنج حیکایەت)

ئەم نوسخەیە ڕاهیبێکی جینی بە ناوی "پورنە بهەدرە" لە ساڵی ١١٩٩دا نووسیویەتی. ئەو نووسراوانەی نووسەر سوودی لێوەرگرتوون "دەقی سادە" و "تەنترا کهیاییکە" بووە. سەرەڕای ئەوە، وا دیارە، پورنە بهەدرە، لەگەڵ ئەم دوو نووسراوەدا، سوودی لە دەقێکی دیکەش وەرگرتووە؛ چونکە هەندێک لە تایبەتمەندییەکانی دەقی سەرەکی پەنچە تەنترە کە لە "دەقی سادە" و "تەنترا کهیاییکە"دا نابینرێت لەودا بەرچاو دەکەون. ئەم تایبەتمەندییانە لە پەنچە تەنترەی نیپاڵی، گێڕانەوەکانی برهەتکەتها و گێڕانەوەکانی پەهلەویشدا دەتوانرێت ببینرێن. پورنەبهەدرە "pūrṇabhadara"، هەموو حیکایەتەکانی دەقی سەرەکی، بە هەمان ڕیزبەندی، لە بەرهەمەکەی خۆیدا جێ کردۆتەوە، لەگەڵ ئەم جیاوازییەدا کە حیکایەتی ١، بەشی ٣ بۆ بەشی چوار گواستراوەتەوە و حیکایەتەکانی بەشی پێنج وەک دەقی سادە ڕیزکراون.

لەم گێڕانەوەیەی پەنچە تەنترەدا نزیکەی لەسەدا ٧٠ی بەیتەکانی پەنچە تەنترەی سەرەکی پارێزراوە.١٨ سەرەڕای ئەوە، ژمارەی حیکایەتە زیادکراوەکان لەم دەقەدا لە دەقەکانی دیکە زیاترە.

## تەنترا کهیاییکەی سەرەکی

بە پێی وتەی ئوستاد ئیجیرتۆن، دوو سەرچاوەی سەرەکی "پەنچا کهیانەکە"، واتە "تەنترا کهیاییکە" و "دەقی سادە"، بۆ بنەڕەتێکی یەکتا دەگەڕێنەوە کە ئەو بە "تەنترا کهیاییکەی سەرەکی" ناوی بردووە. ئەم گێڕانەوەیەی پەنچە تەنترە لانی کەم سێ حیکایەتی لە پەنچە تەنترەی سەرەکی زیاترە: بەشی ١، حیکایەتی٨: چەقەڵی ئاوی؛ بەشی١، حیکایەتی ١٣، سەرکەوتنی چەقەڵ بەسەر شێر و وشتردا؛ بەشی ٢، حیکایەتی ٤: سومیلەکەی چنیار.

ئەم سێ حیکایەتە، تەنها لە تەنتراکهیاییکە، دەقی سادە و پەنچا کهیانەکەدا هاتوون. سەرەڕای ئەوەش، دوو حیکایەتی یەکەم لە برهەتکەتها مەنجەریشدا هاتووە کە بێ گومان، لە تەنترا کهیاییکە وەرگیراوە.

گێڕانەوەی پەهلەوی

لەسەر بنەمای چیرۆکێک کە لە پێشەکی شانامەی ئەبو مەنسوری، غرر اخبار ملوک الفرسی سەعالیبی، پێشەکی کەلیلە و دیمنەی عەرەبی و بەهرامشاهی و پێشەکی بیدپای بوخاریدا هاتووە، برزویەی پزیشک کوڕی ئازەر میهر١٩، لەکاتی فەرمانڕەوایی خوسرەوی یەکەم ئەنەوشیرواندا (٥٣١ – ٥٧٩ز)، بە فەرمانی ئەو بۆ هێنانی پەنچە تەنترە لە هیندوستان و وەرگێڕانی بۆسەر پەهلەوی بەرەو هیندوستان بە ڕێکەوت.٢٠ برزویە، پاش ئارامگرتن لەسەر دژواریی زۆر دەقێکی پەنچە تەنترەی بۆ ئێران هێنا و وەریگێڕایە سەر پەهلەوی. برزویە ناوی ئەو دوو چەقەڵەی کە

لە بەشی یەکەمی پەنچە تەنترەدا کەسایەتی سەرەکی چیرۆکەکەن (کەرتەکە و دەمەنەکە)، وەک ناونیشانی بەرهەمەکەی خۆی هەڵبژارد و بە پەهلەوی ناوی نا کەلیلەگ ئود دەمەنەگ. "kalâlag ud damnag"

وەرگێڕانەکەی برزویە پێشەکییەکەی پەنچە تەنترە و ئەم سێ حیکایەتەی خوارەوە لە خۆناگرێت: بەشی٢، حیکایەتی٤: بەندێتیی پێشووی ئاسک؛ بەشی ٣، حیکایەتی ١: گوێدرێژ لە پێستی پڵنگدا؛ بەشی ٥، حیکایەتی ٢: ئەو ئارایشتگەرەی زاهیدەکانی کوشت.

سەرەڕای ئەوە؛ حیکایەتی "سێ ماسی" کە لە پەنچە تەنترەی سەرەکیدا "حیکایەتی ١١یە لە بەشی١، گۆڕاوە بۆ حیکایەتی ٧ لە بەشی ١. هەروەها، حیکایەتی ٣ لە بەشی ١، کە بە جۆرێکی دیکە لە گێڕانەوەی ئەلفا لە دەقی تەنترا کهیاییکەدا (بەشی ٣، حیکایەتی ٥) هاتووە، لە پەنچە تەنترەی سەرەکیدا بوونیان نییە.

لە وەرگێڕانی بورزویەدا، چەند حیکایەتێکی مەهابەهاراتەش بوونی هەبوو کە لەوانە دەکرێت ئاماژە بە حیکایەتەکانی  مشک و پشیلە، شا و فنزە و شێر و چەقەڵ بکرێت.

زۆرێک لە لێکۆڵەران لەو باوەڕەدان کە بورزویە، پەنچە تەنترەی ڕاستەوخۆ لە سانسکریتییەوە بۆ پەهلەوی وەرگێڕاوە؛ بەڵام بەراوردی ناوە تایبەتەکان لە وەرگێڕانە بەجێماوەکانی گێڕانەوەی پەهلەویدا "واتە وەرگێڕانە سوریانی و عەرەبییەکان" لەگەڵ شێوەی سەرەکییان لە سانسکریتیدا نیشانی دەدات کە "یەکەم ئەو دەقەی کە بنەمای وەرگێڕانی پەهلەوی بووە، زمانی سانسکریتی نەبووە و پەیوەندی بە یەکێک لە زمانە ناوچەییەکانی هیند (پراکریت) ەوە هەبووە، دووەم ئەم دەقە پراکریتییەش خۆی لە خۆیدا بە ڕواڵەت پشتی بە یەکێک لە گێڕانەوەکانی پەنچە تەنترە، کە بە لقی باکووری ڕۆژئاوایی ناسراوە، بەستووە. ٢١ "ئەو دەقەی بورزویە سوودی لێ بینیوە، ڕەنگە بە زمانی پیشاچی٢٢ بوو بێت کە لە سەرزەوییەکانی باکووری ڕۆژئاوای هیند قسەیان پێ دەکرد و بورزویە، کە خۆی لە خەڵکانی چواردەوری ڕۆژهەڵاتی ئێران بووە، بە دڵنیاییەوە ئاشنایی لەگەڵ ئەم زمانەدا هەبووە.٢٣

گێڕانەوەی پەهلەوی بە خامەی برزویە ئێستا لەنێوچووە و تاقانە سەرچاوەی زانیاری لەبارەیەوە ئەو وەرگێڕانانەن کە بە زمانی سوریانی و عەرەبی کراون. وەرگێڕانی پەهلەوی، نزیکەی ٪٨٠ی دەقە پەخشان و زیاتر لە ٪٧٠ی بەیتەکانی پەنچە تەنترەی لەخۆگرتووە.٢٤

ئەو وەرگێڕانانەی لە دەقی پەهلەوی جێ ماون وەرگێڕانی سوریانی کەلیلە و دیمنەی بورزویە، کەشیشێکی ئێرانی، بە ناوی بود "bud"، لە ٥٧٠ز لە پەهلەوییەوە بۆ سوریانی وەریگێڕا. ئەم وەرگێڕانە، هەرچەند دەستنووسە تایبەتەکەی کە لە ١٨٧٠ز لە کڵێسای "ماردین – mārdin" لە تورکیا دۆزرایەوە و چەند پەڕەیەکی کەوتووە، بەسەر یەکەوە تەواوی دەقی کەلیلە و دیمنەی پەهلەوی لەخۆ گرتووە.

کەلیلە و دیمنەی سوریانی، کە بەهۆی کەوتنی پەڕەکانی سەرەتایەوە بێ پێشەکییە، دە بەشی لەخۆگرتووە بەم شێوەیەی خوارەوە: شێر و مانگا؛ کۆتری گەردن نەخشین و قەلەڕەش و مشک، مەیموون و کیسەڵی نەزان؛ بێ پلانی زاهید و ڕاسوو؛ مشک و پشیلە؛ کوندەپەپوو و قەلەڕەش؛ باڵندەی فنزە و شای بەرمیرین "barmirin"؛ توریگ "turig" (چەقەڵ)؛ وڵات؛ میهرایارا (شای مشکان و وەزیرەکانی)*.

وەرگێڕانە عەرەبییەکەی ئیبن ئەلموقەففەع کەلیلە و دیمنە، زانایەکی ئێرانی بە ناوی ڕوزبە، کوڕی دازویە٢٦ و ناسراو بە عەبدوڵڵا کوڕی موقەففەع، نزیکەی ١٤٠ی کۆچی / ٧٨٥ز، لە سەردەمی خەلافەتی مەنسوری عەباسیدا (١٣٦-١٥٧ک) لە پەهلەوییەوە بۆ عەرەبی وەریگێڕا. ئەم وەرگێڕانە، کە زمانی پەخشانەکەی لە عەرەبیدا بێ پێشینە بوو، پێشوازییەکی بێ وێنەی لێکرا و نوسخە و وەرگێڕانی جۆراوجۆری لێوە بەدیهات کە لە وردەکارییەکاندا لەگەڵ یەک جیاوازییان هەیە. بە پێی گێڕانەوەیەک، "مەئمون، لە خەلیفەکانی بەنی عەباس، گرنگی زۆری بەم کتێبە دەدا و لە خەزێنەدا هەڵیگرتبوو. هەروەها دەڵێن فەزڵی کوڕی سوهەیل، دوای ئەوەی مسوڵمان بوو، ڕۆژێک قورئانی دەخوێند، یەکێک لە هاوڕێکانی پێی گوت: قورئان چۆن بوو بەلاتەوە؟ فەزڵ گوتی: خۆش بوو وەک کەلیلە و دیمنە.٢٧"

نوسخە عەرەبییە ئامادەکان لەسەر وەرگێڕانەکەی ئیبن ئەلموقەففەع بریتین لە: ١) نوسخەی کتێبخانەی ئایا سۆفیای ئەستەنبوڵ کە لە ٦١٨ی کۆچیدا بە کۆششی عەبدوڵڵا بن مەحەممەد ئەلعومەری نووسراوەتەوە. ئەم نوسخەیە بە کۆششی عەبدولوەهاب عەززام لە ١٣٦٠ی کۆچیدا، بە بەراورد لەگەڵ نوسخەی شەیخۆ لە قاهیرە بەچاپ گەیشتووە؛ ٢) نوسخەی مەکتوب لە ٧٣٩ک، کە بە کۆششی ئەلئەب لویس شەیخولیەسوعی لە ساڵەکانی ١٣٢٢ک و ١٣٤١ک و ١٣٩٧ک، لە بەیروت بە چاپ گەیشتووە؛ ٣) نوسخەی کۆکراوەی بارون سیلڤستەر دوساسی کە لە ١٨١٦زایینیدا لە پاریس بڵاوکرایەوە و بە زمانەکانی ئینگلیزی، ئیتاڵی، ئەڵمانی و ڕوسی وەرگێڕدرا؛ ٤) نوسخەی نووسراو لە ١٠٨٤ کۆچیدا، کە بە کۆششی سەید ئەحمەد حەسەن تەبارە و بە هاوکاری موستەفا لوتفی ئەلمەنفەلوتی لە ١٣٨٤ کۆچیدا، لەگەڵ بەراوردی بە چاپی دوساسی و چاپەکانی میسر و بەیروت، لە بەیروت بە چاپ گەیشتووە.

کەلیلە و دیمنەی عەرەبی بێ پێشەکییەکەی پەنچە تەنترەیە و لە بەرامبەردا، ئەم پاشکۆیانەی خوارەوەی لەخۆگرتووە:

١-مقدمه الکتاب: ئەم پێشەکییە دەدەنە پاڵ کەسێک بە ناوی بەهنود بن سەحوان یا عەلی بن ئەلشاهی فارسی. لەم پێشەکییەدا زانایەکی هیندی بەناوی "بەیدەبا" هۆکاری دانانی کتێبەکە بۆ پادشای هیند، بەناوی دابشلیم، ڕوون دەکاتەوە. هەروەها، چیرۆکی لەشکرکێشی زولقەرنەین بۆ هیندوستان لەم پێشەکییەدا هاتووە. عەبدولوەهاب عەززام لەو باوەڕەدایە کە ئەم پێشەکییەیان دوو سەدە یان زیاتر دوای

ئیبن ئەلموقەففەع بۆ کتێبەکە زیاد کراوە.
٢-بعثه البرزویه الی دیار الهند: باسی ناردنی برزویەی پزیشک بۆ هیند بە مەبەستی هێنانی کتێبی پەنچە تەنترە بۆ ئێران. نووسەری ئەم پێشەکییە دیار نییە.
٣-بورزویەی پزیشک: باسی حاڵی بورزویە و بیروبۆچوونەکانی لەبارەی دونیا و کۆشش بۆ دەستڕاگەیشتن بە دونیای نەبڕاوە.
٤-عرض الکتاب: باس لە سوودەکانی کتێبەکە دەکات. ئەم پێشەکییە دراوەتە پاڵ ئیبن ئەلموقەففەع.
ڕیزکردنی ئەم چوار پێشەکییە لە نوسخە عەرەبییەکاندا وەک یەک نییە. لە کەلیلە و دیمنەی چاپی شەیخۆدا ئەو ڕیزبەندییەی باسکرا ڕەچاو کراوە؛ بەڵام، لە نوسخەی چاپی عەززام و مەنفەلوتیدا، ئەم چوار پێشەکییە بەم شێوەیەی خوارەوە هاتووە: ١. مقدمه الکتاب ٢. عرض الکتاب ٣. توجیه کسری انوشیروان برزویه الی بلاد الهند یا بعثه البرزویه الی دیار الهند ٤. باب برزویه الطبیب.
ڕێکخستنی ئەم چوار پێشەکییە لە نوسخەی چاپی مورسەفادا بەم شێوەیەیە: ١. مقدمه الکتاب ٢. بعثه البرزویه الی بلاد الهند ٣. عرض الکتاب ٤. باب البرزویه.
بەشەکانی کەلیلە و دیمنەی عەرەبی لەسەر بنەمای نوسخەی شەیخۆ بەم شێوەیەیە: ١. الاسد و الثور (شێر و گا) ٢.الفحص عن امر دمنه (گەڕان بە دوای کاری دیمنەدا)٢٩ ٣.الغراب و المطوقه والجرد و السلحفاه و الظبی (قەلەڕەش و کۆتری گەردن نەخشین و مشک و کیسەڵ و ئاسک) ٤. البوم والغراب (کوندەپەپوو و قەلەڕەش) ٥.القرد والغیلم (مەیمون و کیسەڵ) ٦.الناسک و ابن عرس (زاهید و ڕاسوو) ٧.ایلاذ و شادرم و ایراخت ٨.السنور و الجرذ (پشیلە و مشک)٣٠ ٩.الملک و الطیر فنزه (پادشا و باڵندەی فنزە) ١٠.الاسد و الشعهر الصوام (شێر و چەقەڵی ڕۆژووگر) ١١.السائح و الصائغ والبتر والقرد والحیه (گەڕیدە و زێڕنگەر و پڵنگ و مەیموون و مار) ١٢.ابن الملک و ابن الشریف وابن التاجر و ابن الاکار (شازادە و نەجیبزادە و کوڕی بازرگان و بەگزادە) ١٣.الاسوار و اللبوئ و الشعهر (سوار و شێری دایکانە و چەقەڵ) ١٤.الناسک و الضیف (زاهید و میوان) ١٥.الحمامه والثعلب و مالک الحزین (کۆتر و ڕێوی و شینەشاهۆ)٣١ ١٦.ملک الجرذان و وزرائه (پادشای مشکەکان و وەزیرەکانی)٣٢.

## وەرگێڕانە عەرەبییەکانی دیکە

دوای ئیبن ئەلموقەففەع، عەبدوڵڵا بن هیلال ئەلئەهوازی کەلیلە و دیمنەی لە ١٦٥ کۆچیدا، بەناوی یەحیا بن خالیدی بەرمەکی وەرگێڕا. بەڵام چونکە وەرگێڕانەکەی ئەو لە ڕووی ڕەوانییەوە (فصاحت) بە پلەی وەرگێڕانەکەی ئیبن ئەلموقەففەع نەدەگەیشت، نەمایەوە.
سەرەڕای ئەم وەرگێڕانە، چەند وەرگێڕانێکی هۆنراویش بۆ کەلیلە و دیمنە ئەنجام دراوە بەم شێوەیەی لای خوارەوە:
١- وەرگێڕانی ئەبان بن عەبدولحەمید ئەللاحقی، کە ئێرانی و هاوسەردەمی ئیبن ئەلموقەففەع بوو. ئەو کەلیلە و دیمنەی بۆ خاندانی بەرامکە بە هۆنراوە وەرگێڕا و دە هەزار دیناری لە

یەحیا بن خالید و پێنج هەزار دیناری لە فەزڵ بە پاداشت وەرگرت.
٢- وەرگێڕانی سەهل بن نەوبەخت ئەلفارسی، کە لە خزمەتگوزارانی خەلیفەی عەباسی هارون ئەلرەشید بوو. ئەو کەلیلە و دیمنە لە ١٦٥ی کۆچیدا، بۆ یەحیا بن خالیدی بەرمەکی بە هۆنراوە کرد و هەزار دینار پاداشتی وەرگرت.
٣- وەرگێڕانی عەلی بن داود، نووسەری زوبەیدەی کچی جەعفەر هاوسەری هارون ئەلرەشید. ئەم وەرگێڕانە نەماوەتەوە.
٤- وەرگێڕانی بیشری بن موعتەمید کە نەماوەتەوە.
٥- وەرگێڕانی نیزامەدین موحەممەد بن موحەممەد بن ئەلهەباریە (کۆچی دوایی: ٥٠٤ک) بە ناونیشانی نتائج الفطنه فی نظم کلیله و دمنه. ئەم هۆنراوەیەی لە ٣٧٠٠ بەیت و لە ماوەی دە ڕۆژدا نووسیوە.
٦- وەرگێڕانی ئەبولمەکارم ئەسعەد بن ئەلخەتیر مەماتی، شاعیری میسری سەردەمی ئەیوبی، کۆچی دوایی لە ٦٠٦ کۆچیدا.
٧- وەرگێڕانی جەلالەدین ئەحمەد ئەلنەقاش لە سەدەی نۆیەمی کۆچیدا بە ناونیشانی دره الحکم فی امثال الهنود و العجم. نوسخەی دەستخەتی ئەم هۆنراوەیە لە مۆزەخانەی بەریتانیایە.
٨- وەرگێڕانی عەبدولموئمین بن ئەلحەسەن بن حوسەین ئەلصەغانی، لە ٦٤٠ی کۆچیدا بەناوی درر الحکم فی امثال الهند والعجم. نوسخەیەکی ناتەواوی ئەم هۆنراوەیە لە کتێبخانەی ڤییەننا هەڵگیراوە.
٩- وەرگێڕانی شێخ موحەممەد بن عەبدولڕەحیم تەرە (کۆچی دوایی: ١٣٥٠ک)، بە ناوی زعموان... یاخود کەلیلە و دیمنەی هۆنراو.٣٤
کەلیلە و دیمنەی ئیبن ئەلموقەففەع لە سەردەمی نەسر بن ئەحمەدی سامانیدا (٣٠١-٣٣١ک)، بە فەرمانی وەزیرە زاناکەی، ئەبولفەزڵی بەلعەمی (وزارت: ٣١٠-٣٢٧ک)، بۆ فارسی وەرگێڕدرا.
وەرگێڕانە هۆنراوەکەی ڕودەکی
نەسر بن ئەحمەدی سامانی، ڕودەکی هاندا بۆ هۆنینەوەی کەلیلە و دیمنە. لە پێشەکی شانامەی ئەبو مەنسوریدا لەبارەی ئەم وەرگێڕانەوە ئاوا هاتووە: "بە ڕوودەکی گوت تا بیهۆنێتەوە و کەلیلە و دیمنە کەوتە سەرزاری گەورە و بچووک و ناوی ئەو بەم شێوەیە مایەوە و ئەم نامەیە لەوەوە بە یادگاری مایەوە. پاشان چینییەکان وێنەیان بۆ زیادکرد و تا هەمووان چێژ لە بینین و خوێندنەوەی وەربگرن."
ئەم هۆنراوەیەی ڕودەکی کە بە بەیتی ناسراوی "هەرکەس هیچ فێر نەبوو لە تێپەڕینی ڕۆژگار / هیچیش فێرنابێت لە هیچ ئامۆژگار" دەستی پێکردووە، تەنها چەند بەیتێکی لە فەرهەنگەکاندا، بەتایبەت لوغەتی فورسی ئەسەدی، پارێزراوە.
وەرگێڕانە فارسییەکەی نەسروڵڵا مونشی یان کەلیلە و دیمنەی بەهرامشاهی ئەبولمەعالی حەمیدەدین نەسروڵڵا بن موحەممەد بن عەبدولمەجید ئەلغەزنەوی، ڕازداری دەزگای سەڵتەنەتی غەزنەوییەکانی هیند، کەلیلە و دیمنەی لە لاهور بۆ بەهرامشا (٥١٢-٥٤٧ک) وەرگێرا، ئەم وەرگێڕانە، کە بە کەلیلە و دیمنەی بەهرامشاهی ناسراوە، بە گێڕانەوەیەک لە ٥٣٨ یا ٥٣٩ی کۆچیدا تەواو بوو. وەرگێڕانەکەی

نەسرولڵا مونشی، لە لووتکەی ڕەوانی و پاراویدایە و بە ئایاتی قورئانی و فەرموودەکانی پەیامبەر و شیعری دێرین و هاوچەرخ ڕازاوەتەوە. ئەم بەرهەمە بەنرخە بەشێوەیەک چووە ناو دڵی خەڵکەوە کە ئێستا دەبێت بە دووەمین کتێبی پەخشانی پاراوی فارسی، لە دوای گوڵستانی سەعدی، دابنرێت.٣٥ مەلیک ئەلشوعەرای بەهار، لەسەر بەها ئەدەبییەکەی ئەم بەرهەمە دەنووسێت:
"بینای ئەم کتێبە لەسەر هاوسەنگی، هاووێنەسازی، دووانەکان، هاوواتاکان و جارجارەش ئاخاوتەی سەروادار(سجع)ە ... هێنانەوەی بەڵگەکان و وەرگرتنەکان، ئایات و فەرموودەکانی پەیامبەر و وتەی پیاوە مەزنەکانیش لەو تازەگەرییانەن کە لە کەلیلە و دیمنەی بەهرامشاهیدا دەبینرێت و ئەوانی دیکە، لەدوای ئەو، لاساییان کردۆتەوە، چونکە هێنانەوەی بەڵگەی شیعری و ئایات و فەرموودە لە کتێبە کۆنەکاندا باونەبووە، مەگەر شیعر یان ئایەت یان فەرموودەیەک کە لەگەڵ مێژوو یان بابەتێکی پەیوەست بە کتێبەکەوە پەیوەندییەکی ڕاستەقینەی هەبێت، نەوەک بۆ جوانکاری و هونەر نواندن هێنرابێتەوە. هەر بەو شێوەیەی لە تەبەری و بەیهەقی و کتێبە سۆفیگەرییەکاندا بینرا. بەڵام لەم کتێبەدا لاپەڕەیەک نییە کە بەم جوانکارییانە نەڕازابێتەوە و ئەمە خۆی شێوازێکی تازەیە کە پاشان ئەوانی دیکە لاساییان کردۆتەوە.٣٦
کۆنترین تۆماری دەستخەتی کەلیلە و دیمنەی بەهرامشاهی پەیوەستە بە ساڵی ٥٥١ی کۆچی.٣٧

ناوەرۆکی کەلیلە و دیمنەی بەهرامشاهی بەمجۆرەیە: پێشەکی وەرگێڕ، دەروازەی کتێبەکە لەسەر ڕێکخستنی ئیبن ئەلموقەففەع؛ ڕێخۆشکردنی بزورگمیهری بەختەکان، بەشی بورزویەی پزیشک و چواردە بەش بەناوەکانی: شێر و گا؛ پشکنینی کاری دیمنە، هاوڕێیەتی کۆتر و قەلەڕەش و مشک و کیسەڵ و ئاسک؛ کوندەپەپوو و قەلەڕەش؛ مەیموون و کیسەڵ؛ زاهید و ڕاسوو؛ پشیلە و مشک؛ پادشا و فنزە؛ شێر و چەقەڵ؛ تیرهاوێژ و شێری دایکانە؛ زاهید و میوانەکەی؛ پادشا و بەرەهمەنەکان؛ زێڕنگەر و گەڕیدە؛ شازادە و یاوەرەکانی.
وەرگێڕانی بوخاری یان چیرۆکەکانی بیدپای موحەممەد بن عەبدولڵا ئەلبوخاری، یەکێک لە وابەستەکانی دەزگای سەڵتەنەتی ئەتابەکانی سەنقەری بوو. بە فەرمانی یەکێک لە ئەتابەکانی موسڵ بەناوی سەیفەدین غازی، لەماوەی ساڵانی ٥٤١ تا ٥٤٤ی کۆچیدا، کەلیلە و دیمنەی ئیبن ئەلموقەففەعی بۆ سەر زمانی فارسی وەرگێڕا. ئەم وەرگێڕانە، کە نوسخەی دەستخەتەکەی بە مێژووی نووسینی ٥٤٤ی کۆچی لە کتێبخانەی مۆزەی توپقاپۆی سەرای ئەستەنبوڵە، بە ناوی چیرۆکەکانی بیدپای ناسراوە و تیایدا وەرگێڕ، بە پێچەوانەی کەلیلە و دیمنەی بەهرامشاهییەوە، نیازی ڕوونکردنەوە، ڕازاندنەوە و نووسینەوەی دەقە عەرەبییەکەی نەبووە.٣٨

## وەرگێڕانە فارسییەکانی دیکە

بەهائەدین ئەحمەد بن مەحموود توسی ناسراو بە قانعی (کۆچی دوایی: ٦٧٢ک)، دەوروبەری ٦٥٨ی کۆچی کەلیلە و دیمنە بەهرامشاهی، بەناوی عیززەدین کەیکاوس، لە سەلاجیقەکانی ئاسیای بچووک، بە هۆنراوە نووسییەوە. لەم هۆنراوەیەدا، دوو نوسخە، یەکێکیان لە کتێبخانەی میللی ملک و ئەوی دی لە کتێبخانەی مۆزەی بەریتانیایە و مێژووی نووسینی ساڵی ٨٦٣ کۆچییە.٣٩

مەولانا حوسەین واعیز کاشفی (کۆچی دوایی ٩١٠کۆچی)، کەلیلە و دیمنەی بەهرامشاهی بەشێوەی خۆی داڕشت و نووسییەوە و ڕازاندەوە. لەم نووسینەدا پێشەکییە ئامادەکانی لە وەرگێڕانە عەرەبی و فارسییەکان و بەیتە عەرەبییەکانی لابرد و پێشەکییەکی بە خامەی خۆی بۆ کتێبەکە زیاد کرد. هەروەها، بە سوود وەرگرتن لەسەرچاوەکانی دیکە، لەوانە گوڵستانی سەعدی، مەرزبان نامە و مەسنەوی مەعنەوی، ژمارەی حیکایەتەکانی ناو کەلیلە و دیمنەی بەهرامشاهی لە ٢٦ەوە گەیاندە ١٠٦. سەرەڕای ئەوە، ناوی کتێبەکەی گۆڕی و کردی بە (ئەنواری سوهەیلی) بەناوی ئەمیر شێخ ئەحمەدی سوهەیلییەوە، یەکێک لە پێشەوایانی دەرباری سوڵتان حوسەینی بایقرای. ئەم کتێبە بە پەخشانێکی پڕ گرێ و گۆڵ نووسراوە.٤٠

ئەبولفەزڵ بن موبارەک، وەزیری ئەبولفەتحی جەلالەدین ئەکبەر پادشای گورگانی هیند (٩٦٣-١٠١٤ک)، دەوروبەری ٩٩٦ک، بە فەرمانی ئەو دەستی دایە ڕازاندنەوەی ئەنواری سوهەیلی تاوەکو سادەی بکاتەوە. ئەم ڕازاندنەوەیە بەناوی "عەیاری زانست" دەخوێندرێتەوە کە بە پەخشانێکی زۆر سادە نووسراوەتەوە. بەڵام هەڵەی ڕێزمانی زۆری تێدایە. پاشان دانەرێکی نەناسراو "عەیاری زانست"ی کورت کردەوە و نووسیەوە و ناوی "نیگاری زانست"ی لێنا.

موستەفا خالقدادی هاشمی عەباسی، لە خەڵکانی لاهور و یەکێک لە ئەدیبەکانی دەرباری جەلالەدین ئەکبەر، بە فەرمانی شا، ڕاسپێردرا تا بەرگێک لە پەنچە تەنترەی ئامادە لە کتێبخانەی سەڵتەنەتی، وشە بە وشە لە سانسکریتییەوە بۆ فارسی ڕەوان وەربگێڕێت. لەم وەرگێڕانە –کە بە پەنچا کیانە ناو دەبرێت- نوسخەیەک کە هێندێک لە پەڕەکانی کەوتوون، لە مۆزەخانەی میللی دێهلی پارێزراوە.٤١

لەم دواییانەشدا، کەسانێک کەلیلە و دیمنە بەهرامشاهییان ڕازاندەوە و نووسیەوە و بەهۆنراوە داڕشتەوە، لەوانە دەکرێت ئاماژە بکرێت بە ئەخلاقی بنەڕەتی لە نووسینی موحەممەد عەلی بن موحەممەد حەسەنی تارانی، گوڵشەنی ڕازاوە لە ١٧٧٠٠ بەیتدا لەلایەن میرزا عەبدولوەهاب ئیرانپوور (١٣٤٧ک)؛ شەکرستان بەهۆنراوە لەلایەن جیهانبەخشی جەمهەری (١٣٢٣هەتاوی)؛ کەلیلە و دیمنەی نوێ لە نووسینی عەلی ئوەیسی (١٣٣٢هەتاوی). پەیمانەی بەند هۆنینەوەی غولامحوسەین فەخری تەباتەبایی (١٣٦٧هەتاوی). سەرەڕای ئەمانە عەلی ڕەزا ئەمیر مەعز و ئەبولبەشەر فەرمانفەرماییان،

چەند نمایشنامەیەکیان لەسەر بنەمای کەلیلە و دیمنە ئامادە کرد.٤٢

## پەراوێزەکان:

١- کۆنترین بەرهەمی هیتی پەیوەستە بە سەدەی ١٧ پ.ز، کۆنترین بەرهەمی یۆنانی پەیوەستە بە سەدەی ١٤ی پ.ز.

٢- ڤێداکان؛ لە کۆنترین نووسراوەکانی زمانە هێند و ئورووپاییەکانن کە لە ساڵانی ١٠٠٠ تا ٥٠٠ی بەر لەدایکبوونی مەسیح بە زمانی سانسکریتی ڤێدی نووسراون. ئەم نووسراوانە لە تێکستە پیرۆزەکانی ئایینی برێهمایی و هێندوویسم دادەنرێت.

٣- ئەم کۆمەڵەیە بەناونیشانی تووتی نامە بۆ فارسی وەرگێڕدراوە. لەمبارەیەوە بڕوانە: طوطی نامە یا جواهر الاسمار، عماد بن محمد الثغری، بە اهتمام شمس الدین ال احمد، تهران، انتشارات بنیاد فرهنگ ایران، ١٣٥٢.

٤- لاتینی: Denarius، ئەم وشەیە لە بەشی١، حیکایەتی ١٣ ڕستەی ٣دا، بەکارهاتووە.

٦- Franklin Edgerton, the panchatantra reconstructed, 2 vols. New Haven: American oriental society, 1924, II p. 13.

٧- Edgerton, II, p. 19.

٨- Arthur Anthony MacDonnell, a history of Sanskrit literature, London,: William Heinemann, 1909, p. 374.

٩- لە سەردەمی جەلالەدین ئەکبەر پادشای گورکانی هیند (١٠١٤-٩٦٣ک)، کەسێک بەناوی تاجەدین وەرگێڕانێکی زۆر ئازادی بۆ "هیتۆ پەدیشە" بە فارسی ئەنجام دا و ناوی "مفرح القلوب"ی لێنا.

١٠- Edgerton, II, p. 22.

١١- پراکریت (prakṛtā) "بازاڕیی، نزم"، بە شێوەزاری بازاڕی و لقێک لە لقەکانی سانسکریت دەوترێت.

١٢- MacDonnell, a history of Sanskrit literature, p. 376.

١٣- Edgerton, II, p. 23, n. 15.

١٤- Edgerton, II, p. 26 27.

١٥- Edgerton, II, p. 25.

١٧- ئەم حیکایەتە بەشێوەیەکی تەواو جیاواز لە بەشی ٤دا، بە ناونیشانی حیکایەتی١ هاتووە.

١٦- Edgerton, II, p. 29.

١٨- Edgerton, II, p. 39

١٩- ناوی باوکی بورزویە لە نوسخەی عەرەبییەکەی مەنفەلوتیدا "ئەزهەر"ە، لە نوسخە عەرەبییەکەی عەززامدا "ئازەر هەربد" عەززام بە "ئارە و هەربد" ڕاستی کردۆتەوە. لە چیرۆکەکانی بیدپای بوخاریدا "ئازەر هورمز"ە. ناوی باوکی بورزویە لە نوسخە عەرەبییەکانی دیکە و کەلیلە و دیمنەی بەهرامشاهیشدا نەهاتووە.

٢٠- بە پێی چەند گێڕانەوەیەک، بورزویە بۆ هێنانی ڕووەکی نەمریی (سانسکریت: samjivanamula)، چوو بۆ هیند. چونکە نەیدۆزییەوە، پەنچە تەنترەی، کە ژیانبەخشی دڵەکانە، لەگەڵ خۆی بۆ ئێران هێنا.

٢١- فەتحوڵڵا موجتابی، "چەند تێبینییەک سەبارەت بە ڕاگەیاندنی کەلیلە و دیمنە" گۆڤاری زمانناسی، تاران، ناوەندی بلاوکردنەوەی زانکۆیی، ١٣٦٣، بەشی ٢، ل٣٤.

٢٢- زمانی پیشاچی pisacha بە دایکی زمانەکانی دەردی (dardic) و کافیری (Kafir) دادەنرێت. هەمان سەرچاوە، ل ٣٦.

٢٣- هەمان سەرچاوە.

٢٤- Edgerton, II, p. 46

٢٥- سەبارەت بە وەرگێڕانی سوریانی کەلیلە و دیمنە بڕوانە: F. Schulthess, Kalila und Dimna, Berlin, 1911

٢٦- ڕوزبە کوڕی دازویە (١٠٦-١٤٢ک / ٧٢٤-٧٥٩ز) لە جور (گور)، کە ئێستا فیروزئابادی فارسە لە دایکبووە و بەدەستی سوفیانی کوڕی موعاویە والی بەسرە کوژرا. دوای مسوڵمانبوونی، ناوی عەبدوڵڵا و نازناوی ئەبو موحەممەدی بۆ خۆی هەڵبژارد. (دائیرەتولمەعاریفی ئیسلامی). ئیبن ئەلموقەففەع یەکێک لە گەورەترین دە وتاربێژ و نووسەرەکانی عەرەب. لەم بارەیەوە بڕوانە: Edward G. Browne, A Literary History of Persia, 4 vols., Cambridge University Press, 1956, I, p. 76.

٢٧- موحەممەد تەقی بەهار، شێوازناسیی یان مێژووی گەشەسەندنی پەخشانی فارسی، بەشی ٣، بەشی ٥، دامەزراوەی بلاوکەرەوەی ئەمیر کەبیر، ١٣٦٩، بەشی ٢، ل ٢٥٠-٢٥١.

٢٩- ئەم بەشە بە ئەگەری زۆر ئیبن ئەلموقەففەع زیادی کردووە.

٣٠- ئەم بەشە لە ماهابەهاراتە وەرگیراوە.

٣١-٣٢- ئەم دوو بەشە لە نوسخەی بنەڕەتی شەیخۆدا نەبووە و شەیخۆ لە نوسخەکانی دیکەی وەرگرتووە.

٣٤- لە بارەی وەرگێڕانە عەرەبییەکانی کەلیلە و دیمنەوە بڕوانە: موحەممەد جەعفەر مەحجوب، لە بارەی کەلیلە و دیمنەوە، چاپی دووەم، تاران، شرکت سهامی انتشارات خوارزمی، ١٣٤٩؛ عەباسعەلی عەزیمی، شەرحی حاڵ و بەرهەمەکانی ئیبن ئەلموقەففەع، تاران، بڵاوکەرەوەی فەرخی، ١٣٥٥.

٣٥ - محمد جعفر محجوب، سەبارەت بە کەلیلە و دیمنە، چ٢، تاران، شرکت سهامی انتشارات خوارزمی، ١٣٤٩، لا ١٤٨

٣٦- شێوازناسیی، بەشی ٢، لا ٢٧٠.

٣٧- لە کەلیلە و دیمنەی بەهرامشاهی چەند چاپێک بەم تایبەتمەندییانەی لای خوارەوە بڵاو بۆتەوە: کەلیلە و دیمنە بە سەرپەرشتی و ڕاستکردنەوە و پەراوێزنووسینی عەبدولعەزیم گورگانی، تاران، مەعریفەت، ١٣٠٨. ڕاستکردنەوە و ڕوونکردنەوەی موجتەبا مینویی تارانی، تاران، زانکۆی تاران، ١٣٤٥؛ هەمان سەرچاوە، بە سەرپەرشتی ئیسماعیل مەتبەعەچی، ١٣٤٥؛ هەمان سەرچاوە، ڕاستکردنەوە و وەرگێڕانی دووبەشی دیکە، بە هەوڵی حەسەن حەسەن زادەی ئامولی، تاران، ئەمیر کەبیر، ١٣٦٥؛ هەمان سەرچاوە، بە ڕەخنەکانی سەید موحەممەد فەرزان، تاران، دامەزراوەی بڵاوکەرەوەی ئەشرەفی، ١٣٧٤.

٣٨- چیرۆکەکانی بیدپای، وەرگێڕانی موحەممەد بن عەبدوڵڵا ئەلبوخاری، ڕاستکردنەوەی موحەممەد ڕەوشەن، چاپی دووەم، تاران، شرکت سهامی انتشارات خوارزمی، ١٣٦٩.

٣٩- کەلیلە و دیمنە بە هۆنراوە، موحەممەد بن مەحموودی قانعی توسی، ڕاستکردنەوەی ماتالی تودوا، تاران، بڵاوکەرەوەی بونیادی فەرهەنگی ئێران، ١٣٥٨.

٤٠- مولی کمال الدین حسین بن علی بیهقی واعظ کاشفی، کلیله و دمنەی کاشفی یا انوار سهیلی، تهران انتشارات امیر کبیر، ١٣٤١.

٤١- مصطفی خالقداد هاشمی عباسی، پنچا کیانه یا پنج داستان، به تصحیح جلالی نابینی، عابدی و تاراضند، تهران، انتشارات اقبال، ١٣٦٣.

٤٢- لە بارەی وەرگێڕانەکانی کەلیلە و دیمنە بە زمانەکانی دیکە، بڕوانە:

Johannes, Hertel, Das Pancatantra, seine Geschichte und seine Verbreitung, Leipzig, 1914.

The Encyclopaedia of Islam, New edition, Leiden: E. J. Brill, 1978, vol. IV, p. 503.

**سەرچاوە:**

**فصلنامه فرهنگستان زبان و ادب فارسی، سال ٢، شماره ١ (٥)، بهار ١٣٧٥، ص ٨٤-١٠٣.**



# ژنێك لە شاری كۆرك

ابوالحسن نجفی

**لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار**

**پێشکەشە بەوانەی کە نیشتیمانیان لا پیرۆزە**

ئارت بێکت تەپڵەکێکی کورتی بۆ دانیشتن لە پشت بەرمیلی شەرابەکە هەڵبژارد، لەبەرئەوەی قژی مەیلەو سوور و ڕوخساری پڕ لە ئاوڵە بوو، هەر لە تافی لاوییەوە حەزی لە جێگەی تاریک بوو. هەرچەند کە شەرمی لە ڕوخساری خۆی نەدەکرد، بەڵام بەپێی عادەتی کۆن تازە ڕاهاتبوو. خزمەتکارەکەی بەباشی دەیزانی حەزی لە چییە، هەربۆیە چەند لەت گۆشتی بەراز و بتڵێ بیرەی ئیرلەندا ی ڕەش و خەستی قیرئاسای بۆ دانا.

ئارت پرسی: جیمی، کەس نەهات بۆ لام؟
خزمەتکار وتی: نا، هیچ کەس. هەر لەو کاتەدا کە سەری چەمابووەوە بۆ خاوێنکردنەوەی کێردەکە، وتی:
-ئێستا دەتوانن ئێوە لە شوێنێکی تر ببیننەوە.
ئارت وەڵامێکی نەدایەوە. قومێکی لە گێلاسە سوورەکە خواردەوە و بە ئەسپایی وتی:
-بەڵێ، دەتوانن...
چاوێکی بە ژێر زەویە بچووکەکە خشاند کە پڕ بوو لە بەرمیلی شەرابی (پۆرتۆ) . هەر لەم مەیخانەیەدا، دەیان کۆبوونەوە بۆ کوشتنی سەربازانی جۆرج، پاشای بەریتانیا کرابوو. هەرچەند ئەو دەمانە کەسێک ئارت بێکتی نەدەناسی چۆن ئەو بە بەردەوامی خەریکی هێرش و ڕاکەڕاکە بوو. ئەم ژێر زەوییەی تەنیا جێیەک بوو کە هاوکارە بەوەفاکانی جار جار دەیانتوانی بیبینن.
بەڵام ئەمڕۆ کە لەبەر قسەی مایکل کالینز "Michael"، سەرەڕای دژایەتی بەردەوامی ڤالێرا "Valera"، لەگەڵ بەریتانیادا ڕێککەوتبوون هەربۆیە ئەویش بەبێ ترس لە شەقامەکانی شاری کۆرک "Cork" پیاسەی دەکرد و جلوبەرگی تایبەتی چەکدارانی دەسەڵاتی ئازادی ئیرلەندا ی بەڕەسمی لەبەر کردبوو.
لەژێر لێوەوە دووپاتی کردەوە: بەڵێ، دەتوانن... چاوە وردبینەکانی بڕییە چاوی خزمەتکارەکەی. جیمی ئەم قسەیەی بێ هۆ نەوتبوو: ئارت ئەوی بەباشی دەناسی، چۆن هەردووکیان، شانبەشانی یەکتر لەگەڵ حکومەتی ئیمپراتۆریدا بەشەڕ هاتبوون و فیشەکە هاودەنگەکانیان سنگی دەیان بەریتانی هەڵتەکاندبوو. جیمی هیچ کات لەخۆوە قسەی نەدەکرد، چونکە حەزی نەدەکرد لەخۆوە شتێ بڵێت و پێی خۆش بوو لەبری ئەمانە خۆی بە خوێندنەوەی کتێبە بچووکەکەی ئینجیل خەریک بکات، کە هەموو لاپەڕەکانی نووشتاندبووەوە. ڕەنگە هەر ئەو کتێبەش بووبێت کە لە گیرفانی چاکەتە کرێکارییەکەیدا هەڵئاوسابوو و بێکت چاوی تێبڕیبوو.
بشێ ئێستا ئەم خزمەتکارە لاواز و بێدەنگە سەر بەکام لایان بێت؟ ڤالێرا، یاخود کالینز؟
دوای ئاشتی و سەقامگیری، بەبێ هیچ قسەیەک دەستی کردبووەوە بە ئیشەکەی خۆی. هەرچەند تفەنگەکەی دەنگی خۆی ئاوێتەی دەنگی تفەنگی کۆماریخوازەکان دەکرد، کە لەگەڵ دەوڵەتی ئازادی ئیرلەندا شەڕیان دەکرد. تۆ بڵێی شەوان، لە شاخ و کێوەکان لەگەڵ ئەوان بوو، یاخود سیخوڕیی بۆ دەکردن؟
خەمێکی تفت و تاڵتر لەو مەشروبەی لە پێکەکەیدا بوو، ملی پێ دانەواند. چەندین برادەرمان هەیە کە لەئێستادا دژایەتی ئێمە دەکەن و بە خوێنمان تینوون. سەری ئەم پەتی براکوژییە، بڵێی لەدەست کێدا بێت؟
لەناکاو فکرێ بە یادی هات و ناوشانی پانوپۆڕی کەوتە لەرینەوە: ڕەنگە جیمی بە قازانجی ((دەوڵەتی ئازادی)) سیخوری دەکات، ئارت بەجوانی دەیزانی کە تۆڕی ئیستخبارات لە کاتی شەڕ لەگەڵ بەریتانیا چ ئەندازە نهێنی و دووردرێژ و پڕ لە وردەکاریی بوو. ((دەوڵەتی ئازادی)) ئەوانەی لەبیر نەکردبوو، بەڵکو بە

وردی و بە توندی بەردەوامی پێ دەدا. ڕەنگە جیمی بەمکارە هەستابێت ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ئەمڕۆ کێ دێت بۆ ئێرە؟
دوو زەلام چوونە ژوورەوە، لە ڕوخسارياندا ئازار و خەفەتی ڕۆژانەيان ديار بوو. لای شوێنی خواردنەوەکە پاڵيان داوە و هەرکام پەرداخێک ويسکی بەدەستەوە و بەئەسپایی قسەيان دەکرد. پاشان چەند کەس و بە شوێن ئەوانيشدا چەند نەفەری ديکە خۆيان کرد بەژوورەکەدا.
جيمی بە بيانووی گۆڕينی دەورييەکە بەرەو لای بێکت ڕۆيی و بەئەسپايی وتی:
– وەرە لەگەڵم.
ئارت داچڵەکا و نەختێک سەری بردە دواوە. خزمەتکارە کە سەرلەنوێ بە ئارامی و بە ئەعسابێکی ساردەوە وتی:
–وەرە لەگەڵم. لەناو ئەم قەرەباڵغيەدا ناتوانيت ماری ببينيت.
بێکت وەکو ئامێرێکی ئۆتۆماتيکی هەستايە سەر پێ. جيمی ئاگای لێ بوو. کەوابوو کێشەکە چارەسەر کرابوو: جيمی شۆڕشگێڕ بوو، هەرچەند بێکت حسابی دوژمنی بۆ دەکرد، بەڵام هەستی بە ئاسودەگی کرد: ماری پێوە نابێت. دوای ئەم قسەيە لە سينەی پان و بەرينيدا، دڵە ميهرەبانەکەی کەوتە خورپە.
جيمی بە خێرايی چاوێکی بە ئارەقخۆرەکاندا گێڕا. هەرکەس بەسەر جامی شەرابی قاوەيی خۆيدا چەمابووە و لەناو دڵی جامەکەيدا، هەڵفڕينی قورسی خەونە لەدەستچووەکانی خۆی سەير دەکرد.
خزمەتکار دەرگای ژوورێکی تاريکی، کە تايبەت بوو بە خواردنەوە و بتڵە خاڵييەکانيان تێدا دانابوو، کردەوە. بێکت چووە ژوورەوە. دەستی لە گيرفانيا، پشت بە ديوارەکە، بێ جووڵە ڕاوەستا.
دڵەڕاوکە نەيدەتوانی باڵای بەرزی بگوشێت. هێندە بە چاوەڕوانی ڕاهاتبوو کە هيچ هەستێک نەيدەتوانی بێتاقەتی بکات.
دەيان سەعات، چەک بەدەست، لە چاڵی دڕکاويی و بەرپەنجەرە و لەنێوان دوو تاشەبەرد، بۆسەی دانابوو. ماسوولکەکانی ڕاهاتبوون و جۆرێک نەرمونيانی فۆسيلی بەردينەی ئاژەڵە ڕاوچييەکانی لەکاتی ڕاودا پێ بەخشيبوون. ئەمڕۆکە لە جێگەی ڕق، مەبەستی لەم چاوەڕوانييە خۆشەويستی بوو. لێ ئەمە هيچی لە توانای ئۆتۆماتيکی ئۆقرەی کەم نەدەکردەوە. هەروها لەگەڵ نزيکبوونەوەی هەر هاندەرێک، تەنانەت پێش ئەوەی دەنگيان ببيستێ، يان بۆنيان بکات، شەپۆلێکی لەناکاو ئەعسابی تێکدەدا. لەم سەعاتەشدا هەستێکی نەناسراو ئاگاداری دەکردەوە کە چاوەڕوانی عاشقانە کۆتايی پێ هاتووە.
هێشتا نەجووڵابوو کە دەرگاکە کرايەوە، بۆ چرکەيەک، سێبەری ژنێکی قەدباريک لە چوارچێوەی ڕووناکی دەرگاکە وەدەرکەوت و جارێکيتر تاريکييەکی تۆخ هەموو شوێنێکی داپۆشی.
ژنەکە لە تەنيشتييەوە بوو. بێدەنگی ئەوان درێژەی کێشا. پياو هەستی بە هەنسکە هەنسکەی ژنەکە دەکرد لە تاريکيدا. لەئاکامدا

لەژێر لێوەوە، وتی:
-ماری.
ژن وەڵامی نەدایەوە، بەڵام پیاوەکە لە خشەخشەکەی زانی کە ژنەکە دەجووڵێت. ئایا ئەو دەیویست لێی نزیکبێتەوە، یان بەپێچەوانەوە؟ دەستی بەبێ ئێختیار درێژکردەوە. پەنجەی بەر پارچەیەکی زبر کەوت و هەستی کرد شانەیەک لەژێریدا دەلەرێتەوە. ناسییەوە. ئارت هەستی بەداهێزران کرد.
دەتوت خوێن لەبەری ڕۆیشتووە. ژنە نەدەجولا، بەڵام پیاوەکە هەستی بە لەرینەوەی لێوی ئەو دەکرد کە دوعای دەخوێند.
هەر ئەوکاتە سەرە گێژەکەی بێکت دوایی پێهات. بەدڵ گوێی گرتبوو و لەخۆڕا هەوڵی دەدا تا لە وشەکانی ماری تێبگات. چیدی تەحەمولی نەکرد و وتی:
-بۆ دوعا دەخوێنی؟
دەنگێک هاتە گوێ. ئەوەندە ناسیاو کە ئارت لە خۆشییاندا موچڕکەیەکی پێدا هات و دووبارە بێتاقەت بوو. دەنگەکە وتی:
- بۆئەوەی لێک دابڕانی ئێمە چیدی کۆتایی پێبێت.
دەستی بێکت کەوتە لەرزین، ویستی شانەی بگوشێت و لە کۆتاییدا ماری لە ئامێز بگرێت، بەڵام دەنگەکە وتی:
-داوا لە خودا دەکەم ئەو ئەرکە حەقیقییە کە ئیرلەندا بە ئێوەی سپاردووە، پێتان پیشان بدات.
ئەو دەمە بێکت، لە شیرینی منداڵانەی ئەم قسەیەدا، هەستی بەجۆرێک توڕەیی و ئیرادەی سەرکەوتووانە کرد و شادی کەمخایەنەکەی جێگەی خۆی دا بە دۆشدامانێکی بێ ئەندازە.
کەوابوو ماری نەک بۆ پەشیمان بوونەوە، بەڵکو بۆ تازەکردنەوەی بەڵێنی شەڕی ماڵوێرانکەر هاتبوو.
هەر لە یەکەم وشەکاندا، ئەم دووڕوویییە شوومە ئاشکرا بوو، لەئاکامدا پیاوەکە وتی:
-ئەرکی من...
بەڵام درێژەی پێ نەدا، بێدەنگ بوو، ئێستاکە نە ئەو ڕای گۆڕابوو، نە ئەم، پاش دە مانگ لێکدابڕان، کە زۆرجار بێ ئاکام بوو، قسەکردن چ قازانجێکی بوو؟ بێکت لایەنگری کالینز بوو، ماری سەر بە ڤالێرا.
هیچ شتێک، تەنانەت دەیان ساڵ ژیانی هاوبەشی و تەنانەت بوونی منداڵ نەیتوانیبوو ڕای دژبەیەکی ئەوان لێک نزیک بکاتەوە، ماری حەزی دەکرد لە شوێن ژینی پڕ مەترسی ئەوکەسانە بکەوێت، کە بۆ ئازادی تەواوی ئیرلەندا هەوڵیاندەدا و ئامادە بوون هەموو شتێکی خۆیان بدەن بۆ ئەوەی ئیرلەندا بەئازادی بگات. بێکت سەرەڕای خۆشەویستی بۆ ژنەکەی، خۆشەویستییەکی بەردەوام و سووتێنەر و بێدەنگ، نەیتوانیبوو خۆی یەکلایی بکاتەوە، ئەو پێی وابوو بۆ بەدیهێنانی مەبەستی ئیرلەندا، چەک هەڵگرتن شووم بوو.
بێکت هەستی دەکرد تاریکیی نێوانیان چڕ و قورستر دەبێت، وەک دیوارێک هەستی پێدەکرا، ئەم هەستە وای گرمۆڵە کردبوو، کە تەنانەت لە بیری چوو لە ماری بپرسێت مەبەستی لەم چاوپێکەوتنە چییە؟

ئومێدی وردوخاشبووی نە ئیرادەیەکی بۆ هێشتبووەوە، نە هەوەسێک. هەستی دەکرد بە زەحمەت هەناسە دەکێشێت و دەستی بەناو چاویدا هێنا.
ماری نەدەجولا... ئەگەر ئەو قورساییەی سینەی بێکتی دەگوشا، نەبووایە، دەیتوانی قەناعەت بکات کە هێشتا چاوەڕوانی مارییە، ئەوەندە هەستی بەتەنیایی دەکرد کە بۆ ڕەوانەوەی ئەم هەستە گوێی هەڵخستبوو بۆ ئەو دەنگانەی کە لە ناو مەیتخانەکەوە دەهاتن.
یەکێک دەیوت: سێ لیرە لە هەفتەیەدا بەشی من ناکات.



دەنگێکی گڕ بە نیشانەی ڕازی بوون و تەسلیم بوون وەڵامی دایەوە: هەر ئەوەش بۆ کاتی بێکاریی باشە.
-کەوابوو نەقابە چی دەکات؟
باس و گفتوگۆ بە بەڵگە و بێ بەڵگە، بەڵام بە بڕوایەکی تەواوەوە لەسەرخۆ ئیدامەی بوو. بێکت لەم دووبارەکردنەوەیە داهێزرابوو، بەڵام دەنگەکان کپبوون. یەکێک نرخی خواردنەوەی پرسی و زرینگەی پارەکەی سەر مێزەکەی بێکتی ئاگادارکردەوە. کاتێ هەستی کرد پاش دابڕانێکی درێژخایەن، ئێستاکە ماری لە تەنیشتییەتی و بەڵام لەمکاتەدا ئەم خۆی لە دەنگەدەنگ و ژاوەژاوی کرێکارانی نەناسراوی سەرخۆش لە ویسکی و جن ون کردووە. دڵی بۆ چارەنووسی خۆی دەسووتا و بوغز گەرووی دەگوشی.
هاوکات ترسێکی کەم بەسەریدا زاڵ ببوو. ترس لەوەی کە ئەم کاتە بەنرخانە لەبری ئەوەی لەگەڵ ماریدا بەسەری بەرێت، لەم بێدەنگییەدا بە فیڕۆ دەچوون. دەبوو بە باشترین شێوە لەم ساتەوەختانە کەڵک وەربگرێت و لێوانلێویان بکات لە بیرەوەریی و هەتا هەتایە فەرامۆشیان نەکات.
پەلە بۆ قسەکردن، گوێگرتن، ژیانی هاوبەش زاڵ بوو بەسەریدا، بەڵام چی بڵێت؟ چۆن وتوویژێک دەست پێ بکات کە هەر وشەیەکی گرنگ و لەجێی خۆی بێت؟ بۆ یەکەم جار هەستی کرد ناتوانێت ئەم بارە سووک بکات و ئەو هێرشانەی بەکاری دەهێنا بەس نەبوو بۆ ئەوەی دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی و ئازار و

شادییەکی خەمبار، بێنێتە قسە.
بەڵام ماری لەم داڵغەیە ڕزگاری کرد و پرسی: منداڵەکە چۆنە؟
لە وەڵامدانەوە بەو دەنگەی کە بۆ کاتێک لە بیستنی بێهیوا بوو، لەخۆشیاندا و بەپەلە وتی:
-زۆرباشە خۆشەویستم. بەردەوام بیر لە تۆ دەکاتەوە و لێت دەپرسێت.
پێکەنی و ماری هەستی کرد سەریشی جوڵاند. ئەو هەموو هەڵسوکەوتێکی مێردەکەی بە باشی لەبەربوو.
بێکیت لە ئیدامەی قسەکەیدا وتی:
-وابزانم وەک هەمیشە، جرالد تۆی لە من خۆشتردەوێت.
-بەڕاستە؟
-دەنگی کەوتە لەرینەوە، بێکت سەرەڕای تاریکی زانی کە پێڵووی چاوی ماری وەکو هەمیشە کە دەیویست، هەستێکی شیرین و بەتام بشارێتەوە، بەخێرایی لێک دەدرێن.
بەبێ ئەوەی خۆیان ئاگاداربن ئەم ڕۆچوونە لە گیانی یەکتر نووقمی خۆشەویستی و خۆ لەبیرکردنەوەیان دەکرد.
ئەو ساڵانەی کە پێکەوە بە باوەڕ و دڵنیایی لەیەکتر ژیابوون، وای لێکردبوون هەر گۆڕانکارییەک لە ڕوخسار و حاڵەتی جەستەییدا بناسنەوە و چێژی لێ وەربگرن. لەئێستادا، ماری سەرلەنوێ، ئەو بیرەوەریانەی زیندوو دەکردەوە.
لەناکاو ماری خۆی لە ئامێزی بێکتدا بینییەوە. بشێ پیاوەکە ڕایکێشابێت، یان خۆی لێی نزیک ببووەوە؟ هەیچکامیان نەیاندەزانی. لێ پیاوەکە هەستی بە قورسایی سەری دەکرد لەسەر شانی، هەربۆیە بە پەلە دەستی پێدادێنا و مارییش ئەم جومگە و پێستە قڵیشاوەی دەناسییەوە.
تیشکێکی خێرا و تیژ دای لە چاویان. جیمی بەبێ ئەوەی سەیر بکات، یان ئاوڕ لەو دوو خۆشەویستە بداتەوە. وتی:
-چیدی کەس نەماوەتەوە. تا ئەوانی تر نەهاتوون زووتر برۆ.
لە شەقام باران نمەنمە دەباری و هەوا مژاویی بوو. تنۆکی باران دەیدا لەسەر ئاوی چەمەکە و بازنەی دروست دەکرد و ئارت و ماری بەتەنیشتیدا تێ دەپەڕین. سپێدە، مژو و هاڵاوی زەریای تا ئاستی دارتێلە ڕووتەکان هێنابووە خوارەوە و کەشتییەکان بەدەم شەپۆلەوە لە پارچەی تەختە و داری بریسکەدار دەچوون.
بێکت دەستی خستە دەوری کەمەری ژنەکەی. چەند ناسک و نەرم و شل بوو بەو ئەندازەیە هێزی لەو دەسەند و ئەو ئیحساسەی کە لێوانلێو بوو لەخزمەتی خۆیدا بەکاری دەهێنا. بێ قسە ڕێیان دەکرد. هەردووکیان خۆشحاڵ بوون، بەڵام لە دڵەوە دەترسان کە قسەیەک بێتە ئاراوە و لەو خۆشییە بێبەشیان بکات. ئەو بەختەوەرییەی کە ئەوانی لە بەرامبەر سەرما و باران و خەونە دژ بە یەکەکانیان، دەپاراست.
پەژارەیەکی قورس سێبەری خستبووە سەر شار. تاک و تەرا، ڕێبوارانێک بە دۆخەکەدا تێدەپەڕین.
خانووە بچووک و کۆنەکان، هێشتا شوێنی برینی شەڕە ناوخۆییەکانیان پێوە مابوو.

جامخانەکان کە بە قۆناغە تفەنگ شکێنرابوون، بە تەختە پینە کرابوون و شوێنەواری فیشەک لەسەر دیوارە رووتەڵەکانییەوە دیار بوو. لە سووچ و قوژبندا، سواڵکەرەکان بەپێی پەتی قوڕیان دەشێلا. چەم هێدی و خەمبار ڕێی دەکرد و بارانی ڕەشی ژەنگاوی بەسەر کۆڵان و خانوو و خەڵکی هەژاردا دەباری، بەڵام بێکت و ماری هەستیان بەم ناشرینی و دڵگوشراوییە نەدەکرد. هەموو تەمەنیان لەم شارەدا بەسەر بردبوو. لایان وا بوو کە شارێک نییە بەجوانیی و پاکیی شاری کۆرک، قەڵای ئازادی ئیرلەندا و حەشارگەی ماندوویەتی و تێکۆشان و خەبات و ئیمان.

کاتێک گەیشتنە بەر پردی تەنیشت بینای شارەوانی، کۆمەڵێک منداڵ بە قیژە و واژ سەر ڕێگاکەیان لێگرتن، ئەوانە بە چەشنێ ڕایان دەکرد کە هەستت دەکرد مەترسییەکی گەورە بە شوێنیانەوەیە، ڕەشوڕووتەکانیش بە جلوبەرگی شڕەوە، تاوناتاوێک لەژێر ڕووناکی کەمی شەودا پێستە ڕەشەکانیان دەر دەکەوت، بەپێی خاوس و بەنجکراو بەسەر خشتی شۆستەکاندا دەڕۆیشتن. گشتیان کاغەز تازە لە چاپدەرچووەکانیان ڕادەوەشاند، بە دەنگێکی زیق و گوێ ئازاردەر مانشێتی ڕۆژنامەکانیان دەخوێندەوە، تا چاویان بەم ژن و پیاوە کەوت بە غەڵبەغەڵب هێرشیان بۆ هێنان.

بێکت، سەرەڕای ئەوەی پەنجەکانی لەگۆ کەوتبوون و شین هەڵگەڕابوون، بە پێکەنینەوە بەناو ئەم خزمە بچووک و جاڕدەر و دڵخۆشانەدا تێدەپەڕین و دەیانویست خۆیان دەرباز بکەن، بەڵام منداڵەکان لاسار و چاونەترس، بە پاڕانەوە وەک گێژەڵووکە ڕاپێچیان دەکردن.

بەڵام ئارت سەرەڕای ئەمانە، نەیدەویست تەسلیم ببێت. غەریزەی بەختەوەریی ڕێی پێ نەدەدا ڕۆژنامەیەک بکڕێت، چونکە لاپەڕەکان پڕبوون لە ناوی مردووەکان، کە هەندێکیان برادەری خۆی، یاخود ژنەکەی بوون. ماری لەو نەفرەت و بێزارییەی تێدەگەیشت و دەیویست بە هەر کلوجێک خۆی لەدەست ئەم فرۆشیارە لاسارانە ڕزگار بکات، بەڵام منداڵێک کە چاکەتە عەسکەرییەکەی بێکتی بینی، سووچێکی چاکەتەکەی گرت و بە دەنگێکی لەرزۆک و بە هەنسکەهەنسکەوە هاواری دەکرد:

-بەڕێز مولازم ڕۆژنامەیەکم لێ بکڕە. باوکم بە دەستی ئەم شۆڕشگێڕە لەعنەتییانە کوژراوە.

ماری بەهێواشی وتی:

-پارەی ڕۆژنامەکەی بدەرێ.

بێکت هەستی کرد ژنەکەشی وەک خۆی دالغەی لای منداڵەکەی خۆیان بوو.

(٢)

هەر کە ماری چووە ژووری کەوشکەندنەکە، ئارت لەپڕ بیری هاتەوە کە بەتەواوی نەیدیوە، چونکە ڕەشیی شەو هێڵەکانی ڕوخساری داپۆشیبوو. چووە دواوە تا باشتر لێی بڕوانێت، بەڵام ماری لەو تیشکە زۆرە وڕمابوو. ئەوەندە دالغەی زۆربوو کە نەدەجووڵا، تەنیا دەستەکانی تا ئاستی سینگی هەڵهێنابوو.

بارانییەکی خۆڵەمیشی مەچەکی پێی لاوازی داپۆشیبوو و کڵاوە خورییە مەیلەو ڕەشەکەی

تا سەر برۆکانی گرتبووەوە. بێکت ئەمانەی باش دەناسی. دەمێک ساڵ بوو ماری ئەم پاڵتاو و کڵاوەی بەکاردەهێنا. بێ ئەوەی بیر لە کڕینی شتێکی تازە بکاتەوە، یاخود گلە و گازەندەیەکی هەبێت. ڕوخساری ماری لەنێوان یەخەی شێداری پاڵتاو و لێواری وەرگەڕاوەی کڵاوەکەی نەگۆڕابوو: لێوی وشک هەڵاتوو و میهرەبان، ڕوخساری ئاراییش نەکراوی و سیمای ڕەنگبزرکاوی لەگەڵ قووڵایی چاوەکانیدا، هەر ئەو سۆز و نیگا بێ فرتوفێڵەی جارانی پێوە دیاربوو. هەر ئەو ڕوخسارە مات و داهێزراوەی کە بێکت لەگیانی خۆشتر دەویست و لە بەرامبەریدا وەکو ئەوەی سەیری سیما و جەستەی پێغەمبەران و هەڵبژێردراوەکانی خودا بکەیت، جۆرێک ترس و قەلەقی ئاوێنە بەسۆز لێی دەنیشت.

وەکو هەمیشە لە دیتنی شانە پانوپۆڕ و قژە سوور و دەستە زلەکان و دەنگە بۆرەکەی خۆی، بێ ئیختیاری هەستێکی ناخۆشی لا دروست دەکرد.

ماری هەر بە نیگای یەکەم و دیتنی ئەوەی کە ناشییانە لە ژوورەکەدا هاتوچۆ دەکات، زانی کە سەرلەنوێ ڕام و کەوی بووە و تەنیا بیر لەوە دەکاتەوە کە چۆن دڵی ژنەکەی ڕابگرێت، هەربۆیە بە عوزرێکی منداڵانەوە بە پێکەنینەوە لەسەرخۆ، وتی:

–ئارت، تۆ منت ماچ نەکرد.

هەرکە بێکت لێوەکانی بردە پێشەوە، هەستی کرد کە گۆنای ژنەکەی ناسکیی جارانی نەماوە، پێستی ڕوخساری زبر و وشک بوو، قەڵەشی ورد وردی پێوە دیار بوو، سەرەڕای ئەمانەش دوو چینی تازەی نائاشنا کە تووڕەیی پێوە دیار بوو، لەم سەروسەری دەمییەوە بە ئاسانی دەبینران. لە قوڵایی دڵییەوە بەزەیی پێداهاتەوە و بەپێچەوانەی حەزی خۆی وتی:

–ژیان لە کوێستاندا بۆ ژنان زەحمەتە.

بەڵام ماری گوێی نەدایە. لە قادرمەکانەوە بە ئەسپایی دەنگی پێیەک هات. لەژێر لێوەوە وتی:

–لام وابێت جیرالد بێ؟

–لە قوتابخانە گەڕاوەتەوە. خۆتان بشارنەوە. لەناکاو بتانبینیت دادەچڵەکێت. لێگەڕێن من لەسەرخۆ ئامادەی دەکەم.

خانووەکەیان دوو ژووری لە تەنیشت یەکەوە بوو. ماری بە خێرایی چووە پاشخانەکەوە، ئەوەندە داڵغەی دیتنی کوڕەکەی بوو، کە نەیتوانی شتومەکی ناو ژووری زەخیرەکە ببینێت. جیڕەی کردنەوەی دەرگا و چپەچپێک و بەدوایدا هاوارێک و تا لای کردەوە، کوڕە دەساڵەکەی، دەم بە پێکەنین و ناوناوەش چاو بە گریانەوە لە باوەشیدا بوو.

–دایە، دایە تۆ زۆر لە دوبلین مایتەوە...

ماری کە بریسکەی چاوی دەهات، چاوی بڕییە ئارت.

پیاوەکە لەبەر خۆیەوە وتی: نەموێرا باسی بکەم.

ماری بەدەم بیرکردنەوەوە دەستی بە قژی کوڕەکەیدا دەهێنا و بە سۆز و ڕووخۆشییەکی تەواوە وتی:

–جیرالد من نەڕۆشتبووم بۆ دوبلین. باوکت بۆ ئەوەی تۆ نەترسی، حەقیقەتی پێت نەوتوە،

هەرچەند من دڵنیام تۆ ئەوەندە گەورە بوویت، عەقڵت پێی دەشکێ کە شتەکان ببینیت.
منداڵەکە وەکو لەژێر کاریگەریی ئەم دەنگە سادە و شکۆمەندە تەسلیم بوبێت، چاوە زیتەڵ و جوانەکانی بڕیبووە ماری. بێکت ڕوو بە ژنەکەی کەوتە جووڵە، ماری بە هەڵهێنانی دەستی، لەو شوێنە وەستاندی.
-ئێوە مافی ئەوەتان نییە حەقیقەت بشارنەوە، نا مافی ئەوەتان نییە.
ئینجا ڕووی کردە کوڕەکەی و وتی:
-جیرالد من دە مانگە لەو شاخ و کێوانە خۆم شاردبوەوە و زەلامم دەکوشت بۆ ئەوەی ئێوە ببن بە ڕۆڵەی ئەو ئێرلەندای کە تەنازوول بۆ پاشای بەریتانیا نەکەن.
روخساری پڕ لە پرسیاری منداڵەکە بریسکایەوە و کتوپڕ بە دەنگێکی بەرز وتی:
-کەوابوو تۆ برادەری باوکی هاوڕێکەم، پاتریک ئۆریهاڵی؟ نازانیت بابە پاتریک چ حیکایاتێکی بەتام و شیرین دەربارەی کۆماریخوازەکان دەگێڕێتەوە.
ئارت داچڵەکا. کەوابێت کوڕەکەی هەموو شتێک دەزانێت؟ شەڕی ناوخۆ، کوشتنەکان، دڵڕەقی و بێ ڕەحمییەکان...؟ چۆن دەکرێت نەزانێت؟ ئەم شەڕە نەفرین لێکراوە چووەتە ناو قوتابخانەکانیشەوە، بەڵام چ غەریزەیەکی نەناسراو ببووە لەمپەر بۆ ئەوەی کوڕەکەی لەم بارەیەوە لەگەڵ باوکی قسە نەکات؟
ماری هەر بەو ناسکیی و شیرینییەی جاری یەکەم وەڵامیدایەوە:
-راستە، ئۆریهالی لای ئێمەیە و دەیان کەسی دیکەش. جیرالد دەبێت نێوی ئەمانە فێر ببێت. ئەمانە قارەمانەکانی ئێمەن.
دواتر وەک ئەوەی کەوتبێتە ژێر کاریگەری ئەو ئازارەوە کە دەبوو بە هۆی گرژبوونی دەم وچاوی بێکت، کوت و پڕ وتی:
-وەرە ئەو دیارییەم بۆ هێناوی ببینە.
ئەوسا لە گیرفانی پاڵتاوەکەی قەوانە فیشەکێکی دەرهێنا و دای بە کوڕەکەی. لەسەر ئاسنەکەیدا، شێوەی سازێک هڵکەندرابوو و لە پشتییەوە بە خەتێکی تێکەڵوپێکەڵ دوو پیت دەبینرا IR (کە کورتکراوەی Irish republic)، جیرالد نیازی بەوە نەبوو مانای ئەو پیتانەی بۆ لێکبدەنەوە. ئەو لە سەردەمی ئەو دەسەڵاتەدا لەدایک ببوو. ئەمە نیشانەی نەتەوەیەک بوو ((کۆماری ئێرلەندا)).
سەیری قەوانەکەی کرد، نووسراوەکانی ئەوەندەی قەوانەکە بەلایەوە سەرنجڕاکێش نەبوون، چونکە ئەم قەوانە، تفەنگ و شەڕ و تەقەمەنییان وەبیر دەهێنایەوە، کە سۆز و خۆشەویستی بەرامبەر بەو ڕووداوانە لە دڵی منداڵانی وریا و بەئاگادا دروست دەکرد. ڕووی کردە بێکت و بەگەرمییەوە وتی:
-جوان نییە باوکە؟ پێشتر لەم شتانەت بۆ نەدەهێنام.
ئارت سەری داخست. دەتوت ئەمشەوە و قسەی کوڕەکەی لۆمەیەکی تێدایە. کەوتە یادی ئوردووەکان کە چۆن دەیان سەعات بۆ سەرقاڵیی، بەشێوەیەکی کرچ و کاڵانە لەسەر پێستی ناسکی سێ فیشەک، شتیان هەڵدەکۆڵی، لە کاتێکدا فیشەکەکانی تر لە قۆناغی

تفەنگەکەدا لەسەرەدا بەڕیز چاوەڕێی هێزە ئینگلیزییەکان بوون. لەپڕ هەستی بە گەرمای سووتێنەری سارا کرد و سینگی پڕ بوون لە بۆن و بەرامەی ڕووەکە بۆنخۆشەکانی سەر تاشەبەردە مۆرەکان، دەنگی گڕ و شادیهێنی هاوڕێ چاونەترسەکانی دەهاتە گوێ. دووبارە جیمی دەبینینەوە کە بەسەر کتێبی ئینجیلدا چەماوەتەوە و هێشتا لەپی دەستی بەهۆی دەسرێژی زۆر و گەرمی لوولەی تفەنگەکەی بۆنی گۆشتی سووتاوی لێدەهات.

ئەودەم، لەنێوان مەترسی و سەرما و گەرما، چ ژیانێکی خۆشی بوو. ناوبانگی ئەو و ئازایەتی پارتیزانەکانی، سەربازەکانی هەموو وڵاتی خستبووە لەرینەوە. لێ هەنووکە ئەو، واتە بێکتی قارەمان ئەرکی ئاسایی سەربازێکی لەئەستۆ بوو و بەشوێن کەسانێکدا دەگەڕا کە لەنێوانیاندا ژن و منداڵەکەشی بوونیان هەبوو.

دڵەڕاوکەیەک کە هۆکارەکەی سۆزی ئەوان بوو، لە خۆی دوور دەخستەوە. نا ئەمە شێتییە کە مرۆڤ داوای شتێکی زیادتر لەوە بکات کە لەتوانایدا نییە. ئینگلیز لە شتە بنەڕەتییەکاندا حازرە پاشەکشە بکات، بەڵام لەمە زیاتر تەنازوول ناکات. بەردەوامی ئەم شۆڕشە بە مانای فەوتاندنی سەرکەوتنێکە کە بەخوێنی هەزاران گەنج دەستمان کەوتووە. ئیرلەندای بێ هێز و لەپێکەوتوو، نیازی بە وەلانانی شەڕە. بۆ بەرگریی لە ئاشتی کالینز پێویستی بە ئازایەتی و لەخۆبووردەیەکی زیاترە تا لایەنگری کردن لە ئارەزووی ڤالێرا.

ئەم وتووێژە لە مێشکیدا، تەنانەت ماسولکەکانی ڕوخساری چوارگۆشەی بێکتی نەخستە لەرینەوە. لێ ماری ئەو پرسیارانەی لە چاویدا دەخوێندەوە وەکو زووعفێک لێی ئاگادار بوو. دەستی لەسەر شانی کوڕەکەی دانابوو، بڵێی بیەوێت بێدەنگی بکات. بە مەبەستی کەوی کردن و ڕاکێشانی سەرنجی بیکێت.

بە چاوەڕوانییەکی پڕ لە دڵەڕاوکێ هەموو جووڵەیەکی مێردەکەی لەبەر چاو دەگرت. لای ئەو هیچ فەرمانێک بەبێ ئیرادەی خوا نەدەکرا، هەربۆیە دوعایەکی بەسۆزی لە گەروودا خوێند، تا خودا مێردەکەی بۆ ڕێگەی ڕاست، هیدایەت بکات. لێ بێکت بە ساردوسڕییەکەوە وتی:

–جیرالد، ئەم یارییە جوانە، بەڵام شوومە. خودا بکات چیدی لەمماڵەدا بەم شتانە یاریی نەکرێت. قەوانەکە بنێرە لاوە.

منداڵەکە بێ حەزی خۆی ئیشەکەی کرد.

چرچ و لۆچی ئەملاولای دەمی ماری قووڵتربوونەوە. خودا نەیویستبوو دوعاکەی گیرا بێت، لێ ئەو ورەی دوو ئەوەندە بەرز دەکردەوە. ئارت لە مانای ئەم چرچ و لۆچانەی دەمی تێدەگەیشت و بریسکەی تووڕەیی چاوەکانی ماری بینی. نائومێدیی و یاخیگەریی ژنەکەی دەبینی و هەستی کرد خۆی بۆ وەڵامێکی قورس ئامادە دەکات.

بەڵام هەوڵی نەدا بەرگریی لێ بکات. لە ڕوانینی جۆرێک پاڕانەوە بەدی دەکرا. پاڕانەوە لە خودا بۆ پاراستنی منداڵەکەیان کە هیچی لە کێشەی ئەوان نەدەزانی، کرد، کە ماری دڵی نەرم بوو. ئێستا کە ئەرکی خۆی جێبەجێ کردبوو و

ڕێگەی خۆشەویستی و ئیمانی بە جیراڵد پیشان دابوو، ئێستاکە بەڵێن وابوو تاچەند کاتژمێرێکی تر، بچێتەوە سەر شاخەبەرزەکانی پارێزەری شاری کۆرک و بە بڕوایەکی پتەوتر لە جاران بچێتە ڕیزی شۆڕشەوە، بۆ ئەم شەوە کورتە نەقوازێتەوە و لە تەنیشت مێردەکەی نەبێت و لەبەر گەرمیی خۆشەویستی منداڵەکەی چێژ لەم شەوە وەرنەگرێت، ئەو شەوەی کە ڕەنگە چیدی دووبارە نەبێتەوە.

قەیتانی کڵاوەکەی کردەوە. کەزیەی تەڕ و زەردی ڕژایە سەرشانی. قەمسەڵەکەی دەرهێنا. لەژێرەوە کراسێکی شینی کۆنی لەبەردابوو، کە سوور دەچووەوە و سەرەڕای ناشیرینی و درێژییەکەی، لەبەر ئەودا درێژتر و بچووکتر دەینواند. بە خۆشییەوە وتی:

–ئارت. نانی ئێوارەمان بۆ بێنە. من و جیراڵد برسیمانە.

نانخواردن تەواو بوو. جیراڵد باسی سەرکەوتنەکانی خۆی دەکرد لە دەرس و یاریدا... لەبەرئەوەی دڵنیا بوو دایکی لە پشتییەتی و گوێ لە بچووکترین قسە و تۆنی دەنگەکەشی دەگرێت، بە قرم و قاڵەوە درێژدادڕیی دەکرد و برانەوەی بۆ نەبوو. ماری فەخری پێوە دەکرد کە لە خوێندن و یاریشدا سەرکەوتوو بووە، کە سەیری هنیەی درێژ و مشتە قورسەکان و چاوەڕەشەکانی دەکرد کە لە (ڕوخساری) ڕەنگ بزرکاویدا دەبریسکایەوە، شانازیی پێوە دەکرد. بە پێکەنینەوە سەیری خواردن ڕاکێشانی ئارتی دەکرد و دەیوت.

–لە وەختێکەوە من لێرە نیم، قاپە لێوار شکاوەکانمان زیادی کردووە.

ئینجا بەدەم ڕۆشتنەوە چاوی لەو قاپ و قاچاخە سادانە دەکرد کە بە بەدبەختی و زەحمەت خڕی کردبوونەوە و پەنجە بهێزەکانی هەمووویانی سواندبوو.

باسی ژیانی نوێیان دەکرد. بێکت بە کورتی باسی ئەو ئەرکانەی دەکرد کە لە ستادی شاری کۆرک پێی سپێردرابوو. ماریش تانوپۆی ژیانی خۆی لەو چەند مانگانەدا بۆ دەردەخست، شەوانی خەوزڕان، حەفتەی ڕاوەدوونان، نەخەوتنی بەردەوام و شەڕە تاک و تەراکان، هەرچەند مەبەست لەم چالاکییانە پڕاندنی تۆی مردن لە گرووپی بەرامبەردا بوو، بەڵام بەبێ هەڵچوون و ڕق و کینە قسەیان دەکرد.

دەتوت شەوانە، پاش کاری ڕۆژانە لەبارەی کەسایەتییەکی شەریف دەدوان، جیراڵد بەتاسەوە گوێبیستی قسەکانی دایکی بوو و ئەم شتە بێکتی ئازار دەدا. بەڵام نەی دەخستە سەر خۆی.

ئاگری شەڕێکی ناچاریی کە ئیرلەندای لە خاک و خوێن گەوزاندبوو، لە ڕۆحی کوڕەکەیدا کڵپەی دەهات و باوکیشی جگە لە بێدەنگیی و ڕازیبوون، چارێکی نەبوو.

بێدەنگییەکی قوڵ ژوورەکەی لەخۆ گرتبوو. مشەممای ژێر چرای سەر مێزەکە وەکو ئاوی بەستوو بریسەکەی دەهات. لەم پانتایە بچووکە، تاریکیی شەو چڕتر دەینواند، بەتایبەت کە گەورەی ماڵەکە بیری لەو هەڕەشە و مەترسییانە دەکردەوە کە لە کۆڵان و دەشت بەڕێکەوت بەرەوڕووی ببنەوە. دەتوت زەمان

لە شیرینی و ناسکیدا ڕۆچووە و بێجووڵە وەستاوە.
ماری لەبەر ماندوویەتی هەستی بە داهێزران دەکرد و هەندێ جار لە دوورەوە گوێی لە ژاوەژاوێ بوو کە لە دەنگی گرووپێکی ئامادە، یاخود ئۆردوویەک دەچوو کە لەژێر ئاسمانی پڕ لە ئەستێرە ڕاکشابێتن.
بەڵام قسەخۆشەکانی بێکت و پێکەنینی جیراڵد خەبەریان دەکردەوە و بە دیتنی ژوورەکە و منداڵەکەی هەستی دەکرد شەوگار کش و بێدەنگە و ئینجا لە بیری دەچوو کە دەبێت خێراتر بچێتە دارستان و تفەنگە ڕۆنلێدراوە بە بریقە و باقەکەی هەڵبگرێت. ئەو تفەنگەی کە لە دەستی ناسکی ژنێکدا زبر و کوشندەتر پیشانی دەدا.
بێکت خەیاڵ هەڵیگرتبوو، کاتێک دەبینی ماری خەریکی کۆکردنەوەی قاپ و قاچاخ و سفرەکەیە، وایدەزانی چیتر لەم جیهانەدا، جگە لەم ژوورە داخراوە و بەختەوەریی خێزانەکەی، شتێکی دیکە بوونی نییە. لێ لە دەرەوەی ماڵەکە دەنگی زەنگی سەعاتێک هاتە گوێیان. هەردوو هەستیان کرد کە ئەم دەنگە نامۆیە تەلیسمەکەیانی شکاندووە. ماری بەچپە وتی:
–سەعات دەیە. ناتوانم زۆرتر بمێنمەوە. ڕێگەکەم دوورە.
جیراڵد داچڵەکا. لێ کە نیگای خەمباری دایکی بینی، خۆی ڕاگرت. سەری بردە پێشەوە و بێ ئەوەی تەماشای بێکت بکات، بە هێواشی و بەپەلە وتی:
–برۆ دایە بەم زووانە گەورە دەبم و دێم بۆ لاتان.
ماری پەنجەی کوڕەکەی بەتوندی گوشی و وتی:
–بەڵام پێش ڕۆیشتنم حەزدەکەم پێکەوە دوعای شەو بخوێنین و بتخەوێنم. هەر کە قسەکەی تەواو بوو، دایان لە دەرگای تەنیشت قادرمەکان.
ماری بە گورجی و بە دڵنیاییەوە قەمسەڵەکەی لەبەر کرد و کڵاوی نایە سەری. جەستەی لاوازی بەشێوەیەکی غەریزی بە شوێن ڕێگەی دەرچووندا دەگەڕا. ئارت بەرامبەری وەستا و بە هێواشی و بە توڕەییەوە وتی:
–مەترسە. هێور بە. کەس نازانێت تۆ لێرەیت. برۆ ژوورەکەی جیراڵد تا جلوبەرگەکەی دەردەهێنێت، من بەجۆرێک بەڕێی دەکەم.
بێکت لەگەڵ کردنەوەی دەرگاکەدا وتی:
–هەلاو ڕاڵف، سەلام چۆنیت؟
ئەم پیاوەش جلی تفەنگدارەکانی دەوڵەتی ئازادی لەبەردابوو. سینگی بچووک و کورتەباڵا بوو.
لە ڕوخساریدا سەرخۆشی زۆر و فرتوفێڵ و هێزی ئیرادە هەست پێدەکرا. خزانە ژوورەکە و پرسی:
–ئارت، نەمخستییە ئەزیەتەوە؟
–نا، نا تەنیام کە لە دەرگەکەت دا خەریکبووم جیراڵدم لەسەر قەرەوێڵەکەی دەخەواند. بۆیە نەختێک درەنگ هاتم.
چوونە ژووری نانخواردن. لەسەر مێزەکە بتڵێک بیرەی ئیرلەندی لێبوو. بێکت پرسی:
–پەرداخێکت بۆ تێبکەم؟
–ویسکی باشترە. من زۆر ماندووم و نیازم بە

قەمچییە.
هەردوو بەئارامی خواردیانەوە. ڕاڵف چاوی بڕییە هاوڕێکەی و بەدڵنیاییەوە وتی:
-ئارت. من دەزانم.
بێکت بەسەر خۆیدا زاڵ بوو. سەرەڕای هێز و توانا و ئەعسابی سارد، لەناکاو بە مشت دای بە ئەژنۆی خۆیدا و دەستی هەڵپێکا: ئەمن و ئاسایشی شاری کۆرک بە دەستی ڕاڵف بوو. بە دەنگێکی وشک و بۆرەوە پرسی:
-چی. چی دەزانیت؟
ڕاڵف بزەیەک نیشتە سەر لێوی و وتی:
-بەهەزار زەحمەت و بەرەوڕووبوونەوەی مەترسی توانیم تێبگەم.
شەویلکەی کرژی بێکت کرایەوە و بە ئارامی بە خۆی وت: کەواتە باسی ماری نییە. بۆ پرسی:
-زۆر گرنگە؟
ڕاڵف قومێکی تری خواردەوە، بۆئەوەی کاریگەریی زیاتری لەسەر دابنێ، وردە وردە و لەسەرخۆ وتی:
-دەزانم بەیانی شۆڕشگێڕەکان لەکوێ کۆدەبنەوە.
لەودیوی دیواری ژوورەکەی ماری منداڵەکەی بەجێهێشت. بەئاسانی و بەوردی قسەکانی دەبیست، بەڵام ئەم دێڕە ئەخیرە ئەوی تا پشت دەرگاکە پەلکێش کرد. سەری نا بە تەختەی دەرگاکەوە و گوێی هەڵخست.
جیراڵد کە لە بێدەنگیی تێدەگەیشت، بە ئاستەم هەناسەی دەدا و بەسەرسوڕمانەوە سەیری دایکی دەکرد.
ئەو هەموو هەڵسوکەوتی دایکی بە چاوی قارەمانێک سەیر دەکرد.
ڕاڵف بەگەرمی درێژەی بە قسەکانی داو وتی:
-بەڵێ، من دڵنیام.
بێکت لەناکاو سەیری دەرگای ژووری کوڕەکەی کرد. ترسی بینینی ماری، جێگەی خۆی دابوو بە ترسێکی تر. ژنەکەی بەهەرجۆرێ بێت دوژمن- لەوێدا بوو هەموو قسەکانی دەبیست. بەڵام چۆن بەرگریی بکات تا ئەم ڕازە گرنگە نەدرکێنێت؟ چۆن ڕێگە لەم خیانەتە بگرێت؟
بە هاوڕێکەی وتبوو کە کەس لەماڵەوە نییە. ئەگەر ڕاستییەکەی ئاشکرا بکردایە، گومانێک دورست دەبوو کە ناچار بوو ماری ڕادەستی



ئەوان بکات.
تروسکەیەک کەوتە دڵییەوە و وتی:
-وا چاکە لە شوێنێکی تر قسەبکەین. حەزناکەم جیراڵد گوێی لە قسەکانمان بێت.
راڵف شانی هەڵتەکاند و وتی:
-ئارتی خۆشەویست تۆ زیاد لەئەندازە دەترسیت. من ئەرکی خۆم باشتر دەزانم.
کوڕەکەت بەیانی هەر با قسە بکات تا ئەو کاتەی ئیشی ئێمە کۆتایی پێ هاتووە.
ئینجا بەشێوەیەکی فەرمان بدات، وتی:
-گوێ بگرە هێزی مالبێڵ ئامادەن و بەیانی ڕێدەکەون، بەڵام توانای بەرگریی هێزی کۆماریخوازان نازانین چەندە. من ئەم هەواڵەم ئێستا پێگەیشت، تۆ بەم خەریتە (نەخشە)یەوە کە بۆم هێناویت، لە کێلارنی چاوەڕوانی عەقید دەکەیت. سەعاتی چوار ئۆتۆمبێلێک دێتە بەر بینای شارەوانی و ئێوە سەردەکەون.
ماری بە هێواشی وتی:
-دەمەوێت بنووسم. زووبە، زوو.
ئەندە هێواش قسەی کرد، کە کوڕەکەی بە ئیشارەت زانی چی دەوێت. بەپەلە لە جانتاکەی قەڵەم و کاغەزێکی بۆ هێنا. دایکی لێی وەرگرت.
بەوردی وەکو تەسجیلێک قسەکانی کە بە ئاشکرا دەبیسترا، وەکو دەنگی ناقووس لە مێشکیدا دەنگیان دەدایەوە، بەپەلە دەینووسییەوە.
هەر کە دەنگی مێردەکەی بیست، کە وتی:
-بەسەرچاو جەنابی ڕاڵف.
کاغەزەکەی خستە بەر بەرۆکی و جانتای کوڕەکەی داخست و داینا لە شوێنەکەی خۆی و چاوی بڕییە دەرگاکە.

دوای چەند چرکەیەک، بێکت هاتە بەردەرگای ژوورەکە. ڕوخساری گرژ و مۆن، دەتوت لە پاش خەوێکی ناخۆش داچڵەکیوە. پاڵی دا بە دیوارەکەوە. پشت دەستی هێنا بە لێوە وشکەکانیدا.
لە کۆتاییدا سەری هەڵهێنا و وتی:
-ماری تۆ بۆت نییە بڕۆیت.
ژن ویستی دەنگ هەڵبێنێت: ئارت، من دەبێ...
لێ لەناکاو بێدەنگ بوو. دەتوت وەکو جاران متمانەی بەخۆ نەماوە. دەیزانی ئەم جارە بێکت حەقی بەدەستە.
پیاوەکە دووپاتی کردەوە:
-ماری تۆ نابێت بڕۆیت. ئەگەر گەورەترین سوێندیشم بۆ بخۆیت کە هیچ نادرکێنیت، بڕوات پێ ناکەم.
بێدەنگ بوو. بزەیەکی بچووک ڕووناکیی خستە سەر ڕوخساری. لێ هیچ کەس نەیدەزانی ئەم بزەیە چی لەژێردایە. هەر بەدەم بزەوە وتی:
-خۆت باش دەزانیت ئەگەر ئەم قسەیە ببیستن، من گیان دەرنابەم. شەقامی کێلارنی پڕە لە دارستان و فیشەکی کۆماریخوازەکان بەفیڕۆ ناچێت.
دیسانەوە بێدەنگ بوو. ئینجا بە هێوریی وتی:
-ئێستا وایدابنێین ئازادی، ئایا ئەم نهێنییە دەدرکێنێت؟ ها ماری لەگەڵ تۆمە؟
ژن وەڵامی نەدایەوە. نەجووڵا و پێڵووی چاوەکانی داخرابوون. بێکت نەیدەتوانی پێشبینی بکات کە چی لە پشت ئەو پێڵوە ناسکانەوەیە، بەڵام لەم کاتەدا هیچ شتێک بۆی گرنگ نەبوو، نە ئەو ڕاسپاردەیە و نە خەباتی دوو حیزبەکە

و تەنانەت نە ژیانی خۆشی. گرنگ ئەوە بوو بزانێت تەرازووی هەستی ژنەکەی کە بەسۆز و عەشقەوە ئەرکەکانی وەردەگرت، بەکام لادا، دەشکێتەوە.
تەنانەت بۆ کۆتاییهێنانی بەم دالْغەیە، ویستی ڕێگەی ڕۆیشتنی لێ نەگرێت. بەڵام چاوی بە چاوی جیراڵد کەوت، بینی دڵی شەپۆل دەدا و چاوی تژی لە ترسە، دەبوو کۆتایی بەم گفتوگۆیە بهێنێت و لە کوڕەکەی بشارێتەوە، چۆن ئەم وتوویژە بۆنی کوشتن و خوێنی لێدەهات. بەناچاریی وتی:
-بڕۆینە دەرەوە ماری، بڕۆین، پێویستە.
-بە پێکەنینێکی گوماناوییەوە وتی، من قۆڵی تۆ بەرنادەم.
ماری چاوی هەڵبڕی. بریسکەی چاوی تەحەمول نەدەکرا. چاوی بڕییە چاوی بێکت بەوردیی سەیری کرد.
دەتوت لەوەی کە چارەنووسی پێشبینی دەکات، ترساوە. ئینجا وتی:
-بڕۆین.
هەر کە گەیشتنە بەردەم پێڵاوەکان، کوتوپڕ وەستا و وتی:
-یەک دەقیقە. لەبیرم چوو کوڕەکەم ماچ بکەم. ڕای کرد بۆ ژووری جیراڵد. کاغەزەکەی کە قسەکانی بێکت و هاوڕێکەی تێدابوو، خستییە ناو دەستی کوڕەکەیەوە و بە هێواشی چرپاندی بە گوێیدا:
-مەیخانەی (لی) لە ڕۆخی سیتی هال. ئەمە بدە بە جیمی خزمەتکار، پێش هاتنەوەی ئێمە نووستبێتیت.
سەری بردە لای جیراڵدەوە و لە ڕوخساریدا تەسلیم و فەرمانبەری بینییەوە، بەڵام بێ ئەوەی مەجالی بێ کوڕەکەی ماچ بکات، گەڕایەوە بۆ لای ئارت.
لە تەرازوودا، ژیانی بێکت سووکتر دەینواند.

(٣)

ئارت باوەشی کردبوو بە ژنەکەیدا. تەواوی سۆز و هێزی خۆی خستبووە گەڕ و ئەوەی وەک عەشقێک، یاخود دیلێکی بەدەستەوە گرتبوو. ئەم گەڕیانە بۆ هەردوولایان کارێک بوو پڕ لەسەر خۆشی و پەژارە و خەم.
باران خۆشیکردبووەوە. هەندێ جار، دڵۆپێک لە سەربانێکەوە وەکو توویەکی گەیشتوو بەر دەبووەوە و لەسەر زەوی دەپلیشایەوە. هەردووکیان دادەچڵەکان و خەبەریان دەبووەوە.
بێکت بیری لەو چارەنووسە سەیرە دەکردەوە کە چۆن تا بەیانی دەبێت بە ناچاریی لەگەڵ ماریدا بێت.
بیری لەو کێشە چارەسەرنەکراوەی ئێرلەندا دەکردەوە، کە چۆن پاش تەمەنێک پێکەوەخەوتن و ژن و مێردی، بۆتە هۆکارێک کە ئەم دووانە لێکتر بێگانە و نامۆ بکات. ماندوویەتی زۆر بڕستی لە ماری بڕیبوو، بە زەحمەت قاچەکانی، وەک ئامێرێکی تەوقیتکراو لە دووی دەهاتن.
ئەگەر بێکت ئاگای لێ نەبووایە، لەوانە بوو لەبەر دەرگەیەکدا ببووڕایەتەوە و بکەوتایە. بیری لە هیچ نەدەکردەوە. سەردەمی هەموو شتێک لای ئەو کۆتایی پێهاتبوو. نیازی بە ویستن

و شەڕکردن نەبوو. لە ئاخرین ساتەکاندا، بوێرانە فەرمانێکی دەرکرد و بەجۆرێک خۆشی چیتر بەسەریدا زاڵ نەبوو. هەرچی دەبێت با ببێت. جگە لەوەی تەوەکول بەخودا بکات تا لە تاوانەکەی خۆش ببێت، هیچی پێ نەدەکرا. لەبەر ماندوویەتی نەیدەتوانی دوعایەکیش بخوێنێت.
هەتا دەهات زۆرتر قورسایی خۆی دەخستە سەر شانی بێکت. ئێستا تەواوی کێشەکەی ماری، بێکت هەڵیگرتبوو. ماری هەستی دەکرد نە شانی بێکت، بەڵکو شتێکی بێ گیان وەکو دیوارێکی گەڕۆک ئەوی دەهێنا و دەبرد، بەڵام بۆ کوێ و بۆچی؟
ئەمەی نەدەزانی. لە چواڕێیانێکدا پێی خزا و بێکت ئەو دەم بەتەواوی هەستی بە داهێزراویی ئەم جەستە لاوازە کرد. ئەو جەستەیەی کە تا ئەو دەمە چێژێکی ئاوێتە بەحەسرەت و گەرمای پێ بەخشیبوو. هەربۆیە وتی:
-ماندوویت، با بگەڕێینەوە؟
بیرۆکەی پشوودانێک ئەوەندە شیرین بوو، ئەوەندەی نەمابوو قەبووڵی بکات. لەناکاو هاتەوە بەخۆیدا. دڵنیام جیراڵد نەگەڕاوەتەوە، یان ڕەنگە هێشتا ڕێنەکەوتبێت. بە ترسێکەوە ورەی وەبەر خۆی دا. ئەم هەوڵە لە بەراوردی لەگەڵ کێشەکانی ڕابردووی، بچووک بوو، بەڵام بۆ ئەوی کفت و ماندوو هێزێکی دەویست لەسەروو هێز و تاقەتی مرۆڤێکەوە. بێکت دووپاتی کردەوە:
-دەڵێی چی خۆشەویستەکەم؟
ماری وەکو کەسێکی تێکشکاو کە نیازی بە یارمەتی بێ وەڵامی دایەوە:
-نا. ئارت. بابڕۆین. پیاسەکردن و هەوای تازە بۆ من زۆرباشە. نازانی چەند حەزدەکەم پێکەوە بچین بۆ باخی گشتی.
بێکت بەتوندی لە ئامێزی گرت و هەنگاوەکانی خێراتر کردەوە. ئەوەندەی نەخایاند لە شار چوونە دەرەوە. مانگی چواردە لە پشت هەورەکانە و چاوشارکێی لەگەڵ دەکردن. لە کەناری شەقامەکە، وێرانەی خانووەکان و دارە ڕووتەڵەکان دەبینرا. پاش نەختێک هەموو شتێک نووقمی تاریکی بوو.
لە دوورەوە تەنیا، پەنجەرەی ڕووناکی نادییەکان وەکو زنجیرەیەک لە چرا، تاریکییەکەی پەڵە پەڵە پیشان دەدا.
هەوا سارد و سڕبوو، لێ ئارت و ماری ئاگایان لێ نەبوو. بۆ ئارت جووڵەی هاوسەنگی ئەم جەستە بەنرخە لە تەنیشتییەوە، مەجالێکی نەهێشتبۆوە تا بیر لەسەرما بکاتەوە.
ماری کە جەستەی تازە گەرم داگیرسابوو. خەیاڵێکی سەیر بە مێشکیدا هات، وەک ئاگر کڵپەی سەند و هەموو هۆش و هەستی ماری گرتەوە. بەری ئاسمان ڕووناک ببووەوە. دەیدی کە ئۆتۆمبێلێک لەبەر بینای شارەوانیدا هاڕەی دێ، بێکت سەردەکەوێت. نەخشەکەی ڕاڵف لەگیرفانیدایە. ئینجا شەقامی کێلارنی بەگردە ئاوی (شین) و سەوز و سوورەکانییەوە و بە بێشەلانەکانیەوە دەهاتنە بەر چاوی. فکری ماری لەوە زۆرتر نەدەچووە پێش، دەتوت دەستی قەدەر کۆسپێکە لەسەر ڕێگای ئەم خەونەدا. دەیزانی ئۆتۆمبێلەکە لەو لۆفەی شەقامە تێناپەڕێت کە لەوێڕا ئاسۆی لاجەوەردی و

سەهۆڵبەستووی گۆماوەکانی کێلارانی هەر هەڵدێنن. لێ بۆچی؟ کە دەگەیشتە ئەم خاڵە، وێناکانی مێشکی ڕەش هەڵدەگەڕان.
سەرلەنوێ، ناچار بوو ملی ئەم ڕێگایەی دەگرتەبەر: ئاسۆ، ڕۆیشتن، شەقام و دووبارە کۆسپێکی گەورە وەکو مۆتەکەی خەونەکانی دەهاتە سەر ڕێگا و بەچاو دەیدی.
ئەم کارە یەک جۆر و تاقەتپڕووکێنە، تێکڕای هەست و توانایی ماری لەخۆگرتبوو، نەیزانی کەنگێ بەسەر پردەکەدا تێپەڕیون، لەوبەر چەمەکەوە، بێدەنگییەکی کاکی بەکاکی ئەوانی لەخۆگرتبوو.
بێکت وتی:
-گەیشتین.
بە هێواشی قسەی دەکرد تا کەشی سەیرانگاکە نەشێوێنێت، مانگ لەنێو دڵی هەورەکانەوە خزابووە نێو دەریایەک لە شیر و مەلەی دەکرد. شەقامەکانی باخ پڕبوون لە ڕووبار و دەیان پێچ و لۆفە و سێبەر، کە دەتوت لەسەر زەوی هەڵکەندراون. شنەبا بەناو دار بەڕووەکاندا گۆرانی دەوت.
تنۆکە بەجێماوەکانی بارانیش بە زەنگۆڵەی ئاوییەوە تێکەڵاوی دەبوون. لەسەرەوەی سەیرانگاکە زانکۆ دێرینەکە دەبینرا. قو و مراوی لە ئاوی چەمەکەدا مەلەیان دەرکرد و جاربەجارێک سەریان بەرەو ئاسمان هەڵدەبڕی. دەرودەشت هێندە سێحراویی بوون، کە ئەم شوێنە بە خەڵوەتگەی تەلیسماویی دەهاتنە بەرچاو.
بێکت و ماری نەختێک لێک دوورکەوتنەوە.
سەیری یەکتریان کرد. ئارت وتی:
-دێتەوە بیرتان؟
ماری سەری داخست. ساتەوەختەکانی ئەم شەوە قەڵەشی کردبووە دیواری باوەڕی ئەو بە شەڕ، کە لەگەڵ ئیحساس و هەستدا ناتەبا بوون و لەم درزەوە بیرەوەرییەکان دەڕژانە ناخی گیانییەوە. ئای چەندە یاد و یادگاری زۆر لەم سەیرانگایەدا خۆیان حەشار دابوو.
هەر لێرەدا بوو کە شەوانی دەزگیرانداریی دەهات بۆ لای ئارت. هەرچەند ئەو دەمە کیژان بەم کوڕە درێژ و گێلە و کەمدوو و قژ سوور و هاوڵایە، پێدەکەنین. بەڵام خۆی فەخر بەکام جوانییەوە بکات؟ لەوەش زیاتر، ئارت چەندە دڵی لای ئەم بوو و بەخۆشی و ترسەوە کاری بەدالەی بەجێدەهێشت و سۆراخی ئەمی دەکرد. گەڕانەکەیان تا نیوەشەوانی خایاند. هەندێ جار قوتابییەکانی زانکۆ بەلایاندا تێدەپەڕین بەبێ ئەوەی ڕقیان لێیان بێت، تەعلیقیان لێ دەدان. هەردووکیان کەمدوو بوون و جیاوازی بیروڕایان نەبوو.
ماری هەر لەو دەمانەوە هەستی دەکرد بەسەر ئارتدا زاڵە، بەڵام نیازی بەو شتە نەبوو.
چوون ئارت حەزی دەکرد هەموو ئارەزووەکانی ئەو بەدی بێنێت.
ژیان چ سیمایەکی نەرم و میهرەبانی لە خۆی نیشان ئەدا. چەندە بێکت بەتەحەمول و دروستکار و وەفادار بوو. چ فەخرێکی دەکرد، بێ ڕیا و ڕاستگۆیانە بەرامبەر بە قژی کاڵی ژنەکەی و ملی باریکی و بە چ عەشقێکەوە منداڵەکانی خۆش دەویست.

جیرالد!
وا هەستی کرد هاواری کرد، بەڵام لێوەکانی بەئاستەم جووڵان لەناکاو، دەتوت لەبەر چاویدا منداڵەکەی دەبینێت کە بە ڕۆخی چەمەکەدا ڕادەکات و کاغەزەکەی دایکی لەمشتیدایە.
هەر ئەو کاغەزە، کاغەزی تاوانبارکردن و...
پاشان زنجیرەی خەیاڵی سەیر یەکیانگرتەوە و ئەمجارە ئەو خەیاڵەی کە نەگەیشتبووە ئەخیر، تا کۆتایی دەیبینی: ئاسۆ، ئۆتۆمبێل، شەقام و مردنی بێکت. لەبەرئەوەی دڵنیابوو ئارت تەسلیم نابێت.
بەترسەوە سەیری چواردەوری کرد. دەتوت نیازی بە یارمەتییە، لێ جگە لە قرچەقرچی دارەکان و یاریی مراوییەکان لە ئاودا و ئەو بیرەوەرییانەی ڕابردوو کە لە مێرگوزارەکانەوە، سەریان هەڵدێنا، هیچ شتێک بوونی نەبوو.
جەستەی کەوتە لەرینەوە و وتی:
-ڕێ بکەین ئارت. من دەترسم.
بێکت بڕوای پێ نەکرد. پێکەنی وتی:
-تۆ و ترس ماری؟ ڕەنگە ئەمڕۆ زۆر ئازارت چێشتبێت؟
بە میهرەبانییەوە دەستی لەسەر هنییەی گەرمی ژنەکەی دانا. ئەم خۆشەویستی و لاواندنەوەیە نهێنیترین تاڵەکانی ناخی مارەی هەژاند و خستییە لەرینەوە. تا ئێستا جەستەی لاوازی، لەرز و تای وای بەخۆیەوە نەدیبوو.
هەرگیز بە هێزێکی ئازاراویی ئاوها، هەستی نەکردبوو چەند ئارتی خۆش دەوێت. لەم کاتەدا لەناکاو زانی کە بێکتی خۆش دەوێت، بەجۆرێک لە سەردەمی دەزگیرانداریی و هاوسەرگیریدا ئەوەندەی ئێستای خۆش نەویستبوو.
دڵمردوو و گوێڕایەڵ، چاوی بڕیبووە زەوی. لە دڵیدا دەنگی زەمزەمەی ئاوی گەرم و دوعایەکی سەیری دەبیست. بیری دەکردەوە کە ئەم پیاوە بەیانی بەدەستی ئەو دەکوژرێت...
بەپرتەپرتەوە وتی:
-پیاسە بکەین ئارت. تۆ خودا با نەوەستین.
ئارت ویستی قۆڵ لە قۆڵی هەڵپێکێت، بەڵام ژنەکە بەترسەوە سڵی کردەوە. بێدەنگ هەنگاوی دەنا. ماری بێجگە لە پەژیوانی چارێکی نەبوو. هەستی دەکرد داهۆڵی پەشیمانی لە بەرامبەریدا وەستاوە و بەخێرایی هێرش دەکاتە سەری.
ڕاچەنی و وەستا. کاتێک ویستیان لە تەنیشت محەجەرەی دەشتەکەدا تێپەڕن. بینای گەورەی سجن (زیندان) لە بەردەمیاندا قوتبۆوە. ماری هەزار جار ئەو شوێنەی دیبوو، لێ ئەمشەو دەتوت بە جەستەیەکی گەورەتر و ڕەشتر لە جاران هێرشی بۆ دێنێت.
ئارت سەری داخستبوو لە یادی ڕابردوودا بوو. بیرەوەرییەک لە پەیوەندی لەگەڵ هەردووکیاندا. ((شەوێکی پاییز بوو. وەکو ئەمشەو. لە لەندەن "تێرێنس مەک سوێنی" پارێزگاری کۆرک، پاش هەفتا ڕۆژ مانگرتن لە خواردن، خەریکبوو دەمرد. لە شاری کۆرکدا یازدە گەنج لەسێدارە درابوون.
محەجەرەکانی پردە قەوزە لێ نیشتووەکە لەگەڵ ساحەی تەنگی زیندانەکەدا لە خەڵک جمەی دەهات. ئارت سەیری میلە ئاسنییەکانی دەکرد. بێدەنگیی و کپ و کڕی. بێدەنگییەکە بەهۆی داخرانی هەزاران دەم، چڕتر و قووڵتر

و قورستر دیار بوو. کتوپڕ دەنگێکی زیق دێتە بەر گوێ:
کەشیشێک بە عەبای پەشمینەوە کە لەژێر تیشکی مەشخەڵاندا لە زەردیی گۆگرد دەچوو، نوێژی مردوو دادەبەستێت. خەڵکەکە لە خاک و قوڕدا دادەنیشن و خاچ دەکێشن. لەناکاو دەنگی "ئامین"ی جەماعەت، وەک شەپۆلی بەرزی ترسهێنەر دەبێتە ئاوازی گەورەی گشتی.
لەبەر دەرگەی کە ڕەنگی مردنی لێ دەچۆڕێت، سەربازانی بەربەری ئینگلیز، کڵاوخود لەسەر، بە عەسابێکی ساردەوە گوێ لەم هەرا و ژاوەژاوە دەگرن)).
ئەو دەمانەی کە ئارت، لە دەشت و دەر و لە شاخ لەگەڵ سوپای ئینگلیزدا شەڕی دەکرد، زۆر جاران ماری هاتبووە پاڵ ئەم نەتەوە پڕسۆز و بەردەوامە و دواتر بە ئارامی و بە پاکی هەستابوو لەگەڵ خەڵکەکە بەبێدەنگی ڕوویان لەشار کردبوو، تژی لە هێزێکی گەورە و بە دڵنیایی بەسەرکەوتنی ئەم میللەتە.
لەودیوی ئەم قەڵا و بورجە ئەستوورانەوە و لەودیوی ئەم نەخش و نیگارە خەیاڵییەوە کە لەسەر هەور و دارە کۆنەکان و مانگەشەوەوە کێشرابوو ئامۆژگارییەکی بێبەزییانەی دەهاتە گوێ. ماری وەکو ڕابردوو هەستی بەم توندوتیژییە بەردەوامە دەکرد.
مردنی بێکت عادیلانە بوو. ڕێگایەکی پیرۆز و پاک. ڕۆحی شەیدانی ئیرلەندا دژی ئەو، ئەم حوکمەی دەرکردبوو.
ماری چۆکی دادا.
ئارت کۆبوونەوەکەی تێک نەدا. ئاخۆ پێشبینی ئەوەی کردبوو ژنەکەی لە دڵەوە و بە ئاسوودەگییەکی بێ سنوور، دۆعای خێری بۆبکات؟ بۆ ئەو کە بەم زووانە، بەبێ ئەوەی دان بە تاوانەکانیدا بنێت و لە خوا بپاڕێتەوە لە گوناحەکانی خۆش بێت، ئەم زەوییە بەجێدێڵێت، سەری لێ دەرنەدەکرد، بەڵام ماندوویەتییەکی بێ کۆتایی و بڕانەوە، بە گەورەیی ئەم ئاسمانە، بەسەریدا زاڵ ببوو.
ماری هەستایە سەرپێ. خۆشەویستییەکی ئازاراویی، بەزەییەکی لەڕادەبەدەر و دڵناسکییەک کەوا دەکات دڵدانەوە و دڵنەوایی ئەو کەسانە بدەینەوە کە بەرەو مردن دەڕۆن، ماری بەرەو لای بێکت پەلکێش کرد. ڕوخساری توڕە و میهرەبانی مێردەکەی بە هەردوو دەست گرت و ماوەیەکی زۆر چاوی بڕییە ڕوخساری. ئینجا بە ئاوازێکی ژنانە، کە تا ئەوکاتە بێکت نەیبیستبوو، داهێزراو و بەگریان و زمانێکی شیرین وتی:
-ئارت، ئەمشەو یەکەمین جارە کە تۆم خۆش دەوێت.
لێ ئارت بە ئەعسابێکی ساردەوە، گوێی لەم دەنگە بوو. دەتوت لەمە بەدوا، هیچ شتێک نییە ئەو بجووڵێنێت و کاریگەری لەسەر دابنێت.

---

**ژۆزێف کێسێل** Josef kessel

**لەدایکبووی**: ١٨٩٨

ڕۆماننووس و ڕۆژنامەنووس

باوک و دایکی ڕووسی بوون. ژۆزیف لە ئەرجەنتین لەدایک بوو. دایک و باوکی گەڕانەوە بۆ ڕوسیا، بەڵام پاش شۆڕشی ١٩٠٥ لەوێ

ڕایانکرد. ماوەیەک ئاوارە بوون، تا لە ئاکامدا لە ١٩٠٨ لە فەڕەنسا نیشتەجێ بوون. ژۆزیف لە تەمەنی ١٠ ساڵییەوە لە فەڕەنسا دەرسی خوێند. جەنگی یەکەمی جیهانیی فڕۆکەوانی فڕۆکەی شەڕکەر بوو، دوای شەڕ بوو بە پەیامنێر و هەتا کۆتایی تەمەنی لەسەر ئەم پێشەیەی مایەوە. سەردانی زۆربەی وڵاتانی کرد. چەند جار چووەتە ئێران و لە ئیرلەندا لە نزیکەوە شایەدی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی ئەوان بووە، لە ١٩٦٢ بوو بە ئەندامی فەرەنگستانی فەڕەنسا. پتر لە پەنجا ڕۆمانی نووسیوە، کە بەناوبانگترینیان "سوارکاران"ە، کە ڕووداوەکان لە وڵاتی ئەفغانستان تێ دەپەڕێت. "ژنێک لە شاری کۆرک" لە کورتەچیرۆکەکانی کە لە ١٩٢٧ بە ناوی "دڵە خاوێنەکان" هەڵبژێردراوە و وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی. ژۆزیف لە ساڵی ١٩٧٩ کۆچی دوایی کرد.

**سەرچاوە:**

**بیست و یك داستان ازنویسندگان معاصر فرانسه**

**ابوالحسن نجفی-**

**چاپ چوارەم -١٣٩٠- انتشارات نیلوفر**

**ص-٤٥-٧٥ (٣٩٦صفحه) تیراژ ٢٠٠٠.**

# حەوت شاری عەشق



نووسەر: ڕۆجەر ئیکۆر Roger Ikor

**وەرگێڕانی لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار**

ڕۆجەر ئیکۆر: لە ساڵی ١٩١٢ لە پاریس لەدایک بووە. زانکۆی تەواوکردوە و ماوەی چەندساڵێک مامۆستای ڕێزمان بووە. لە شەڕی دووەمی جیهاندا بەشداریکردووە و لە ساڵانی ١٩٤٠ تا ١٩٤٥ وەکو دیلی بەرەی شەڕ لە ئۆردوگای ئەسیرەکان ژیاوە. ماوەیەک ڕۆژنامەنووس بووە و دواتر لە بواری ڕەخنەی ئەدەبی و توێژینەوە کاری کردووە. پاشان سەرقاڵی ڕۆماننووسی بووە.

بەرهەمەکانی:

لەنێوان بیاباندا (١٩٥٠)

ئاوە تێکەڵاوەکان (١٩٥٥) ئەم ڕۆمانە خەڵاتی گونکۆری وەرگرتووە.

ئەوکەسەی با دەچێنێت (١٩٦٠)

ئاوازەکانی شەڕ (١٩٦١)

باران لەسەر زەریا (١٩٦٢)

کەمەربەندی ئاسمان (١٩٦٤)

لە ساڵی ١٩٨٦ کۆچی دوایی کردووە.



# حەوت شاری عەشق

نازانم بۆچی هەموو منداڵەکان لە من کۆدەبنەوە. تا دادەنیشم گروپ گروپ بۆ لای من دێن.
"ڤیکتۆر هۆگۆ"
منداڵ بەزەیی ناناسێت "لافۆنتێن"

هەتا بڵێی پیاوێکی چاک بوو. کەتە و چوارشانە و باڵابەرز و قەڵەو و بەخۆ، سوورکار و ورگ زل و گوپێکی زل. دەنگی ئەوەندە زل بوو وەکو نەعرەتە و گرمەی سەربازەکان لە چیاکانی پیرنا دەنگی دەدایەوە.
لە منداڵی و تافی مێردمنداڵییەوە بەهۆی ئەوەوە کە خاوەنی دەست و پەنجەی گەورە بوو، ئازاری دەچێشت، چون دایکی پێی گوتبوو ئەم دەستانە لە دەست و پەنجەی پیاوکوژ دەچێت.

بەڵام ئەو پیاوێکی باش و بەڕەحم بوو. دەستی بەسەر پشیلەی دوکاندار و دەرکەوانەکاندا دەهێنا. گۆنای ئەو سەگانەی دەخوراند کە گەنە پێوەی نووسابوو. دەستی بەسەر لووتی نەرم و لینچکی ئەسپەکان و قەپۆزی کەف چێنەری مانگاکاندا دەهێنا و لە گۆڕەپانی شاردا، بەچەشنێک نوقمی سەیرکردنی چۆلەکەکان دەبوو کە گوێی لە تەپ و تۆز و خەڵک نەبوو و دەستی ئەکرد بە گارەگار: "وەرە وەرە، دویَ دویَ مریشکە جوانەکە" بەم جۆرە بانگی مریشکەکانی دەکرد و هەندێ جاریش بانگی بەرازەکانی دەکرد. بەڵام منداڵەکان وەڕسیان دەکرد. ڕای دەکرد و خۆی دەشاردەوە. ڕۆژێک لە باخی گشتی کەوتنە دوی و لە سووچێکدا گیریان پێدا. باخەوانەکە لە دووڕا هات و گومانی کرد کە ئەم پیاوە باشە، ڕەنگە خەریکی بێئەخلاقی بێت. ئەو بە چاوی خۆی دەیبینی کە دە دوازدە منداڵی گەجەر و گوجەر پێوەی نووسابوون و نوقورچک و گازیان لێدەگرت. بەڵام پیاوەکە خەتابار نەبوو: بێ بەخت حەزیدەکرد چەند دەقیقەیەک لەسەر چیمەنەکە دابنیشێت و بحەوێتەوە بەڵام کەوتبووە تەڵەی منداڵەکانەوە. منداڵ هەستێکی بەهێزیان هەیە بۆئەوەی بزانن کێ دڵ نەرمە و حەزی لە یاریە. دەڵێی بۆنی دەکەن.
پیاوێکی تابڵێی باش بوو. لە بیرەوەریەکانیدا، جۆرێک پەژیوانی شاراوە دیاربوو کە ببوە هۆکارێک بۆئەوەی بەردەوام حەق بە خەڵک بدات. ڕۆژێک، لە تافی منداڵیدا، لەگەڵ هاوڕێکانی لە کەناری چەمێکدا پیاسەی دەکرد لەپڕ پیاوێکی

وەرزێری بینی کە دەیویست پشیلەیەکی بچووک بخنکێنێت. هەیهاوار، چ کارەساتێک. لە هەموو جەرگبڕتر میاومیاوی پشیلەکەبوو کە لەناو تورەکەیەکدا، تەناف پێچ کرابوو. لە نزیک ئەم ئاوە ڕەش و لیخنەدا، کارەسات و جنایەت و تاوانێک نزیکەوڕوودانبوو.

– تۆ دەتهەوێت؟ کەوایە هەڵیبگرە بۆ خۆت. بەلاشە!

پیاوە بەربەر و دڵڕەقەکە، پیاوە ناخڕەشەکە بەدەم پێکەنینەوە گرێی تەنافەکەی کردەوە و دوو سووچی توورەکەکەی گرت و ڕایوەشاند. پشیلەکە کەوتە سەر عەرز و ئەویش لە خۆشی ئەوەی توورەکەیەکی بۆ ماوەتەوە بە پێکەنینەوە شوێنەکەی بەجێهێشت.

پشیلەکە لەسەر چیمەنەکە کەوتبووە هەناسەبڕکێ. ئێستا چیبکات خودایا؟ نەیدەتوانی بیباتەوە بۆ ماڵەوە. ویستی بەجێیبهێڵێ لێ پشیلەکە دەستی هەڵنەدەگرت: گورج و چالاک و بەدڵنیاییەوە کەوتە شوێنیان. پۆل و پییەر کە ڕۆحێکی توند و تیژیان هەبوو، دەستیان بۆ بەرد برد تا ڕاوی بنێن و دووری بخەنەوە. لێ دڵی ناسک و ڕۆحی حەساس، ئەمە بە ئیشێکی بەربەریانە و هەروەها بە پێچەوانەی ئامۆژگاریەکانی مامۆستاکانیان دادەنێت. کەوابێ بیخەنە ناو چەمەکە؟ ئەمەش نامومکین بوو. لە ئاکامدا ڕێگەیەکی باشیان دیتەوە، ڕێگەیەکی مرۆڤانە!! بە دەمی تیژی خاکەنازێک بە توندی وەها بدەن لە سەری کە وڕبێت. پاشان سەری هەڵکەنن بۆئەوەی ئاژەڵی بەستەزمان ئازارنەچێژێت. ئەوان بیستبوویان گیوۆتین کەرەسەیەکی خاوێن و زانستی و سەردەمیانە و پێشکەوتوانەیە، بەچەشنێک کە خەڵکێکی زۆر بە ئاواتەوەبوون خاوەنی گیۆتینێک ببن.

پێنج کەڕەت لەسەری پشیلەکەیان دا هێشتا سەری جیانەبووبووەوە. چاوێکی دەرپەڕیبوو. دەم و قەپۆزی قەڵەشیابوو. لەژێر پێستی ڕەشی زگیەوە لینجاوێکی سوور و سپی دەهاتە دەر. پۆل و پییەر بە نەفرەت و ڕقەوە دوورکەوتنەوە و وەرێکەوتن. بەڵام ئەم منداڵە دڵناسکە، وەکو ئەرکێکی پێ سپێردرابێت بەتەنیا مایەوە: ئایا دەکرێت ئەم ئاژەڵە بەستەزمانە بەوجۆرە جێهێڵێت و ڕێگەبدات ئازاربچێژێت؟ جوانتر ئەوەیە ئیشەکە بە نیوەچڵی نەهێڵێتەوە... ماوەیەکی زۆر خەریک بوو و پەیتاپەیتا بە خاکەنازەکە لە سەروملی پشیلەکەی دەدا، هەرچەند دەیانگوت حەوت گیانی هەیە لێ سەرەڕای ئەو هەموو لێدانە، نەدەتۆپی. دەتگوت کارەبایان لێداوە، هەر لە هەڵبەز و دابەزدابوو. ئەمیش بەردەوام لێیدەدا. هەندێ جار دڵی تێکەڵدەهات. سەری دەبردە پێشەوە و سەیری ئەم قیمە خوێنتکەی دەکرد و سەرلەنوێ هێرشی دەکردە سەری چون گومانیدەکرد کە ژیان و ئازار هێشتا کۆتایی پێنەهاتووە. دە ساڵ پاش ئەم ڕووداوە بە دیتنی پشیلەیان تەنانەت پاڵتاویی دروستکراو لە پێستی ئاژەڵ، هەناسەی سواردەبوو و هەستی دەکرد پێویستی بەوەیە دەستی بەزەیی بەسەر کەسێکدا بهێنێت. جارجارەش گریانی دەهات و فرمێسک لە چاویدا قەتیس دەما.

بەم جۆرە گەورەبوو و دواتر ژنی هێنا.

ئەوەنەبێ حەزی زۆر لە ژن بووبێت لێ ئەمە یەکەم جار بوو لەگەڵ کچێک ئاشنابێت بۆیە تەسەوری دەکرد ئەگەر لێی جیاببێتەوە کچە خەم دایدەگرێت و ئازاردەچێژێت بۆیە خێرا کچەکەی خواست. تازە وای بیردەکردەوە ئەم ژنە نا ژنێکی دیکە!! جیاوازی بۆ ئەو چیە؟ هەموو ژنەکان لەیەک دەچوون. هەموویان حەزیان لە خۆجوانکردن بوو. گشتیان نەرم و ناسک و چاوبەکل و خومار و تارادەیەکیش ئاگری ژێری کا بوون. هەرجۆرێک بێت شانسی بوو چوون ژنەکەی حەزی لە ژیانێکی ئاسوودەبوو چێژ بەلایەوە گرینگ نەبوو. لە سێکسیشدا زۆرتر لەوەی خێر و چاکەی خەڵکی بوێت لایەنگری خۆویستیەکی دوونەفەرە بوو و بەکورتی خوا دروستی کردبوو بۆ ژیانی هاوبەشی.

لە سەردەمی دەزگیرانیدا، وەکو داب و نەریت زۆر جاران پێکەوە دادەنیشتن و بەرنامەیان بۆ ژیانی داهاتوو دادەنا. رایان وابوو سێ منداڵیان ببێت، تەنیا سیان. بەڵگەشیان ئەوەبوو منداڵی یەکەم ئەگەر بمرێت چون نازداری باوک و دایکیەتی خەمێکی زۆر و گران بۆیان بەجێدەهێڵێت. لە دوو منداڵیش ئەگەر یەکیان بمرێت هەر وای لێدێت و شتێک لە وەزعەکە ناگۆرێت. لەلایەکی تریشەوە بوونی دوو منداڵ تەنیا بۆ مانەوەی وەچەیە، نەبەهێزکردنی. هەرچۆنێک بێت مرۆڤ بە نیسبەت کۆمەڵگەوە بەرپرسە. بۆیە سێ منداڵ زۆر بەجێگەیە، عەیبی تێدانیە. ئەم ژمارەیە تەواوە. خۆ ئەگەر لە سیان تێپەرێت ئەمە بێ لوتفیە، ئەمە دابەزینی ئاستی مرۆڤە تارادەی جیهازێکی جووچکە دروست کەری ئەلەکتریکی.

ئایا ئەم رەوانبێژی و بەڵگەهێنانەوەیە کاریگەری دانابوو یان سەرنجی کچەکەی رادەکێشا؟ حەقیقەت چون لە خەیاڵ پەروەری بێ بەری بوو بیرکردنەوە لە منداڵ لە داهاتوودا، دڵخۆشی نەدەکرد. منداڵ لای ئەو هەندێجار وەک بووکەشووشە وابوو جارجاریش وەکو ئاژەڵێکی بچووک سەیری دەکرد کە خاوەنەکەی کەسێکی ترە و تەنیا دەبێت لە کراس و جل و بەرگ و شتەکان دووری بخەیتەوە. لێ سەرەرای ئەمانە بوونی دەزگیرانێکی وا کە لە ئەرکە پیرۆزەکانی ئاگادار بوو و خۆی بە خاوەنی رۆحیەتێکی دایکانە دەزانی، دڵخۆشی دەکرد و بەدەم پێکەنینەوە سەرێکی بۆ ئەلەقاند. ئەم بیرۆکە وایلێکردن کە ماوەیەکی کەم پاش هاوسەرگیری، منداڵ سەریان هەڵهێنا. ئەوەندەی نەخایاند منداڵی یەکەم بوونی خۆی راگەیاند. تازەبووک هێشتا بەتەواوی چێژی لە مێردەکەی وەرنەگرتبوو، لێ تێگەیشتبوو کە پیاوەکەی گوێرایەڵە و پیاوی وەهاش بۆ ژیان بەهرە و لوتف و هاوسەنگیە و ژیان دووکەسی ئەوەندە جوانی و خۆشی تێدایە کە پێویست نەبوو بۆ منداڵبوون پەلەی کردبایە. لەناکاو منداڵی یەکەم لە سکیدا کەوتە جووڵە و لە سەرەتادا، وای پیشان دەدا کە ژیان زۆر شیرینە. بەڵام ئەوەندەی نەبرد هێڵنجدان و رشانەوە و ئازارەکان، ئەم شیرینیەی لێکرد بە ژار. ئوسلۆبی گۆردرا. کە روخساری زەرد و پەڵەپەڵە لێنیشتووی خۆی لە ئاوێنەدا دەبینی، بە ترسەوە لە خۆی دەپرسی ئایا جوانی و

ناسکیەکەی دەگەڕێتەوە بۆی؟ سکی بەردەوام دەئاوسا و لەگەڵ ئەوەشدا ترس لێیدەنیشت: بشێ ئەم دێوە بەرچاوتەنگە گۆشتەکەی بخوات و خوێنی بمژێت؟ یان سکی هەڵبدڕێت و خوێنی بڕژێنێت؟

بەم جۆرە، چەند مانگێک جەستەی ناشیرین و لاروخواری لەملا بۆ ئەولا ڕادەکێشا. لەمەش خراپترە منداڵبوونەکەی دەکەوتە هاوین. کەوایە خواحافیز پشوی هاوین. هاوینیش بەئەنقەست ئەوەندەی تر خۆی جوان و شیرین دەکرد. ماڵئاوا ئێلاخ و کەناری زەریا و مەلە و هەڵپەڕکێ و وەرزش و خۆڕازاندنەوە و نازوباز و سەرنجڕاکێشانی پیاوان و جووڵاندنی هەستی سێکسی گەنجان، ماڵئاوا... کرینی سەیارەی بچووک کە ئەم ژن و مێردە گەنجە دەمێک بوو خەونیان پێوە دەدی. دەبێ لە سووچێکدا دابنیشێت و چاوەڕێ بێت. چاوەڕوانی و ژماردنی ڕۆژەکان و چاوەنواری هاتنی پاییز و باران و سەرما و سکبوون. مێردەکەی بەردەوام مەحەبەتی پێدەکرد تا وورەی بەرزڕابگرێت: "ئەوەندەی نەماوە... جەرگەکەم... سێ مانگی تر... دوو مانگی تر و..."

ژنەکە لێی تورە دەبوو و دەیگووت تۆ هەر بیر لە خۆت دەکەیتەوە: خۆ منداڵ لە سکی تۆدا نیە تا بزانیت چ ئازارێک دەچێژم؟" پیاوەکە نەیدەوێرا دەنگ هەڵببڕێت. لێ دەیزانی کاتێک ئەم بوونەوەرە بچکۆلە زکی دایکی ئەداتە بەر پێلەقە، ژنەکەی لە دڵەوە پێی خۆشە. خۆشیەک کە پیاوەکە لێی بێ بەری بوو. کە ژنەکەی زۆرتر توورە دەبوو لۆمەی مێردەکەی دەکرد کە بۆچی پەلەت کرد؟ با بەرێوجێ و لەکاتی گونجاودا منداڵمان بوایەت. پیاوەکە سەرەڕای توورە و زیزبوونی بە بێدەنگی لەگەڵ ژنەکەیدا دەجووڵایەوە: دەیزانی لە کۆتاییدا، خەڵک هەر ئەم بە تاوانبار دەزانن.

دواجار منداڵەکە هاتە دونیاوە. لێشاوی خۆشەویستی دایک پاش چاوەڕوانیەکی زۆر، بۆ منداڵەکەی، باوکی ڕادا. شەو کە پیاوەکە لە کار دەگەڕایەوە بەتەنیشت سێبەری دیوارەکاندا، بەهێواشی بەسەر پەنجە ڕێی دەکرد. خۆی بچووک دەکردەوە، بەڵام چاری نەدەکرد. کاتێک وەکو ڕۆژانی کۆن و خۆشی ڕابردوو، لەسەر کورسیەک لەتەنیشت زۆپای ژووری نانخواردنەوە دادەنیشت تا ڕۆژنامە بخوێنێتەوە، لەپڕ ژنەکەی دەگەیشتە سەری و قولاپەی دەگرت و وای لێدەکرد ژوورەکە بەجێبهێڵێت: چونکە بەرێکەوت ئەم کورسیە باشترین جێگەبوو بۆ گۆڕینی شۆرت و دایبی منداڵەکەیان. ئەگەر خۆ بچوایەتە ژووری نووستن، کاتی شیرپێدانی منداڵەکە بوو. نەیدەزانی کە بۆچی دەبێ ئەم بوونەوەرە ناسک و نازدارە هەموو کورسی و قەرەوێڵەکانی تەنیا بۆ خۆی دەویست و ڕێگەی بە کەس نەدەدا دابنیشێت و بمێنێتەوە. دەچووە چێشتخانەکە، شیری منداڵ هەر لەوکاتەدا دەهاتە کوڵ و هەڵدەچوو و بنەکەی دەسووتا و هاواری ژنەکەی بەرزدەبۆوە و بە توورەیەوە دەیگوت: "ئاگات لەکوێیە؟ خەوتووی؟ ژن بە بۆنی سووتانی شیرەکە ئەهاتە ژوورەکە و بە بۆڵەبۆڵ لەوێش دەریدەکرد. جێگەی تۆ لێرە نیە؟ ئەی لە کام دۆزەخدایە؟ خۆ ئەم خانووە

دوو ژوور و چێشتخانەیەکی هەیە.... نا نا.... تواڵەتیشی لێیە. بەدزیەوە ئەچوو لەوێ خۆی دەشاردەوە. بەڵام ژنەکەی لەوێش لێینەدەگەڕا. لەپشت دەرگەکەوە بۆڕەی دەهات" لەکام قەبرستاندای؟ جۆنی وەرە برۆ برێک سپیاوم بۆ بکڕە. سەرشۆڕ و گوێڕایەڵ دەچوو و دەهاتەوە. شێو ئامادەنەبوو. دەبوو لە دەرەوە نان بخۆن.

چییان لێهات ئەو خواردەمەنی و چێشتانەی کە بە ئاگری خۆشەویستی دەیانکوڵاند و ساس و تام و خوێی عەشقیان لێدەدا؟ چیدی نە شێویان دەکرد و نە نانی نیوەڕۆ: تەنیا خواردنێکی مەمرە و مەژی واتا وەکو ئینگلیزەکان ئەوەندەیان دەخوارد هێز و وزەی جەستەیان بپارێزێت. تەنانەت شەو، شەوی پیرۆز کە بۆ خەوتن و ڕابواردن و خۆشەویستی دانراوە، باوک هەستی دەکرد ناخی پڕە لە سەرکێشی و سەرەڕۆیی. بەڵام ئەوەندەش بیری لە بێبەختی خۆی نەدەکردەوە. بۆ گەیشتن بە ئامانجی گەورەتر، ئامادەبوو بە پێکەنینەوە ژیانی بەخت بکات. بۆ نموونە ئەگەر لە سەردەمی دیۆکلسین، ئەمپراتووری خوێنڕێژی ڕۆما بژیبا، ئەودەمەی کە دەیانخستە ناو قەفەزی ئاژەڵێکی دڕندە بێ گومان دەبووە یەکێ لە گوێڕایەڵترینی شەهیدانی ڕێگای مەسیحیەت. لێ ئەمرۆکە هەستی دەکرد بەرەوڕووی نەزانی و پووچی بۆتەوە. وەکو کەر لە قوڕدا چەقیبوو. مێشکی جامی کردبوو. بشێ خوا شتێکی جوانتر و ناسکتر و نازدارتری لە منداڵ دروست کردبێت؟ ئەو باڵندە جوان و خنجیلانە کە لەنێو دەستتدا هەست بە گەرمی جەستە و خورپەی دڵە بچکۆلەکەی دەکەیت... بەڵام هاوار و پەنا بۆ خودا لە دەستی ئەم مرۆڤە دڕندە و بەربەرە، ئەم "ئاتیلا"یە. هەندێ جار حەزیدەکرد سەیرێکی منداڵەکەی بکات، لە بێشکەکەی نزیک دەبۆوە، لێ دوودڵ بوو و لۆمەی خۆی دەکرد. دەنگێکی نووساو لە ناخیەوە هاواری دەکرد: "ئاژەڵی پیس، لەبەرچاوم ونبە" و دەنگێکی بۆری پڕ لە سۆز دەیلاواندەوە: "ئاسکەکەم، بەرخەکەم!" هەر لەوکاتەشدا، دایکی بە هەڵەداوان و بەپەلە خۆی دەکرد بە ژوورەکەدا و دەیگوت: "دەستی لێنەدەی، بەو پەنجە ناحەزانەتەوە، ماچی نەکەی بەم ڕیشە زبرەتەوە، ناسکە، بەرگەی ئەوە ناگرێت" ئایا بەڕاستی نیازی بوو ماچی بکات؟ ئەم پلە گۆشتە سوورە، هەم ئەوی پەلکێش دەکرد و هاوکات سڵیشی لێ دەکردەوە. نەیدەزانی قوڕی کوێ بەسەردابکات. لێ سروشتی گەش بینی پێیدەگوت: "ڕاستە، دەبێ ئاگام لە خۆم بێت. گرینگ نیە. ئەمەش تێدەپەڕێت!"

هێدی هێدی بۆئەوەی فەزاکە تێک نەچێت شەوانە بە دزیەوە لە ماڵ وەدەرکەوت و ڕووی لە یانەیەک ئەکرد. لە مەیخانە، لەنێو ئەو هەموو جوانیە، دوور لە دەنگەدەنگ و بۆگەنیووی ماڵەوە، لەو بێدەنگیەدا لەگەڵ خۆی ئاشت دەبۆوە و بەخۆیدا دەهاتەوە. پەشیمان لەوەی قەدری تەنیایی نەزانیبوو. ئەفسووسی دەخوارد کە دەرگەی بەهەشت بەتەواوی بە ڕوویاندا نەکرابۆوە داخرا. بە سەرسوڕمان و ئاخ هەڵکێشانەوە هەستیدەکرد کە مووچەی

کارمەندیی بەشی ناکات. بۆچی؟ ئەمە خۆی ببوە نهێنیەکی سەیر. لە ڕواڵەتدا منداڵ کە خەرجێکی وای نەدەوسیت: نەختێک شیری وشک و پەڕۆوپاڵ و دایبی و ئەم شتانە... خۆ ئەو برە پارەیە بە بۆنەی منداڵەکەیەوە خرابووە سەر موچەکەی دەبوو بڕێکیشی لێ بمایەتەوە. ئەی ئەم بۆشاییە بۆ لای دروست بووە؟ بە حساباتەکەی دا دەچۆوە. کەم و زیادی دەکرد. ئەو خەرجیەی کە پێویست نەبوو، خەتی سووری پیادەهێنا. بەرنامەی تازەی دادەڕشت و بەڵێنی دەدا کە جێ بەجێی بکات... بەڵام بێ کەڵک بوو. ئەم بۆشاییە پڕنەدەکرایەوە. لە هەمووی خراپتر ئەوەبوو ئەم خەرجە زیادیە و ئەم برە پارە سەرفکراوە، هەموو مانگێک بە شتێکی ڕێکەوت دادەنرا و دڵی خۆش بوو مانگی داهاتوو باشتر دەبێت و ژیانێکی ئاسودە و خۆشیان دەبێت. بەڵام مانگەکانی دواتریش ئەم چاڵە هەر مایەوە. بۆ خۆشی نەیدەزانی بۆچی و چۆن چۆنی بوو کە ئەم بۆشاییە و ئەم چاڵە لە ژیانیاندا هاتۆتە سەر ڕێیان. لایوابوو هۆکار دەگەڕێتەوە بۆ منداڵەکەی. کەوابوو بەجەهەنەم! خۆ هیچم لەدەست نایەت. با کێشەی حەوانەوە و ئاسودەگی و بەختەوەری بمێنێتەوە بۆ کاتێکی تر چارەسەری بکەم. سەیارە بچووکەکەیان، وردەوردە لێیان دوورکەوتەوە و لە داهاتوودا بزربوو. دەستیان لە سەیارەی کروکی کراوە هەڵگرت چونکە قەدەغەبوو منداڵ لە سەیارەیەکی کراوەدا ببێت لەبەرئەوەی مەترسی سەرما و هەڵامەت و کەوتنە خوارەوە ژیانی منداڵەکەی دەخستە ژێر هەڕەشەوە. کەوابوو تا پازدە ساڵی تر نەدەکرا سەیارەی کروکی بکرن. تەنانەت لە خەویشدا، عەقڵ ڕێگەی کڕینی شتی وای پێنەدەدان. مرۆڤ دەبێ زۆر دڕندە و بێ بەزەیی بێت کە بەگیانی منداڵی ناسک و نازدار یاری بکات.
منداڵەکەی کوڕ بوو. بەڵام ئەو حەزی لە کچ بوو: چون ناسکتر و خوێن شیرینترن. بەختەوەرانە، لە ساڵانی هەوەڵدا، جیاوازیەکی زۆر لەنێوان کچ و کوڕدا نابینرێت. باوک بە ناچاری تەسلیم بوو و کەوتە ستایش و دوعای خێر. ئەمەش بووە هۆکارێک تا منداڵەکە پایەی کورسی دەسەڵاتی زاڵمانەی لە مێشکی باوکیدا پتر و قایمتر دابمەزرێنێت. ئەو دەسەڵاتە ستەمکارە، کە بەربەریانە و لە دەرەوە بە زۆر و هەڕەشە و گوڕەشە سەپێندرابوو، هێدی هێدی لەلایەن پیاوە بەدیلگیراوەکەوە قەبووڵکرا. پایەی دەسەڵاتی منداڵەکەی تادەهات قایمتر دەبوو لەگەڵ ئەوەشدا نەرمی و جوانیەکی پێوە دیاربوو. وانەبوو کە کەمترین مافی ئازادی پێ درابێت، بەڵکو بە زەرد و سوور دەیخەملاند و ڕەنگی زێڕینی لێدەدا.
بەم جۆرە شەوەکان بەرەو ئارامی و بێدەنگی دەڕۆیشت. مەودای کاتەکانی شیرپێدان زیادی دەکرد و گروگاڵ جێگەی بە قیژە و هات و هاوار لێژدەکرد و کۆیلەی بێبەخت گومانی دەکرد کە سەردەمی ئازادی بەڕێوەیە...
نەگبەت نەیدەزانی کە بە لەدایک بوونی منداڵ، سەیارەی ژیان گێر و ڕواڵەتی گۆڕیوە. پێش ئەم ڕووداوە، داهاتوو لای ئەو لە بەیانیەوە دەستی پێدەکرد. بەرنامەکانی ئەوپەڕی بۆ

چەند حەفتە و چەند مانگێک بوو. ساڵ لای ئەو بەرانبەری بێ کۆتایی بوو، هەنووکە هەفتە بەشێک لە زەمەنی ئێستابوو کەمترین یەکەی زەمانی داهاتوو یەک مانگی تر بوو. داهاتووی نزیک بەپێی ساڵ هەژماردەکرا. گەمژانە بەخۆی دەگوت: "بەم زووانە دان دەردێنێت و گاگۆڵکێ دەکات و ڕێ دەکەوێت" بەم زووانە واتە سێ مانگ، ساڵێک یان دوو ساڵی تر. بێچارە پەلەی بوو ئەم مەودایە هەر ئەمڕۆ کۆتایی پێ بێت. مخابن، زەمان و کاتی بچووک کردبۆوە. تاوانی گەورە و خیانەتی ترسناکی ئەو بەنیسبەت ژیانەوە، هەر ئەمەبوو. پاشان هەوڵی دەدا زووتر پیربێت. خۆی خێرایی ئەم سەیارەی زیاد کردبوو و نەی دەزانی گەڕانەوەی تێدانیە. پەلەی بوو بە سەریعی و خێرایی ژیان تەواوبکات. نەیدەزانی لەوکاتەوە کوڕ ئەچێتە ناو بێشکە، بەرەو گۆڕستان پاڵ بە باوکیەوە دەنێت. دەفتەرێکی گەورەی کڕی و لێی نووسی: "یادداشتەکانی ڕۆژانی ژیانی کوڕەکەم" مێژووی یەکەم پێکەنین، یەکەم دەرهاتنی دان و یەکەم گاگۆڵکەی منداڵەی تێدا نووسیبوو. یەکەم قسە کە کوڕەکەی کردبووی لای ئەو ڕووداوێکی گەورەی مێژووی بوو. بۆئەوەی ئاستی دەفتەرەکە بەرزبکاتەوە ،سەرنج و تێبینیەکانی خۆشی تێدادەنووسی. بۆ نموونە: "ئەم منداڵە بەڕای من زۆر زیرەک و بلیمەتە".

جارجار ئیستێکی دەکرد. دڵەڕاوکێ و بێ ئۆقرەیی و وەسواس بەرۆکی دەگرت. بە ناچار وشەی "زۆر"ی ئەسڕیەوە و لەجێگەی ئەو وشەگەلە بە هەستێکی خۆ بەکەم زانینەوە، دەینووسی: "تاڕادەیەک "ئەمەش جۆرە دڵنیایی و متمانە بەخۆی لە لا دروست دەکرد، بە ورەیەکی بەرزترەوە دەینووسی: "هیوادارم لە تەمەنی دە ساڵیدا بچێتە دواناوەندی و لە شازدە ساڵاندا دواناوەندنی تەواوبکات. بەم جۆرە کاتەکانی بە هەدەر نەچووە و دەتوانێت لە تەمەنی گەنجیدا بچێتە زانکۆ و لە تاقیکردنەوەکانیدا سەرکەوتووبێت". ئینجا چەندساتێک، قەڵەم بەدەست ڕادەما و لەپڕ بەپەلە هێرشی ئەکردەوە سەر کاغەزەکە: "باشە بۆ نەینێرمە زانکۆی ئەدەب؟ ئەی ئەگەر حەزی لە زانست بوو، ڕاستە کۆمەڵگە پێویستی بە هەموو شەهادە و پیشەیەک هەیە، کەوابوو بۆ من ببمە کۆسپ لە ڕێگەی پشکووتنی ئەم بەهرەیە. هەرچی دەبێت باببێت. باچێت ئەندازیاری بخوێنێت..."

شەوانی دیکە خەیاڵ دەیبردە سەر ئەرزی واقیع. دوای ئەوەی تێر سەیری هاتوچۆی سەیارەکانی دەکرد لەپڕ خەیاڵ و داڵغەیەکی تازە سەری هەڵدەدا و ئەویش خێوەت هەڵدان بوو. لەو دەشت و دەرە خێوەتێک هەڵدەیت هیچ خۆشی و چێژێک بەمە ناگات. لێ ئەم بەختەوەریە بۆ کەسێک منداڵی بچکۆلەی ببێت حەرامە و بەتەنیایی جێ بەجێ ناکرێت مەگەر ئەوەی لەگەڵ کارواندا سەفەربکات... نانا پێویستی بە ڕەتڵ و کاروان نیە. خێوەت واتە نووستن لەژێر چادرێکدا. قورس نەیگرم. کە منداڵەکەم گەورەبوو خێوەتێک دەکڕم و بێ مەبەست ڕێگەیەک ئەگرمە بەر و وەکو

قەرەجەکان لەبەرخۆمەوە گۆرانی دەڵێم. یان بە پیاسەکردن یاخود بە پاسکیل... ئەی بۆ بەلەمێک نەکرم ئەوەندەش گران نیە... بەڵەم یان قەیاغ؟ نا قایەقەکە باشترە و بۆ هەڵگرتنی بار و ئەشیا لە ئوردو گونجاوترە...

"لە پازدەساڵیمدا هیوایەتم ئەوەبوو تا دورگەی کێرس بە بەلەم برۆم. کە کورەکەم بوو بە پازدە ساڵان، خۆ عەیب نیە با هەردووکمان پێکەوە سواری بەلەم ببین؟ هەر شەو لە کەنارێک ئەوەستین دوور لە ژاوەژاوی ژیانی نێو شار، شەو لەژێر دارە کاژەکاندا دەنووین. خێوەت هەڵدەدەین، ئاگر ئەکەینەوە، چێشت دروستدەکەین. شەو لەبەر تریفەدا پایپ دەکێشین. بەیانیان پێش رێ کەوتن لە ئاوی فێنکی چەمدا مەلەیەک دەکەین... خۆ ئەگەر شوێنەکەمان بە دڵ بوو ئەوا چەند رۆژ دەمێنینەوە. ئەمەیە برادەری نێوان باوک و کور!"

لەتێکرای ئەم خەونانەدا، ژنەکەی لەبیردەکرد. وێنەی ژن لە ئاسۆی بیرکردنەوەیدا بزرببوو. لێ شەوێک ژنەکەی وەبیری هێنایەوە و بەچرپەوە پێی گوت:

– خۆشەویستەکەم، وابزانم تۆ حەزت لە کچ بوو، وانیە؟

چیدی نەیدەزانی کە حەزی لە کچە یان بەلەم. ئەوەندە نەخایاند مزگێنیان پێدا کە تاکوو چەند مانگی تر، کچێکی جوان و ژیکەلانە بە خێزانەکەیان زیاد دەبێت یان رەنگە کورێکی کاکۆڵ زێرین. سەرلەنوێ بەزمەکە دەستی پێکردەوە. لێ ئەمجارەیان هەڵچوون و داچوونی رۆحی دایک و باوک ئەوەندە بەرچاونەبوو. رەنگە راهاتبوون. چەند مانگی ناخۆشی دووگیانی وەکو بروسکە تێپەری. لە وەختێکەوە پیاوەکە پاڵی دەنا لە ئارەبانەی کاتەوە، ئارەبانەش خێراتر رێی دەکرد. لە ئاکامدا کچەش هاتە دنیا. بەڵێ کچ بوو. کچێکی رێک و پێک. ئیتر دەبێ بیر لەوە بکەنەوە کە گەورەی بکەن. دووساڵی هەوەڵی بەخێوکردنی منداڵ ئەرکێکی زۆر قورسە: منداڵ، رێگە لە دایک و باوک دەگرێت. ئیشەکان بە نیوەناچڵی دەمێننەوە. ماڵ پردەبێت لە بۆگەنی توندوترش و... چاکتر وایە زوو گەورەی بکەین چیدی تا خۆی پیس نەکات. زووتر گاگۆڵکێ بکات. زووتر گروگاڵ بکات و ئەم کرمە خێراتر بچێتەوە سەر شێوەی ئینسان. خێرا سۆز و خۆشەویستی دایک و باوکی رابکێشێت! خێرا... خێرا.

ئەوەندەی نەخایاند کە کابرا بە ئارەزووەکانی گەیشت لە کلاوچەرخانێکدا کچەکەی دوو ساڵ و سێ ساڵی تەواوکرد. ئێستا کورە گەورەکەی کاتی ئەوەبوو بچێتە قوتابخانە. باوکی دەبوو دوو دەفتەری یادداشت بکرێت یەکێکیان بۆ کچەکەی و ئەویتریان بۆ کورەکەی. لێ هەردوو دەفتەرەکە سپی بوون. دەرفەتی نەبوو بیرەوەریەکانی بنووسێت سەرەرای ئەمەش تێگەیشتبوو گەرم و گورترین قسەی منداڵ کە دەچێتە سەر کاغەز وەک سەهۆڵ سارد دەبێتەوە. کەوابوو بۆ کاتە بەنرخەکانی لەخۆرا بەفیرۆبدات؟ کات هەر کاتە، هەتا زووتر تەواوبێت، باشترە. تەنانەت لەم نوکتەش

تێنەدەگەیشت. گلۆڵەی ژیانی وەکو زنجیرە ڕووداوێکی خێرا، بەخێرایی لەکرانەوەدابوو. هەمووجارێک لە دائیرە دەگەڕایەوە خێراتر ڕێی دەکرد و لەخۆی دەپرسی بشێ چ کارەساتێک لەماڵەوە ڕوویدابێت؟

لەئاکامدا ڕۆژێک لێی قەوما: لەسەر قاندرمەکان تەرمی ژن و منداڵەکانی بینی - نانا شوکور بۆ خوا نیوەگیانێکیان تێدامابوو. کوڕەکەی بەلۆعەی غازەکەی کردبۆوە و دایک و خوشکەکەی بەهۆی ئەمەوە بورابوونەوە. ئەگەر سەعاتێک درەنگتر بچوایەتە ماڵەوە ئەوە دەبوو سێ تابووتی ئامادەبکردایە. ڕۆژێکی تر سەرەی کچەکەی بوو: لە توالێتدا درگای لێ عاسی ببوو، بە ناچار دەرگەکەیان شکاند. هەندێ جار لە چێشتخانەکە ئاو کۆدەبۆوە و بن میچی ژووری خوارەوەی تەڕدەکرد و ساحێب خانووەکە هاواری لێهەڵدەستا. هەندێ جار بەقەڵەم لەسەر دیوارەکان نەخش و نیگاریان دەکێشا و گەلێ جاریش بە بزمار دیوارەکەیان هەڵدەکۆڵی و ژووری نانخواردنەکەیان دەڕازاندەوە. یان ئاگاداریان دەکردەوە کە کچەکەت خەریک بوو لە پەنجەرەکەوە بەربێتەوە. بەپەلە ڕای دەکرد بۆلای ئاسنگەرێک و داوای لێدەکرد محەجەرەیەکی بۆ دروست بکات. بەڵام ئەمەش دادی نەدەدا چونکە ئەمجارە مقەستی هەڵگرتبوو و ئەوەندەی نەمابوو چاوی خۆی کوێربکات. بەپێی یاسایەکی گشتی مەترسی لە شوێنێکەوە کە چاوەڕێت نەدەکرد بەرەوڕووت دەبۆوە. دایک بەدەم ئاخ هەڵکێشانەوە دەیگوت: "پێویستمان بە شوقەیەکی گەورەتر هەیە.

منداڵەکان ئەوەندە لەم هێلانەدا ماونەتەوە، هاربوون "لێ هاریی ئەوکاتەبوو کە کوڕەکەیان ئەیویست مەشقەکانی بنووسێت و کچەکەشیان نیازی وابوو یارمەتی بدات. ئەو وەختە هاریی دایک و باوکیشی ئەگرتەوە. خۆشەویستی باوک هەڵدەچوو و دەستی هەڵدەبڕی و ئەیدا بەسەر دوژمنەکانیدا. دواتر شەرمەزار و پەشیوان دەستی لە لێدان هەڵئەگرت و ئەچووە سووچێکەوە. دەتگوت دەساڵ پیرتربووە. لێ ئەمانە تەئسیری نەبوو. لەبەرئەوەی دەبوو هۆکاری بێبەختیەکانی خۆی ببینێتەوە: واتە هەرچی زەمانی کورت دەکردەوە زۆرتر خۆی بەرەوڕووی قازانج یان توندوتیژی ئەکردەوە. پیشاندانی خۆشەویستی زیادی ئیشی ئەو کەسانەیە کە وەخت و مەجالی تەواویان هەیە. هەر کە کات بوو بە زێڕ، مرۆڤیش بێ ڕەحم و خوێنڕێژ ئەبێت.

ڕواڵەتی شتەکان کوێری کردبوو و هەر ڕۆژێک بەرەوڕووی هەڵەیە دەبۆوە. ژنەکەی دەیگوت: "خەتای ئەم خانوەیە!" و خۆشی دووپاتی ئەکردەوە: "خەتای خانوەکەیە" ئینجا لەبری بەکارهێنانی باشتری زەمان بەپێی بەرنامە داڵغەی شوێن هەڵیدەگرت و بەشوێن خانویەکی گەورەتردا ئەگەڕا. لە بێ بەختی خانووکەم بوو: لەکوێ و لە چ کاتێکدا ئەم کێشە نەبووە؟ لێ ئەگەر پارەی زۆرتر بدابا... پارەی زۆرتری دا و بوو بەژێر باری قەرزەوە. شانسی هێنا موچەکەی زیادی کرد. هەندێجار بەڕێکەوت ئەم شتانە ڕوودەدات.

چونکە پیاوێکی گەش بین بوو، وای بۆ

ئەچوو تا دە ساڵی تر پاشەکەوتێکی کەمی بۆ دەمێنێتەوە و ژیانی خۆشتر و ئاسوودەتر ئەبێت. هەرجۆرێک بێت کێشەکان کۆتایی پێدێت و تا ئەو وەختە خواگەورەیە. ئەم قۆناغەش تێئەپەڕێنێت بۆ گەیشتن بۆ ئەم مەبەستە، زۆرتر ئیشی ئەکرد بە پاڕانەوە لە دائیرە داوای کاری زیادەی ئەکرد. جنێو و قسەی ناخۆشی بە هاوکارەکانی ئەدا و بۆ بەڕێوەبەر ماستاوی سارد ئەکردەوە، بۆئەوەی پلەوپایەی بەرزبێتەوە. چیدی دەرفەتی نەبوو وەبیر خۆی بێنێتەوە کە ئەو پیاوێکی دڵ ناسک و باش بوو. ئەم کارانە دڵی کردبوو بە بەرد. بەختەوەرانە ئاسۆ ڕوون بووەوە: قوتابخانە ئامادەبوو کوڕەکەی وەربگرێت هەروا کە پێشتر کچەکەشیان لێوەرگرتبوو. بەم جۆرە ماڵەکە لە زۆربەی کاتەکاندا کپ و بێدەنگ دەبوو و لەدەست دوو منداڵی تووش ڕزگاریان دەبوو. (بشێ قوتابخانە جگە لەمە ئەرکێکی تری هەبێت؟) چیدی دایک و باوکەکە ئەیانتوانی هەناسەیەک بە ئارامی هەڵکێشن و لەم دەرفەتەدا، وەکو ئینسان ژیان ببەنە سەر و ئەرکی باوکانە و دایکانەی خۆیان بە دڵگەرمی زۆرترەوە بەجێهێنن.

ژنە ئەم دەرفەتەی بە هەل زانی و بەگوێی مێردەکەیدا دا کە حەزی لە منداڵی سێهەمە. منداڵی سێهەم؟ پیاوەکە بە سەرسوڕماوی و خەمبارییەوە سەیرێکی ژنەکەی کرد، لێی ڕاما و بۆ یەکەم جار پاش چەندساڵ ژیانی هاوبەشی نەیناسیەوە. لە بیرەوەری ئەودا، ژنەکەی کچێکی شۆخی بەژن زراڤ و شەرمێون بوو لێ ئێستا لە بەرامبەریدا ژنێکی قەڵەوی سی ساڵەی بە ئەزموون، دایکێکی تەواو، یان مریشکێکی هێلکەکەری ئەدی. لەخۆڕا ویستی موخالەفە و سەرکێشی بکات. ژنە دەسبەردارنەبوو. لەبەرئەوەی زاکیرەیەکی باشی بوو، قسەکانی مێردەکەی لەپێش هاوسەرگیریدا وەبیری ئەهێنایەوە تا فەرامۆشی نەکات. پێی ئەوت: "تۆ خۆت نەتگوت سێ منداڵت ئەوێ؟" چەند قسەیەکی تریشی وەبیرهێنایەوە کە یان پیاوەکە لەبیری کردبوو، یان ئەم لەخۆوە هەڵیدەواسی. لەئاکامدا دڵی مێردەکەی نەرم کرد و گوتی: "بەیانی تا شەو تۆ لە دائیرەیت و منداڵەکانیش لە قوتابخانە، من بە تاقی تەنیا لەم خانووە گەورەدا بێ تاقەت ئەبم. تۆ هەر بیر لە خۆت ئەکەیتەوە. تۆ تەنیا قازانجی خۆت ئەوێت" ئینجا فرمێسکی هەڵئەڕشت. پیاوەکەش لەبەر دڵ ناسکی تەسلیم ئەبوو. ئەوەندەی نەخایاند نیشانەی سەرکەوتن لە ڕوخساری ژنەکەدا دەرکەوت. گەشایەوە. کوڕ یا کچ؟ فەرقی نیە. گرینگ خودی منداڵەکەیە، ئەگەر نێرەمووکیش بێت. ئەمجارە ڕووداوەکە بە ئاسانی تێپەڕی: چەرخی منداڵ خستنەوە کەوتبوە گەڕ. قۆناغی سکپڕی و لەدایک بوون و ساڵی یەکەم و دووهەمی گەورەکردنی منداڵەکان لە پەراوێزی ژیانیاندا بەخێرایی برووسکە تێپەڕی. باوک ئیتر بیری لە کڕینی دەفتەری بیرەوەری تازە نەکردەوە. تازە دوو دەفتەرە کۆنەکەش لە سووچێکی چەکمەجەدا، تەپ و تۆز لێ نیشتوو لەبیرکرابوون. ئێستا هەموو داڵغەی ئەوەبوو کە ببێتە هاوڕێیەکی باش بۆ کوڕە گەورەکەی.



مەشقەکانی بۆ دەنووسی. لایەنی ئەوی دەگرت و باسی نەخوێندەواری مامۆستاکانی دەکرد. هەندێ زانین و زانیاری فێرببوو، لێ لەبیری نەمابوو کە ئەم زانیاریانە بیست ساڵ پێشتر خۆی لە قوتابخانە خوێندبووی.
منداڵی سێهەم زۆر دڵپاک و بێ ئەرک بوو. بۆ خزمەتی بەرژەوەندی گشتی هەوڵی دەدا کەس وەڕەس نەکات و لەم ڕێگەدا هەوڵێکی زۆری دا بۆئەوەی خۆی بێدەنگ و بەئەدەب و گوێڕایەڵ و عاقڵ پیشان بدات کە بوە هۆی نیگەرانی دایک و باوکی.
ئاخر منداڵێک کە بێ دەنگە، کاری بە کەس نیە و خۆی سەرقاڵ دەکات و لەخەیاڵدا دەژی، بەکەمی حەزی لە یاریکردنە، شتی ناوماڵ ناشکێنێت، مرەی نایەت و نان کەم دەخوات. ئەمە پیشان ئەدات کە منداڵێکی ئاسایی نیە. بردیانە لای دوکتۆر. ژمارە سێی بێ بەخت. لەکاتێکدا یەکەم و دووەم تەندروستیان تەواو بوو، ئەم لەم بوارەدا کێشەی بوو. نەخۆشیەکەی وانەبوو لە خەستەخانە بیخەوێنن: بۆخۆشی هێندە لە دەنگەدەنگ و ژاوەژاو دڵی تۆقیبوو ئامادە نەبوو بەتەواوی خۆی بدات لە نەخۆشی نەبا لێینەگەڕێن. هەندێجار سەفرای بوو. جارجار کالیسیۆمی جەستەی کەم بوو. هەڵامەت لێیدەکرد بە سینەپاڵوو و کۆڵنج بەرەو سکچوونی خوێنی دەبرد و ڕووشاندنێکی پێستی لێ دەبوو بە برین. بەختەوەرانە هیچوەخت نەدەگەیشتە سنووری مردن. بەکورتی نەخۆش بوو. هەموو ئەندامانی ماڵ لە دەوری کۆدەبوونەوە و سەیربوو لەلایان کە داوای شت لە کەس ناکات

و بێدەنگ و هێمن لە سووچێکدا دادەنیشێت و بە پێکەنینەوە وەڵامیان دەداتەوە. دوکتۆر دەیگوت: "کە بوو بە پێنج، شەش ساڵ، باشتر دەبێت" دایک و باوکیشی هەموو هەوڵیان ئەوەبوو زووتر بیگەیێننە ئەم تەمەنە.
لەئاکامدا بەم مەبەستە گەیشتن و ئاسودەبوون. بەپێی پێشبینیەکانی دوکتۆر، ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو کە سێهەم منداڵ بالابکات. دوورنمای بەختەوەری داهاتووی ئەم بنەماڵە لەبەر چاویاندابوو: خێوەت، بەلەم، سەیارە، سەفەر و خۆشەویستی و...
لەم سەر و بەرەدا جەنگی جیهانی دەستی پێکرد. ئەویش چ جەنگێک؟ بڵێی دوژمن لە ڕۆژئاوا یان ڕۆژهەڵات یان باکور یان باشور هێرش بکات یان... فەرقی چی بوو؟ هەر بیست و پێنج یان سی ساڵ جارێک، دەرفەتێکی گونجاوە بۆ دروست کردنی سوپا و سەربازی تازە، دەبێت شەڕێک ڕووبدات و پێنج یان شەش ساڵیش کاتێکی دیاریکراوە بۆئەوەی ئەم پێگەیشتووانە بە کوشت بدرێن. پاشتر سەرلەنوێ سەرباز دروست دەکەنەوە و دووبارە شەڕ. شەڕ دەستی پێکرد. باوکیان جلی سوپای لەبەرکرد و لەگەڵ چەند ملیۆن سەربازی تردا، بێ ئەوەی دەرفەتی ڕاکردن و کوشتنیان ببێت، هەموویان خڕ بەدیل گیران و دوژمن گشتیانی لە ئۆردوگادا نیشتەجێ کرد و حەفتە و مانگ و ساڵەکان بەم جۆرە تێپەڕین.
دوژمنەکان چەکی قورس و کۆکوژ و بۆمبای هیدروژینی و کیمیایی و دەیان چەکی تریان پێ بوو. لێ لە نەگبەتی بەکاریان نەهێنا و نەهێنا تا شەڕ بەپێی بەرنامە هەر درێژەی هەبێت. دیلە نەگبەتەکەی ئێمەش هەر ڕۆژ و مانگەکانی دەژمارد تا بەتەواوی وەڕەس بوو و تێگەیشت کاتی یەکجار زۆری هەیە. چ ئیحساسێکی ناخۆش و ئازاردەر. تائێستا بەدەس نەبوونی کاتەوە دەینالاند و ئێستە بە عەکسەوە. بیری دەکردەوە و بەو دەرەنجامە گەیشت کە لە هەبوونی منداڵەکانیدا، زەمان کورت دەبێتەوە و هەروەها نادیاربوونیان هۆکاری درێژبوونەوەی کاتە. کاتی کەم دڵەڕاوکێی لەگەڵدایە و کاتی زۆریش داهێزران و خەمباری. کاتی کەم ژیان حەپەلوش دەکات و کاتی زۆریش ڕق و نەفرەت ئەخاتەوە. کەوابوو کاتی دروست، معدلی ئەم دوانەیە بەڵێ ئەم کاتە نە زۆر نە کەمە، ئەم کاتی بەختەوەریە چۆن بەدەست بهێنێت؟ ناچار، هاتە سەرئەوەی کە ڕابکات. پاش ساڵێک هەوڵ و تەقەلای بێ خێر و دروست کردنی پێناسی تەزویر کە لێیان گرت دارمانی ئەو تونێلانەی کە هەڵیکەندبوو، لەئاکامدا خۆشی بە پیریەوە هات و بە جل و بەرگی مەدەنی و گیرفانی پڕ لە نوقڵ لە کەش و هەوایەکی خۆشدا ڕایکرد و بەهەڵە سەری لە وڵاتی دوژمن دەرهێنا لێ بوێرانە هەنگاوی هەڵدەگرت و نیازی وابوو بە پیاسە دووهەزار کیلۆمەتر تا ماڵ خۆیان ڕێ بکات. دوو ساڵ لە دیلیەتی ئەو تێپەڕیبوو. لەم ماوە وای بۆ دەچوو کە کۆمەڵگەی ئینسانی لە پیاوانی عەسکەری کە لە کەپری دارینەدا دەژین، دروست بووە. لەگەڵ گەیشتنی بە یەکەم دێ، کەوتە گریان کە چاوی بەو ژن و منداڵ و خانووە ڕەنگاوڕەنگانە

کەوت خۆشەویستی و دڵپاکیەکەی کە پەنگی خواردبۆوە سەررێژی کرد. سڵاوێکی لە ژنەکان کرد. ژنەکانیش کە مێردەکانیان لە بەرەی شەڕ بوون، بە پێکەنینەوە وەڵامیان دایەوە. منداڵەکان بە نیگای ساف و شین و پاک و بێگەردیانەوە و بە خۆشەویستیەوە چاویان بڕیبووە ئەو و ئەمیش پێدەکەنی. منداڵێکی دە ساڵان، کە لە فریشتەیەکی بچووکی دەکرد سەرنجی ئەمی زیادتر ڕاکێشابوو. ڕاوەستا و مشتێک چۆکلێتی لە گیرفان دەرهێنا و دای پێی. منداڵەکە بە زمانی خۆی سوپاسی کرد. پیاوەکە ملی ڕێگەکەی گرت. کیلۆمەتریک لەولاترەوە دوو ژاندارم هاتن و لەپشتەوە گرتیان. هەر ئەو فریشتە بچکۆلە، پاش خواردنی چۆکلێتەکان لێی کەوتبوە گومان و ئیخباری کردبوو. ژنەکان هیچیان نەدرکاندبوو. چونکا ئەوان فریشتە نەبوون. بەم جۆرە تا کۆتایی شەڕ، تەمەنی لە ئۆردوگای دیلەکاندا بردەسەر. کە گەڕایەوە بۆ ماڵ تەمەنی چل ساڵ دەبوو. منداڵەکانی تەمەنی هەرزەکاریان تێپەڕاندبوو. خۆشەویستی لە دڵیا وشک ببوو. وەکو جاران شەرمێون نەبوو. هاتە سەر ئەو ڕایە کە ژیانێکی دیکە بۆ خۆی هەڵبژێرێت و بیر لە کەس نەکاتەوە. بشێ ئەمە لە سۆز و هەڵچوونی ڕۆحی بێت یان جۆرێک بێ ئەزموونی کە هۆکارەکەی شەرمێونی و حەیابەخۆیی چەند ساڵەی ئەوبوو. ڕەنگە ژنەکەی بە کەم زانیبێت و وایدانابێت چیدی خۆشەویستی پێ ناکرێت. لێ، هەرچۆنێک بوو پاش چەند مانگ، ژنەکەی سەرلەنوێی سکی هەبوو. پیاوەکە سەری سوڕمابوو. منداڵی چوارەم بەڕێوەبوو. بەڵێ منداڵی چوارەم: بەرهەمی زیادبوونی ناچاری وەچەی پاش شەڕ. باوک سوێندی خوارد کە تا ئەوڕۆژەی ماوە نەکەوێتە ئەم داوەوە. بەڵام ئێستا لە دەستی دەرچووبوو. ئەفسووس، لەبیری کردبوو کە منداڵەکانی لە تەمەنی هەرزەکاریدان، کچە گەورەکەی هەڵەیەکی کرد خۆی دۆڕان. ناچار بەپەلە دایان بە شوو و لە کۆڵ خۆیان کردەوە. لێ لەبەرئەوەی بارودۆخی ماڵیان باش نەبوو، دایک و باوکی کوڕەکە گەورەکردنی منداڵەکەیان لە ئەستۆ گرت. ئەمەش بە ڕێگە و جێگە بوو، چونکە منداڵە چوارەمەکەیان تازە خەریکبوو پێی دەگرت. دواجار سەرەی کوڕە گەورەکەبوو ژنی بۆ بێنن. پاشان منداڵی کوڕەزا و کچەزا تەنگیان بە باپیریان هەڵچنیبوو. ئێستا سەرەی ژمارە سێ بوو بەڕێی بکەن ویستیان قۆڵی لێ هەڵبماڵن تا ڕێگە بۆ چوارەمین منداڵ ئاوەڵەبێت. خەڵک کە ئەم خێزانەی دەدی، دەیانگوت: "چەند خێزانێکی بەختەوەرن" هەندێ بەخیلیان بە باوە گەورەیان دەبرد. بەڕاستی ئەم پیاوە لە هەموو خەڵکی تر بەختەوەرتر و سەرکەوتووتر بوو. بە ئارەزوەکانی خۆی گەیشتبوو و لەکۆتایشدا، لە تەمەنی پەنجا و شەش ساڵیدا توانیبووی سەیارەیەک بکڕێت. بەوپەڕی خۆشەویستیەوە، سەیارەی دەئاژوو. ئەمە تەنیا شتێک بوو کە لە دڵەوە خۆشیدەویست. خۆشەویستی چیدی لای ئەو مانای نەمابوو. لێ مرۆڤ نانی ناوەکەی دەخوات.

بەلەم و خێوەت لەو تەمەنەدا ئیدی سەرنجڕاکێش نەبوون. لەبری ئەمانە تەلەفزیۆن و سەلاجە و

غەساله و خانووی ئێلاخی جێگەی ئەوانی تری له وڵاتی ئارەزوەکانیاندا گرتبۆوه.

***

چ هەڵەیەکی گەورەیە که هەمووسالێک ڕۆژی لەدایک بوونی منداڵەکان دەکرێته جێژن. هەڵەیەکی گەوره بۆ ئازاردانی خەڵکانێکی چاک. ڕۆژێکیان هەموو ئەندامی خێزان کۆبوونەوه تا یادی هەفتا ساڵی باوه گەورەیان بکەن به جەژن. گەورەی ماڵەکه سەری هەڵبڕی و زانی که تەمەنی تەواوبووه. بێچاره پێی وابوو که هێشتا دەرفەتی هەیه بژی. هەر لەوکاتەدا مزگێنییان پێدا که نەتیجەکەی هاتۆته دنیا و خۆی بووه به باپیره.

ئینجا ئەم پیاوه دڵناسک و دڵ سافه، ئەم پیاوه غەدر لێکراوه، هەستی کرد چەقۆ تا سەر ئێسقانی ڕۆچووه. تەحەمولی نەمابوو. دەستی خسته دەور کەمەری و له شوێنی خۆی هەستا. بۆ وەدەست هێنانی مافی پێشێل کراوی خۆی، بێ بیرکردنەوه و بێ بەزەییانه دەستی دایه کوشتن: دەسته بکوژەکانی خسته گەڕ. لەپێشدا ژنەکەی خنکاند. دواتر دوکانداری گەڕەکەکەیان و نانەوا و پۆلیسێک و مامۆستایەک و بەریدی پۆستەکەی خنکان. جینالولو بریجیدای کوشت. سەرەک کۆماری کوشت و بۆیاخچیەکی له سەنگاپوور خنکان.

تەنانەت ئالبەرت ئەنشتەینیشی خنکان. ڕاسته ئەو پێشتر مردبوو لێ گرینگ نەبوو. چون وەختایەک ئەم پیاوه ناخ ڕەشه خیانەتکاره گومانی دەکرد که دنیا دەخنکێنێت له واقعدا، ئەوه دنیابوو خەریک بوو ئەوی دەکوشت.

ئەندامانی خێزانەکه ئەگریان و ئەفسووسیان دەخوارد که ئەم پیاوه دڵناسکه لەخۆشیاندا هاربووه.

---

**سەرچاوه: بیست و یەك داستان له نووسەرانی سەردەمی فەرەنسیی. چاپەمەنی نیلوفەر - چاپی چوارەم - ٢٠١٣ - تاران. ٣٩ لاپەره. لاپەرەی ٢٥٩ - ٢٧٦. وەرگێر له فەرەنسییەوه بۆ فارسی: ابو الحسنی النجفي. نووسەر: ڕۆجەر ئیکۆر** Roger Ikor.



# چەند مینیماڵێکی ڕەسوڵ یۆنان

ڕەسوڵ یۆنان

**لە فارسییەوە: جهبار سابیر**

**هیچ ژمارەیەک ڕاست نییە**

یەکەم: ئەوان حەوت کەس بوون.

دووەم: بەڵام من ژماردمن زیاتر بوون!

یەکەم: گرنگ نییە من کەیفم بە ژمارە حەوت دێت.

دووەم: کەواتە ڕاسپێری ئەو دوو کەسە زیادەیە چی لێدێت؟

یەکەم: ئەوانیش سێ کەس بوون نەک دوو کەس. نەکا تۆیش کەیفت بە ژمارە دوو دێت؟

دووەم: بەڵێ.

هەردووکیان پێکەنین. ئیدی هەوڵیان نەدا قسەیەک لە بارەی ئەوانەوە بکەن کە لە ڕووداوی کەوتنە خوارەوەی هێلیکۆپتەرەکەدا بووبوونە قوربانی.
ئەوان دە کەس بوون.

**بابەتی زەینی**

کابرایەک بە قەلەڕەشێکەوە چووە کافێیەکەوە و ڕووی کردە ڕۆشنبیران و وتی:
ئەم قەلەڕەشە لە من بکڕن و مانا بدەنە ئازادی.
کەس بایەخی بە قسەکەی نەدا!
تەنها یەکێک لەوان وتی:
ئازادی بابەتێکی زەینییە.
پاشان خۆیشی بۆ هەوا گۆڕین چووە دەرێ.

**لە بەسەرهاتەکانی کافێی چرا**

بوونەوەرەکانی بۆشایی ئاسمان
دەرهێنەر موچیاری پێویستی ئەو ئەکتەرانەی کرد کە جلوبەرگی بوونەوەری بۆشایی ئاسمانیان لە بەردابوو و لە کۆتاییدا وتی: گریمانەی بکەن بەڕاستی بوونەوەری بۆشایی ئاسمانن!
یەکێک لە ئەکتەرەکان بە بیستنی ئەم ڕستەیە زۆر ڕەنجا. بە تەنیشتەکەی وت:
وانییە؟
ئەو وەڵامی دایەوە: مەیهێنە دەنگ! نابێت ئێمە بناسن!

**سێرک**

خاوەنی سێرکەکە لە ناوەڕاستی تەختەی شانۆکەدا جەڵدە لێیدا و کەوت. مەیمونەکە بۆینباخەکەی کردەوە و لە ملی خۆی کرد. بینەران پێکەنین و چەپڵەیان لێدا. لە ڕوانگەی ئەوانەوە هەموو شتێک یاری بوو.

**ئۆرفە**

دنیا گۆڕا. ئۆرفە کە زمانی باڵندەکانی دەزانی، دوکانێکی باڵندە فرۆشی کردەوە. پێیوابوو پارەیەکی زۆر دەخاتە گیرفانییەوە، بەڵام بە پێچەوانەی چاوەڕوانییەوە، ئیفلاسی کرد. ئەو نەیتوانی هیچ باڵندەیەک ڕازی بکات بۆ فرۆشتن.

### جێگەیەک بۆ گەڕانەوە

کابرا: دەمەوێ بگەڕێمەوە!
ژنەکە: بۆ کوێ؟
کابرا تێدامابوو. ساڵانێک پێشتر لافاو مەفتەنەکەی وێران کردبوو.
ناچار پرسی: جێگەیەک پێنازانی؟
ژنەکە وتی: نا!
کابرا لە ژێر لێوەوە چرپاندی: زۆر خراپ بوو.
بۆ سبەی کابرا بۆ ماوەی مانگێک لە ماڵ چووە دەرێ تا جێگەیەکی بۆ گەڕانەوە هەبێت.

### ئەکتەرەکان

وتی: من تۆم کرۆزم!
بیچمی شۆفێرەکە لە ئاوێندی ئۆتۆمبیلەکەدا تێکچوو و پرسی:
ئەم پیاوە دووسەد کیلۆیە ئێژێ چی؟
سەرنشینەکەی پەنا کابرای قەڵەو وەڵامی دایەوە: وێڵێکە شێت بووە!
ئەمەیش داستین هۆفمەنە، بەڵام نازانم بۆچی خەڵکە تازەکە وادەزانن تۆم کرۆز لێرەیە.
شۆفێرەکە لەمەی کە دووبارە لە دەوروبەری نەخۆشخانە دەروونییەکە سەرنشینی سەرخستبوو هەستی بە پەشیمانی کرد.

### دزێکی بەدبەخت

چووە پشت مێزەکەوە. دوور لە چاوی کڕیاران و کارمەندان، دەخیلەی فرۆشگەکەی بەتاڵ کرد. هەستی بە لە خۆبایی بوون دەکرد لە پێگەکەی، بەڵام کاتێک خەریکبوو لە فرۆشگەکە دەهاتە دەرێ، تەواو سەرشۆڕ بوو.
چەند کەسێک هاتنە پێشەوە و بە قامکی ئاماژە کامێرای چاودێریان پیشاندا و پێکەنین.

### گەمژە

تاقە شانازی ژیانی ئەمە بوو ڕێک لە کاتژمێر حەوتی شەودا دەچوو بۆ کافێی حەوت. کاتێک دەچووە ژوورێ مشتەرییەکان بە بینینی ئەو سەیری کاتژمێری قەد دیواری کافێکەیان دەکرد و وەک ئافەرینێک پێدەکەنین. هەوڵی دەدا ڕێکوپێک بێتە بەرچاو. ئارەزووی بوو کاتژمێر حەوتیش

بمرێت، بەڵام کاتێک مرد لە بەختی بەد ڕووداوەکە ڕێک لە کاتژمێر هەشتی شەودا بوو.

**شاعیر**

ئەسپەکەی بردە ڕۆخی ڕووبارەکە تا ئاو بخواتەوە. هەوا ئارام و مەنگ بوو. کاتێک خەریکبوو سەیری وێنەی خۆی دەکرد لە ئاوێنەکەدا، ئەسپەکە سەری دانەواند و سەری ئەوی خوارد.
شەو کاتێک دەیویست شیعر بنووسێت هەستی کرد لە ئەوکی ئەسپەکەدا لنگەفرتێیەتی.

**سەعاتچی**

سەدەگەلێکە کاتژمێرەکانی لە کار کەوتوون. شەو و ڕۆژ خەریکیان دەبێت، بەڵام هێشتا نەیتوانیوە تەنانەت یەکێک لەوانە نۆژەن بکاتەوە. ئەم بابەتە ئازاری ئەو دەدات. نیگەرانی بێ ڕێزبوونی ناوەکەیەتی. هێشتا نازانێ مردووە.

**مرۆڤە عاشقەکان**

– خاوەنی کافێکە مۆمێکی پێکرد و لەسەر مێزەکە داینا. سوپاسیم کرد و وتم خۆشحاڵم کە هێندە بایەخ بە خەون و خولیا و شتە جوانەکان دەدەیت. ئەو لە کاتێکدا کە پێدەکەنی، وەڵامی دایەوە: من کەیفم بە مرۆڤە عاشقەکان دێت. مرۆڤە عاشقەکان سەرنجڕاکێش و خۆشەویستن.
تۆزێک بێدەنگ بوو و پاشان پرسی: بە بۆچوونی تۆ چۆنت زانی من عاشقم؟
– لەوێوە کە هەستت بە بڕانی کارەبا نەکرد! من لەوێ بووم!

بەسەرهاتی ئەو دوو دێوانە ترسناکە دوای هەڵاتن لە زیندان
ماوەیەک لە زێرابەکەدا و لە پەنا مشکەکانەوە گوزەراندیان و ماوەیەکیش لە ژێرزەمینێکی فەرامۆشکراو و شێدار. لەوێوە کە لە مرۆڤایەتی دوورکەوتبوونەوە، ئیدی نەیانتوانی لە نێو مرۆڤەکاندا جێگەیەک بۆ خۆیان پەیدا بکەن.
دواجار لە ترسان خۆیان لە گۆڕستانەکە شاردەوە و تا کۆتایی ژیان لەوێ ژیان.

**چاوەڕوانی**

کابرا شەش مانگ چاوەڕوانی کێشا، بەڵام ژنەکە نەگەڕایەوە.
– ئیدی چاوەڕێت ناکەم.
کابرا ئەم ڕستەیەی بە ئیمیلێک بۆ ژنەکەی نارد و ئەمجارەیش چاوەڕێ وەڵامی کرد.

## ئارەزووی هاوینەی باوکێکی هەژار

چووە پێشێ تا میوە بۆ منداڵەکانی بکڕێت، بەڵام کاتێک نرخەکانی بینی چاوپۆشی کرد. کە بە ڕێگەدا دەڕۆیشت، گریان قورگی گرت. ئارەزووی خواست بوومەلەرزەیەک بێت، بەم مەرجەی کە هیچ شوێنێک وێران نەکات، جگە لە دوکانی میوە فرۆشییەکەی گەڕەک. بۆ سبەی کاتێک بوومەلەرزەکە هات هیچ دیوارێک درزی تێنەبوو، جگە لە دیوارەکانی ماڵە داڕزیوەکەی.

## ڕۆژێکی بەفرین

بەفر هەموو شوێنێکی داپۆشیبوو. کابرا بە وریایی بەژێر دارەکاندا ڕۆیشت و لە باڵەخانە سپییەکە نزیک بۆوە. خۆشحاڵ بوو لەمەی هیچ سەگێک نەوەڕی. بەرلەمە سەگەکان بە بینینی هێرشیان بۆ دەهێنا و ئەویش تێیدەتەقاند. هێور هێور چووە پێشێ. بەرەو دواوەی باڵاخانەکە پێچی کردەوە. لەوێ لەسەر نووکی پەنجەکانی پێی بەرز بۆوە و لە پەنجەرەکەوە سەیری ناوەوەی کرد. ماڵەکە کەلوپەلی تێدا نەبوو. ژنەکە گوێزابوویەوە. شتێک لە بوونیدا شیبۆوە. پاڵی بە دیوارەکەوە دا و بە ئارامی کەوتە گریان. حەزی دەکرد هەموو شتێک خەونێک بێت و دووبارە سەگەکان شوێنی بکەون.




## دەمامک

کەرنەڤاڵی هالوڤین تەواو بوو. کابرای گول لەو ژنە جیابۆوە کە لە سەرەتاوە تا کۆتایی کەرنەڤاڵەکە لە پەنایەوە وەستابوو و وتی:
ماڵئاوا تا کەرنەڤاڵێکی دی!
ژنەکە بەچرپە وتی: بێبەزەیی.
کابرا لەودیو دەمامکەکەوە بێدەنگ گریا.

## ژمارە نەناسراوەکان

کابرا وەڵامی ژمارە نەناسراوەکانی نەدەدایەوە، چاوەڕێی تەلەفۆنی ژنەکە بوو. ژنەکە کە لەو

لاوە، مۆبایلەکەی ونکردبوو و دەگەیشتە هەر کابینەیەکی تەلەفۆن زەنگی بۆ ئەو لێدەدا. هەموو جارێکیش نائومێد دەبوو و دەکەوتە گریان:
لەعنەتی! تەلەفۆنەکە هەڵبگرە.

**ڤیزا**

جەنابی "ب" هیچ کێشەیەکی بۆ مانەوە نەبوو، وێڕای ئەمەیش بڕیاریدا بچێتە دەرەوە. چووە هەر وڵاتێک سنووورداشیان کرد. لە کۆتاییدا موڵک و ماڵ و خانووەکەی باوکی فرۆشت و هەر جۆرێک بووە مۆڵەتی مانەوەی هەمیشەیی لە کەنەدا وەرگرت. کاتێک گەیشتە ئەوێ، یەکسەر لە کەناڵە تیڤییەکانەوە دەرکەوت و وتی ئاخ نیشتمان! دڵم تەنگ بووە بۆت!
ئەمەی وت و گریا.
هەندێک لە بینەرانیش لەگەڵیدا گریان.

**دوا تەقە**

– تۆ کێیت کە تەقە لە ئەوانیدی دەکەیت و مافی ژیانیان لێدەسەنیت؟ ئەسڵەن تۆ کێیت تا وابزانی تۆ باشتری و باقی خەڵک هیچ و پووچ و شایەنی مردنن؟
مرۆڤ کوژەکە ئەم ڕستانەی وت و لە ئاوێنەکەدا فیشەکێکی بە خۆیەوەنا. دەیویست سەیری خۆی بکات کاتێک فیشەکی بەردەکەوێت، بەڵام تەنها ئاوێنەکە هەپرون بەهەپرون بوو و هاڕەی کرد. سەرباری هەموو ئەمەیش دواتر بە دکتۆرەکانی وت بە چاوی خۆی هەلاهەلابوونی مێشکی بینیوە. کابرا پێیوابوو بەڕاستی مردووە. بێئەوەی لە پاسەوانەکان بترسێت بە خەیاڵی ئاسوودەوە ئاوێنە و شووشەکانی نەخۆشخانە دەروونییەکەی دەهێنایە خوارێ. بەڵام کاتێک قامچییان لێدەدا، پشتی دەسووتایەوە، ئازاری هەبوو و لە حەپەساندا دەمی دادەچەقی.

**سەرباز**

سەربازەکە ماندوو و بریندار گەیشتە جێ.
ژنەکە لە ماڵ چووبووە دەرێ.
برینێک کە لە ناو شەمەندەفەر و دارستان و سەر جادە نەیکوشتبوو، لە ماڵەوە کوشتی.

**گرووپی تۆقاندن**

لە میواندارییە شادییەکاندا مۆڵەتی چوونە ژوورەوەیان دەستنەدەکەوت، بەڵام لە کۆڕی پرسەی مردووەکاندا کەس ڕێگەی لێنەدەگرتن. ئەوان بە ئاسانی دەچوونە ماڵی خەڵکەوە و تا دەیانتوانی

نانیان دەخوارد. ئەوان هەمیشە دوعایان دەکرد کەسێک بمرێت. خەڵکی بە ئەوانیان دەوت گروپی تۆقاندن.
هاوینی ساڵی ڕابردوو لە شارەکەی ئەوان کەس نەمرد، لەبەرئەمە گروپەکەی ئەوانیش لێکهەڵوەشا، واتا یەک لە برسان مردن.

**لەبەر هیچ**

غرورەکەی ڕێگەی نەدەدا بە کابرا بڵێت خۆشی دەوێت. هەمیشە میهرەبانیەکانی کابرای بێ وەڵام دەهێشتەوە. دواجار کابرا بە دڵێکی شکاوەوە ئەوی جێهێشت و ڕۆیشت.
ئێستا کە پیر بووە، تازە تێگەیشتووە چی کردووە. ناوی کابرا وەک گۆرانییەکی ئەفسانەیی بە چرپە دەڵێت و فرمێسک دەڕژێت. تاق و تەنیایە، وەک پاسەوانێک لە ژووری کۆشکێکی فەرامۆشکراو و کۆن.

**خەمینترین تیرۆریست**

ژنەکە وتی: کێی زەلام؟
کابرا وەڵامی دایەوە: مێردەکەت.
ژنە پێکەنی و دەرگای بە ڕوودا داخست و گوتی:
ئەگەر یەک جاریتر بێزارم بکەیت تەلەفۆن بۆ پۆلیس دەکەم!
کابرا ڕووخساری گۆڕی بوو تا کەس نەتوانێ بیناسێتەوە و پارێزراو بێت.. لە بەختی بەد، دکتۆرەکەی زۆر لێوەشاوە بوو.

**باڵندە بریندارەکان**

دەپاڕێینەوە ئەم هەورانە بگەنە جێگەی مەبەست
ئەم هەورانە بەرەو دەریاچەیەک دەڕۆن لە سەرەمەرگدایە.
دەریاچەیەک کە سوێرترین دەریاچەی دنیایە.
لەوێ فلامینگۆکان دانەوینەتەوە و قاچەکانیان لە خوێکە گیرکردووە.
ئەگەر بیانەوێ دووبارە بفڕنەوە، وەک ئێمە قاچەکانیان بەجێدەهێڵن.
ئێمە بە قاچی براوەوە بە ئاسمانەکاندا دەڕۆین.

**بێزرخبوونی کتوپڕی**
**زنجیرە تەلەڤزیۆنییە خۆشەکان و فیلمە هونەرییەکان.**

کچە هاوسێ شووی کرد.
ئیدی کوڕە قەت نەچووە سەربان بۆ بادانی ئارێلەکە.

**هەتاوی نیوەشەو**

منداڵەکە، دیوارەکەی بەرامبەری پیشانی پەرستارەکە دا کە پێیوابوو درزی تێبووە و وتی: لێگەڕێ بچمە بەر هەتاوەکە یاریی بکەم.
پەرستارەکە لە کاتێکدا کە ڕووکەشێکی سپی بە سەر قاچە خوار و لاوازەکانی ئەودا دەهێنا، وتی: ئێستا شەوە، نابێ! بنوو. سبەی پێکەوە دەچین لە بەر هەتاوەکە یاریی دەکەین!
دوای تۆزێک لە ڕۆیشتنی پەرستار، کاتێک منداڵەکە لە درزی دیوارەکەوە تێپەڕی، پێکەنینی بە قسەکانی پەرستارەکە هات.

**گوڵی سوور**

ئەو گوڵە سوورەی لە تەمەکەدا دەبینرا، لەو گوڵە سوورانە دەچوو کە ساڵی ڕابردوو کابرا تاوناتاوێ پێشکەشی ئەوی دەکرد. فرمێسک لە چاوانی ژنەدا ئەڵقەی بەست. حەزی دەکرد بچێتە پێشێ و کابرا لە نێو تەمەکەدا بدۆزێتەوە، بەڵام لە جێگەی خۆی نەبزوا. ترسا هەموو شتێک خەو بێت.

**ئازادی**

شیعرێکی لە وەسفی ئازادیدا خوێندەوە و بۆ ئازادبوونی زیندانییەکان پاڕایەوە.
چەپڵەیان بۆ لێدا.
لە کاتێکدا کە لە خۆشیان دەگریا، چاوی کەوت بە



تووتییە جوانەکەی قەفەسی کافێکە و بە ئەسپایی لەژێر لێوەوە وتی:
عەجەب باڵندەیەکی جوان! خۆزێ هی من بوایە.

**لە بەسەرهاتەکانی کافێی چرا**

چ کەسانێک زەوییان وەرگرتەوە
تەڤگەری "زەوی وەربگرنەوە" کە لە ویلایەتە یەکگرتووکانی ئەمریکا پێکهات، تەڤگەرێک بوو بە دروشمی "داگیرکاری، بەرگری، بەرهەمهێنان".
ئەندامان و لایەنگرانی ئەم تەڤگەرە دەیانویست بەداگیرکردنی زەوی و پارچە بەتاڵەکان، خانووە فەرامۆشکراوەکان و موڵکە دەست بەسەردا گیراوەکان وەربگرنەوە، بەڵام ئێمە ڕێگەمان نەدان. دزەمان کردە ناویانەوە و هێزیانمان کەمکردەوە، بە جۆرێک کە نەیانتوانی کارێک بەرنە پێشەوە. ئێمەی بوونەوەرانی بۆشایی ئاسمان، لە مرۆڤەکان پتر پێویستمان بەماڵە فەرامۆشکراوەکانە.

**تابلۆی ئارەزووەکان**

کوڕە هەژارێک ئەوەندە بیری لە پێڵاوی کەتان کردبۆوە، کاتێک دەستی برد بۆ قەڵەم، تابلۆیەکی جوانی خوڵقاند. کارێکی هونەری جێگەی تێڕامان. لە دانیشتنی ئەنجومەنی ئەولیا و ڕاهێنەراندا هەر کەسێک تابلۆکەی ئەوی بینی ئافەرینی کرد، بەڵام کەس پێڵاوی بۆ نەکڕی.

**جوودایی**

ژنەکە هەفتەی جارێک دەهات بە شوێن کابرادا، پێکەوە لە شاردا خولێکیان دەدا و لە کۆتاییدا بە تاڵی لێک جیادەبوونەوە. ئەوان کاتێک یەکترییان نەدەبینی دڵیان بۆ یەکتر لێیدەدا، بەڵام کاتێک پێکەوە بوون، قسەیەکیان بۆ وتن نەبوو.
دواجار پێکەوە هاوسەرگیریان کرد و بۆ هەمیشە لێک جوودا بوونەوە.

**کۆترەکان**

شەڕ کۆتایی هات.
دووبارە کۆترەکان لە تاوەرە دێرینەکاندا هێلانەیان چێ کرد. بەڵام لە ماڵە وێرانەکانی دەوروبەر کەسێک نەبوو سەیریان بکات.

کەواتە ئەو لە کوێیە؟

ژنە دوای ڕۆیشتنی پیاوەکە، عاشقی بووبوو. هەر کاتێک دەرفەتێکی دەستدەکەوت دەچوو بۆ ئەو شوێنانە کە شوێنی هەمیشەیی پیاوەکە بوو تا بەڵکو دووبارە ئەو ببینێ. بەڵام کابرا لەو شوێنانە نەبوو. بیری چووبوو کاتێک دەیویست لەگەڵ کابرا زەماوەند بکات، زۆر شتی لەو وەرگرتبوو. هەروابێتەوە چایخانە و یانەکانی شەترەنج.

**تەنیایی**

سەرەتا چەند کەسێک بوون. لە گۆشەی گۆڕەپانێکی گومناو وهستان و هاواریان کرد:

ئێمە تەنیاین!

وردە وردە ژمارەیان زیادی کرد. ئێستا لەگەڵ ئەمەی زۆر بوون و ڕێکخراوگەلی جیاوازیان دروستکردووە دیسان هەموو مانگێک لە گۆشە و کەناری جیهان میتینگ ڕێکدەخەن و هاوار دەکەن:

ئێمە تەنیاین!

ئاشکرا نییە کێ دەتوانێ ئەوان لە تەنیایی قوتار بکات.

---

**سەرچاوە:**

**لعنتی! گوشی را بردار. رسول یونان.**

**چاپ نخست ۱۳۹۳. نشر مشکی. تهران.**



# مێروولەیەکی ئەبەدی

## فاتمە زراعی

**لە فارسییەوە: هیوا خەیات**

گومان دەکەم مێرووولەیەک چوبێتە مێشکمەوە، بەڵێ چووە، شکم نییە مێرووولەیەکی نێری ڕەش و ناسک چووەتە مێشکمەوە، بەڵام نازانم چۆنچۆنی، سەرەتا باوەڕم نەدەکرد، ئاخر قەت نەمبیستووە مێروولە بچێتە ناو مێشکی کەسێک، پێدەچێت دوانیوەڕۆیەکی خۆرهەتاو لە باڵکۆنەکەدا سەرخەوێکم شکاندبێت، پێدەچیت مێرووولەیەک لە ڕیزە مێرووولەکەی خۆی لایدابێت و بە هەڵە چووبێتە ناو گوێم یان مێشکم، ئێوە ڕێگایەکی ترتان بە بیردا دیت؟ من جگە لەوە عەقڵم هیچی تر نابڕێت، بە دووری دەزانم لە لووتمەوە چوبێتە ژوورەوە، دڵنیام هەر لە گوێچکەمەوە چۆتە ژوور.

لەهەر کوێوە چووبێت ئێستا ئەو لە ناومدایە و وەختە باوکم دەربێنێت، لەژێر پێستی سەرمدا ڕێدەکات، لەسەر توێژاڵی مۆخم پیاسە دەکات، ئالێرە نێوچاوانم.. وەختە شێتم بکات، ختوکەم دەدات، ئاخر تاکو ئێستا کێ مێشکی وەختووکە هاتووە؟ ئێستا ماوەیەکە چۆتە ژوورەوە، تا بەخۆم زانی چییە ماوەیەک تێپەڕی، زۆر چاوەڕێم کرد بەڵکو خۆی چۆن چۆتە ژوورەوە وایش بێتە دەر، بەڵام نەهات ئیتر چوومە سەردانی دکتۆر:
"حەپێکی بچووکم بۆ نووسیویت، لە ناوەڕاستدا بیکە بە دوو کەرتەوە و بەیانی و شەو بیخۆ".
"کاک دکتۆر حەپی مێرووڵە کوژە؟"
"ناگیانەکەم خەوهێنەرە، فشار کەوتۆتە سەر مێشکت پێویستت بە پشووە"
سوپاسم کرد و هاتمە دەرەوە وەرەقەکەم دڕاند و کردمە سەتڵی خۆڵەکە.
"کەلەی باوکت، ئاشکرایە فشار هاتووە بۆ مێشکم تۆ مێرووڵەیەک بچێتە مۆختەوە فشارت بۆ نایەت؟"
ڕۆژێک ئەوەندە بەژێر پێستی سەرمدا ڕۆیشت ڕێک دەمزانی بەرەو کوێوە دەڕوات، جێپێکەیم هەڵگرت لەسەر ڕێگەکەیدا ئەو موانەم هەڵکەند بەڵکو لە شوێنی ڕیشەی مووەکەوە بێتە دەرەوە، دوای دوو سەعات هەەستمپێکرد بێخی سەرم وەئازار هاتووە، ئەو شتە پیسە خەریکی تەراتێن بوو بۆخۆی، منیش وەکو کارەبا گرتبمی لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا کەوتبووم، دەوروبەریشم هەمووی تاڵەمووی سەرم بوو، هەڵبەتە هەمیشەیش خراپ نییە، لەهەندێک جێگاوە کە دەڕوات پێمخۆشە و تەزوویەکی خۆشی بەگیانمدا دێت.
"ئۆخەیش مێروو گیان یەکتۆز ئەولاتر ئەهائەها خۆیەتی ئێرە، سەگباب گاز نەگریت"
هەندێک جار دەکەومە ناو خەیاڵاتەوە دەیەوێت چی بکات لە ناوەوە؟
چی دەخوات؟ نەکا مۆخی من وەکو کاغەز بخوات، ڕۆژی چەند جارێک ئەگەڕێت بە مێشکی مندا.
"شتە پیس ئیتر وەرە دەرەوە"
ئەگەر لە ناوەوە بەچکە بکات چیبکەم؟ هەڵبەتە ئەگەرێکی لاوازە، ڕاستە مۆخ شێوە و ڕەنگی مێرووڵەی هەیە. شتێکی سەیروسەمەرەی تر ڕوونەدات جارێکی تر؟ دیسانەوە لە بەختی من مێرووڵەیەکی تر چووبێتە ژوورەوە زاوزێ بکەن، نەبابە شتی وا هەر نابێت لە خۆڕا بۆ خەم بخۆم.
ڕۆژێک سەیری تۆم و جێریم دەکرد، بینیم ڕوداوەکە لە بەینی مشک و پشیلە و مێرووڵەیەکدایە، ئاخر میرووڵە چ کارەیە، بۆ هەر شوین و کەسیک دەڕوانم مێرووڵەیەک هەیە.
ئیتر لە پێش چاوم لانەچوو لانەچوو، ئەڵێی لینزیک بە وێنەیەکی مێرووڵەوە لە پشت چاومدایە. هەندێک شەو لە ژێر پێستی ناوچاوانمەوە دێتە خوار تا پشت پێڵوی چاوم، ئەو کاتانە خەوی خۆش دەبینم پێی ڕاهاتووم، ئێستا ئیتر زیاتر لە پشت پێڵومەوەیە، دەڵێی برژانگێک چۆتە چاومەوە بەڵام لەولاشەوە مۆخم ئارامە، بەجۆرێک لە جۆرەکان خۆشیم

لێدێت.
ئەمەوێت شتێکی سەیرتان پێبڵێم، مێروولەکان دەنگیان هەیە قسەدەکەن و پێدەکەنن بەڕاستیمە، خۆم گوێم لێبوو، ئێستا تەواوی کونوکەلەبەرەکانی مێشکم شارەزایە دەزانێت ناوەندی یادەوەرییەکانم لە کوێدایە، کە بێتاقەت دەبێت یادەوەرییەکانم ئەمدیواودیو دەکات، شتە پیسە دەستی بە شوێنی وادا دەگات من خۆشم بیرم نەماون، لاپەڕەی وا هەڵدەداتەوە خۆم لە مێژە لەیادم کردووە، ئەترسم لەشوێنێکدا بمخاتە تەڵەیەکەوە، وەک ئەوە وایە دەفتەری یاداشتی ڕۆژانەت بە کەسێک بێت، هەندێک جار تووشی دڵتەنگی دەبم و خەجاڵەتی دەکێشم کە هەموو شتێکم دەزانێت ئاخر ئەو خوێڕییە سۆراغی هەموو شتێک دەکات و ناتوانم پێشی پێبگرم، دەتوانیت هەموو شتیک لە مێشکم بکات هەندێک جار دەتوانێت پێش بەتووڕەبوونم بگرێت بۆیە هەندێجار بێهۆ پێدەکەنم.
"سەگباب دیسان حەزت لە یارییە؟ دەست لەسەرم هەڵگرە مووری."
پێدەکەنێت.. هههها.. تەنها ئەمە باش شارەزایە.. هههههها.
"مووری مەگەر گاڵتەچیی باوکتم؟"
"هههههههههها"
وشەکانی زۆر باش تێناگەم وا هەەست دەکەم زانیاریی لە مێشکم وەردەگرێت، ئاخر چۆن شارەزای زمانی من بووە کە هەندێکجار قسەی پێدەکات؟ دەیەوێت شتێک بڵێت دێتە ناو گوێچکە بچووکم پشتی شەیپوری وەستاکەی، هەندێکجار کاتی خەو خۆشییەک بە مێشکم دەدات، دەست دەبات بۆ شوێنێکی مۆخم و یاری پێدەکات، ئیتر ڕووت دەبمەوە، فێر بووە وەڵامی شەوباش بداتەوە.
"خەوێکی خۆش"
من خۆش ئەخەوم، ئەگەر حەزی لە یاری بێت بێچارەم دەکات، دەڵێت با یاری بکەین منیش ناچار دەبم، یارییەکی خۆشمان ئەوەیە من شتێک لە گۆشەیەکی سەرمدا ون دەکەم و ئەو ئەگەڕێت بیدۆزیتەوە، بۆ نموونە من خولخولۆکەیەک دەخەمە ناو چەکمەجەی ناندێنەکە لای کەوچکەکان، ئەو لەناو مۆخمدا دەگەڕێت بە شوێنیدا، گەر من بیر لە خولخولۆکەکە نەکەمەوە ئەو بۆی نادۆزرێتەوە ماندوو دەبێت ئیتر ئەو سەگبابە دەکەوێتە گازگرتن، من بە هەڵەیدا دەبەم دوای تاوێک کە بیر لە خولخولۆکەکە دەکەمەوە خێرا دەیدۆزێتەوە.
کاتی وا هەیە ناتوانم بە دڵی خۆم بیر لەو شتە بکەمەوە کە دەمەوێت خەجاڵەتی دەکێشم، ئەترسم تێبگات، دەی من هەندێک شت هەیە نهێنی خۆمە و حەز ناکەم کەس بیزانێت، ئەمەیش دەبێتە هۆی ئەوەی خەم و ئازارەکانم کەم ببنەوە، ئەو خەمانەی کە پەیوەندی بە نهێنییەکانمەوە هەیە و ناوێرم بیریان لێبکەمەوە، ئەو سەگبابە سۆراغی یادەوەری پەیوەندییە سێکسییەکانم دەکات.
"ئەی سندان، ههههههها.. بە تۆ چی، مەگەر خۆت ناموست نییە مووری؟ مووری مەگەر دەستم پێت نەگات دواجار هەر دێیتە دەرەوە".
وردە وردە ئیتر ناڕەحەتم ناکات، وردە وردە

ئیتر بەیەک ڕاهاتین، ورده ورده خۆشیم لێدێت، ورده ورده عاشقی بووم، ڕاستییەکەی هەست بە شەرم دەکەم کە عاشقی مێروولەیەک بووم، کاتێ کە بیرم لێدەکردەوە ئەویش ئاگادار بوو، خۆی بۆ لەتەل ئەدام.
"خۆت حیز مەکە مووری لێتدەدەم چاوت دەردێنم"
"هههههههها"
""دە لامەزەو گوێبگرە"
"ههههههههها"
"مووری"
"گیانی مووری"
"خۆشتدەوێم"
"زۆر کەم"
ڕۆژێک بەرەبەیان لە بەینی خەوبێداریدا بووم، سەیر دەکەم کردوویەتی بە هاتوهاوار:
"مووری چ دەردتە وا خۆت دەکێشیت بە دەر و دیواردا؟ هەر کەس سمێڵی سوور بوو هەمزە ئاغا نییە کەری خویری هەر نوکتەیەکی ڕەش دەبینیت لە مێشکی مندا لێتدەبێت بە مێروولەی مێ، مێروولە مێکان لەدەرەوەن لە باڵکۆن لەبەر خۆرەکەدان، مووری تۆ وەرە دەرەوە خۆ ناتخۆم، تۆ وەرە دەرەوە هیچ نەبێت با بتبینم".
نازانم لە ڕاستیدا دڵم دەیەوێت هەر لەوێ بێت یاخود بێتە دەرەوە، نازانم ئەگەر بڕوات من ئەبێت چیبکەم، ئاخر چ مێروخۆرێکی ژێر عاشقی مێروولەیەک بووە؟ ئەگەر بڕوات من خەم دەخۆم. دەزانم جێ پێ بچووکەکانی لەسەر تەواوی دەمارەکانی مۆخم بەجێدێڵێت. هەرچەندە ترش و تامی خۆش بێت، ئەگەر لە برساندا بمرم نایخۆم.
"مووری گیان"
"ها"
"مووری لێمدەترسیت؟"
"کەر مەبە، ئاخر مەگەر مێروخۆر ترسی هەیە؟ دەی نەعلەتی شتێک بڵێ، ئاخ خۆزگە دەکرا یەک جار من بچوومایەتە مۆخی تۆوە بزانم لەومێشکە سەرە باوک مردووەی تۆدا چیی دەگوزەرێت، دەی تۆ لەو مێشکەت مووری شتێک بڵێ.. مووری خۆشتدەوێم؟"
"ها"
"تۆ جگەرت خواردووم ئەوەندە بەناو خۆمدا ڕۆیشتیت ئەوەندە عاشقت بووم دەڵێی چیی دەستم پێت ناگات، مووری هەواکەی زۆر خۆشە لەناو هەزار مێروولەدا کەسیان وەک تۆ نین، ئەوەتا هەزار دانە دەبن لە باڵکۆنەکەدا لەژێر خۆرهەتاوەکەدا دەڕۆن، هەموویانم خۆشدەوێت، هەموویان دەخۆم جگە لەوەیان کە تۆ دەستی دەخەیتە سەر، یەکێکیان زۆر جوانە مووری وەرە تەماشایکە".
"زۆر قورسە بۆ من بەجێتبەێڵم.. تاڵە.. تێدەگەیت؟ ئاخر کچێ تۆ بۆ گوێچکەکانت پاک ناکەیتەوە؟"

---

**سەرچاوە:**

**فاطمه زراعی: حرفەی من خواب دیدن است. تهران. نشر چشمە. ١٣٨٧**



# ڕێویەکی جوان

## ڕۆز تۆماس

**لە عەرەبییەوە: دڵنیا عەبدوڵڵا**

ڕۆز تۆماس:

ژنە نووسەرێکی بەریتانیە ساڵی ١٩٦٧ لە ناوچەی کنت لەدایک بووە، لەئێستادا لە ئەدنبرە دەژی، یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی بەناوی (خاڵی دێوی دەریا) لەساڵی ١٩٩٧دا لە خانەی (بولیکون) بڵاوکردەوە. ئەم چیرۆکەی لە کتێبی فلامنکۆ بۆ نووسینی ئیسکۆتلەندی نوێ بڵاوبۆتەوە.

## ڕێویەکی جوان

تریفەی مانگ لەمیانەی پەردەکەوە دێتە ژوورەوە بەڵام پیرەمێردەکە بەئاگا ناهێنێتەوە، خۆی لە بنەڕەتدا بەئاگا بوو، قسەیەک بەمێشکیدا دێت. بەژنەکەی دەڵێت: ئەمشەو گەرمە ئازیزەکەم، ئەوەندە گەرمە کە ناتوانم بنووم.
ژنەکە دەڵێت: وایە. تەموزە. پێویستە بەتانیەکە لەسەر جێگەکە لابەریت. مێردەکەی دەڵێت: بەڵی پێویستە وابکەم. بەڵام لەوێدا پاڵکەوت. لەو چوارگۆشەیەدا کە تریفەی مانگەکە دروستی کردبوو. چاوەکانی کرابونەوە.
پاش ماوەیەک لەجێگەکەی هەستا. بیجامەکەی هەڵکێشا و چوو بۆ هۆڵەکە. شتێکی زۆر ناپەسەندە لەم کاتەی شەودا. لەپاڵ خۆیدا کتێبەکانی کەڵەکە کردبوو.
گەڵای ڕووەکەکان وەک چنگی ئاژەڵی کێوی لەسەر تاقەکان هاتبوونە خوارەوە
پێی ڕووت و پلێتەکانی زەویەکە لوس وساردن. بەڵام وای بەباشتر دەزانێت کە بەپێ خاوسی بڕوات وەک لەوەی پێڵاوی لەپێدا بێت و تەقە تەقی بێت.
بەلارەلارە بەرەو چێشتخانەکە دەڕوات ژنەکەشی هەر پێی دەڵێت: بۆچی پیاڵەیەک چا بۆخۆت لێنانێیت، باشتر دەبیت.
پیاوەکە گڵۆپی چێشتخانەکە دادەگیرسێنێت و قۆریەکە دەبات بۆ حەوزەکە، وێنەی تاوەیەک و هەندێک پیاز لەسەر دیوارەکە هەڵواسراوە. کە هەر چەند هەنگاوێک وەک مۆتەکەیەک دووبارە دەردەکەوێتەوە. لەکاتێکدا کە ئاو لە بۆریەکەوە دێت لە وێنەکە ڕادەمێنێت.
دەنگێک لەدەرەوە دێت، سەگێک دەوەڕێت، یان لەوانەیە ڕێوی بێت.. ئەم ڕۆژانە ڕێوی دێن بۆ شارەکە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئاسایی لە ڕۆژانی ساردی زستاندا دێن. دێن و بەدوای خواردندا دەگەڕێن، لە شەوێکی کانونی دووەمدا خۆی و جێسیکا جارێک ئەو ڕێویەیان بینیوە بەسەر بەستەڵەکەکەوە. ڕێویەکە جوان بووە، ئەوانیش قۆڵیان کردبوو  بە قۆڵی یەکدا و هەناسەیان لەخۆیان بڕیبوو و سەیریان دەرکرد، ڕێویەکە پرتەقاڵی و سپی بوو، ئەو ئێوارەیە بەفر دەباری و هەموو شارەکەی داپۆشیبوو، بە بیریدا دێتەوە چۆن ڕێویەکە سەیری کردن، چۆن دەموچاوە باریکەکەی بەلای ئەواندا وەرگێڕا.
پیرەمێردەکە دۆلابەکە دەکاتەوە و سەیری پاکەتە چاکان دەکات، زۆری لێیە. دەڵێت: کامیان ببەم، ئایا چای لیمۆ و زەدەرەکە هەڵگرم، ئاخۆ من لە کاتژمێر چوار چارەکێک کەمی بەیانیدا پێویستیم بە وزەیە؟ یان چای گوڵ و سێو؟ یان چای نەعنا؟ دوێنێ شەو کچەکەی ماکەرۆنی بە سیرەوە لێنابوو، سیری پێ ناکەوێت، لەنیوەشەودا هەست بەتەنگەنەفەسی دەکات، لەو باوەڕەدایە چای نەعناکە بۆ گەدەی باش بێت. بەڵام چای ئاسایی بۆ مێشک و دڵی باشترە. پیاڵەکە دەهێنێت، کاتێک ئاوەکە هاتە کوڵ کیسی چاکە دەکاتە ناوی و تێکی دەدات. حەزی لەچای تۆخە. وەک ئەوە نا کە کچەکەی دروستی دەکات تەنها شلەیەکی سپیە. ژنەکەی دەڵێت: ئەوە زەوی شیر و ئاوە، بەڵام نا،

ژنەکەی نییە، خۆی وا دەڵێت. ژنەکەی حەزی لە چای ڕوونە.
لەم کاتەی بەیانیدا دنیا هەمووی ژاوەژاوە، تەنانەت چاخواردن و هێوریش هەر ژاوەژاوە، یەخچاڵەکە لە خەوەکەیدا گیزەگیزی دێت، لە یەکێک لەخەونە سەیرەکانیدا، ئەو دەنگە ڕای پەڕاندبوو، چاکە دەڕژێت. دەڵێت: هەلاو، بەڵام وەڵام نییە. ژنەکەی چیدی لەوێ نییە، لەناکاودا جارێکی دی ڕۆیشت بێئەوەی بەم بڵێ. بۆ دوور ڕۆیشت، پیاوەکە دەڵێت: بگەڕێوە. بەڵام بێدەنگی دەکەوێتەوە.
هەموو جارێک کە دیار نامێنێت دەترسێت کە نەگەڕێتەوە، هەوایەکی سارد بەناو کراسی بیجامەکەیدا دێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە پەنجەرەکە داخراوە، شووشەکە ڕەشە، ڕەش، هیچ وێنەیەک ناداتەوە. پیرەمێردەکە بەچاکەیەوە بە ژووری دانیشتندا دەڕوات، وەک زاواکەی پێی دەڵێت ژووری گوزەرانی، کە لەوێدا ناژی. پیرەمێردەکە بە ڕیکۆردەری گۆرانی و بە ڕیزی شریتەکان و بە وێنەی بەلەمەکانی بەندەرەکە دەڵێت: بەڕاست ئێستا چی بکەم؟ دەڵێت: گوێی لە نەورەسەکانە لە سەربانەکە دەزیقێنن، هەمیشە نەورەسەکان لەم ڕۆژانەدا بە شەو دێن، هەموو جارێک هاوارەکەی تازە دیارە، لە پەنجەرەکەوە سەیر دەکات، لەپێشدا نەورەسەکە نابینێت، بەڵام لەدواییدا دەیبینێت، لەسەر ڕووی ئۆتۆمبیلەکە بەگەورەیی دەبینرێت. بەهۆی تایەی ئۆتۆمبیلەکەتەوە ماندوویت، بەهۆی دوکەڵەکەوە خنکاویت، با بتبوژێنینەوە. ئایا ئەمە لەڕیکلامدا وتراوە، بەڵی, ئەو بڕوای وایە، نەورەسەکە دەڵێت واق. پاشان باڵە خاکیەکانی دەدات بەیەکدا و بۆ دوور دەفڕێت، هەور ئاسمانی داگرتووە، بەڵام هەست دەکات کە سبەینێ گەرم دەبێت.
کاتێک ئاوڕدەداتەوە ژنێک دەبینێت لە ڕاڕەوەکەدا لە سەرما خۆی پێچاوەتەوە وەک هەست بەسەرما بکات. شاڵێکی سوری لەجەستەی ئاڵاندوە.
ژنەکە دەڵێت: باوکە پیاڵەیەک چام بۆخۆم لێناوە، پیرەمێردەکە دەڵێت: تۆ باشیت، ژنەکە دەڵێت: گوێم لێبوو لەگەڵ یەکێکدا قسەت دەکرد. ژنەکە بەرەوڕوی باوکی دێت، دوو چاوی جوانی هەیە، قاوەیین وەک شوکولاتە، پیاوەکە کچەکەی خۆش دەوێت بەڵام هەندێک جار ناوەکەی بیرناکەوێتەوە
ژنەکە دەڵێت: تۆ دەگریت؟
دەڵێت: نەخێر. من ناگریم، لەبیرتە کە....؟
ژنەکە دەڵێت: چی؟
دەڵێت: ڕێویەکە. لەبیرتە کە ئەو زستانە ڕێویەکەمان بینی؟
ژنەکە دەڵێت: پێویستە لەجێگادا بیت، تۆ ماندوویت.
دەڵێت: نەخێر. جوان بوو.
ژنەکە دەڵێت: من لەبیرمە تۆ و دایکم بۆتان باس کردم، لەبیرمە لەسەر قەراغی جێگاکە دانیشتبوویت بۆت باس دەکردم.
دەڵێت: بەڵی ڕێویەکی جوان بوو.
کچەکە قۆڵی باوکی دەگرێت و دەڵێت: بابتبەمە جێگەکەتەوە.
چەند شتێک هەیە دەیەوێت بیزانێت. ئەو بۆ

لێرەیە، دەیەوێت بزانێت لەکوێشە؟ دەزانێت دەبێت نزیک بێت لەدەریاوە. ئەمە سەرەتایە. دەڵێت: بۆ خولەکێک دەچمە دەرەوە، تەنها کەمێک دەچمە دەرەوە.
ژنەکە دەڵێت: بەڵام تۆ بیجامەت لەبەردایە. بەسەرسامیەوە دەڵێت : ئینجا چییە؟ لەکەیەوە وا گەورە بویت؟ خێرا بە هۆڵەکەدا تێدەپەڕێت کە بۆنی هەوا خۆشکەر و سیری لێدێت، بۆنێکی سەیر کە توشی کۆکەی دەکات، قفڵەکە بادەدات و دەرگاکە دەکاتەوە. هەناسە دەدات، بریسکەیەک لەئاسماندایە، هێمن و پەمەییەکی کاڵە. ئێستا نەورەسەکان بە کۆمەڵ دەفڕن بۆ کەنار دەگەڕێنەوە، وەک ئەوە وایە لەگەڵ ڕۆیشتنیاندا پەردەیەکی گەورەی تۆخ لەگەڵ خۆیاندا بەرن بۆ هەر کوێیەک بڕۆن، باخچەکە لەنیوە شەودا گشت شتێک لەدەست دەدات. خەمۆکیەکەی. لەناکاودا چوارگۆشەیەکی زەرد لە ڕاڕەوەکەدا دەردەکەوێ، ئەمەش مانای وایە مێردی کچەکەی لەسەرەوەیە، لەسەرەوە گڵۆپەکەی داگیرساندوە. پاشان بە بۆنی دوای ڕیش تاشینەوە دێتەخوارەوە.
پیرەمێردەکە بەخێرایی دەڵێت: چی دەکەیت؟
ژنەکە کە لەدواوەی وەستاوە و ئانیشکی گرتووە دەڵێت: نەفرەت خەریکە دەبورێتەوە، پیاوە پیرەکە وەڵام ناداتەوە تەماشای گیا سەوزەکە دەکات لەکۆتایی باخچەکەدا. لەسەرەوە دەنگێک دێت، ڕادیۆکەش گۆرانی دەڵێت.
دەتوانین چی لە دەریاوانێکی مەست بکەین
دەتوانین چی لە دەریاوانێکی مەست بکەین
دەتوانین چی لە دەریاوانێکی مەست بکەین
لەم بەرەبەیانیەدا؟
پیرەمێردەکە وتی: بەڵێ ڕێویەکە لەوێیە.
لەناکاودا دەڵێت: وەک پشیلە بەناو قامیشەکەدا دەڕوات. بێدەنگ، ڕێویەکی پرتەقاڵی بچووکە، ئەو شوێنە دەبینیت کەئاماژەی بۆ دەکەم؟
ژنەکە دەڵێت: لەکوێ؟ ناتوانین لەئێستادا بیوەستێنین، ئەو ڕێگەیەی بیر دەکەوێتەوە کە ئاماژەی بۆ شتەکان پێدەکرد؟ کاتێک بچووک بوو چۆن سەیری ئاسمانی دەکرد بەدرێژایی قۆڵی باوکی کە بلوزە شینەکەی لەبەردا بوو. هەوڵ دەدات باوکی چی دەبینێت ئەویش بیبینێت، ئەم شتانەی لەبیرچووەوە. چەند کاتی لەگەڵدا بەسەربردوە، هەوڵی ئەوەی دەدا کە سنوری شتەکان بەپێی مەوداکان دیاری بکات.
ژنەکە دەڵێت: بەڵی دەتوانم هەموو شتێک ببینم پەپوولە یان باڵندەیەکی کێوی. زۆرجار درۆی دەکرد بۆ ئەوەی گەمژە دیار نەبێت.
باوکی دەڵێت: ئێستا دەبینیت؟ هێشتا سەیری شتێک دەکات لە نێو گەڵای درەختەکاندا؟ ژنەکە دەڵێت: لەکوێ؟ سەیری باسکی باوکی دەکات، بەڵام لە تاریکیدا باش نابینێت تەنانەت بە گران دەرگاکە یان ماڵەکەی بەرامبەر دەناسێتەوە، پێویستە لەسەری جارێکی دی درۆ بکات تا باوکی شادومان بکات. بەدرۆ دەڵێت ئاژەڵێکی بینیوە بەخێرایی دەجوڵێت.
بونەوەرێک کە چاوەکانی گەشاوەن، باوکی دەڵێت: سەیری ئەوێ بکە ژنەکەش زەردەخەنە دەیگرێت، هیچ شتێک لەوێدا نییە تەماشای باخچەی گوڵەکان دەکات، دەڵێت: باوکە و ئاخ هەڵدەکێشێت هەوڵ دەدات بیر لەشتێکی

دی بکاتەوە بیڵێت تاوەکو باوکی بێزار نەکات یان بیشڵەژێنێت یان نیگەرانی بکات، زۆرپێی ناخۆشە بەو شێوەیە بیبینێت. لەو حاڵەتەی ئێستا تێیدایە، لەبەر ئەو هۆیە ئاخ هەڵدەکێشێت. لەناکاودا بۆ یەکەمجار دوای چەند مانگێک گوێی لە دەنگی دایکی دەبێت، کە بە سروشتی خۆی بە خاوی قسەی دەکرد. دەڵێت: ئازیزەکەم، وشەکان زۆر ڕوونن. لەهەموو شتێک زیاتر بیری دەنگی دایکی دەکرد.

باوکی دەڵێت دەیبینیت، ڕێویەکی جوانە، فرمێسکێک بە ڕومەتیەوەیە، دەنگی مێردی ژنەکە لەسەرەوە دێت، دەرگاکە دادەخات و لەپلیکانەکان دێتە خوارەوە، پێش ئەوەی بگاتە هۆڵەکە و پرسیار بکات چی دەکەن، لەوێدا دەوەستێت تا هەوا بێتە ژوورەوە، ژنەکە دەڵێت: بەڵێ، بەڵێ دەتوانم، چونکە بەدڵنیاییەوە ڕێویەک لەوێدایە دەتوانیت ئێستا بیبینیت، هەڵدێت و لە ماڵەکان دوور دەکەوێتەوە، شتێکی بریقەدار و جوانە.

.

---

**سەرچاوە :کتێبی قصص عالمیە معاصرە .ترجمە فدوی فاضل**



# چاوپێکەوتن لەگەڵ
# موجاهد ئەلبۆسیفی

سازدانی: حەمید زناز
لە عەرەبییەوە: باوکی ڕەهەند

**موجاهید ئەلبۆسیفی نوسەرێکی لیبی/ هۆڵەندییە. خاوەنی ڕۆمانی (ئازاتسی) و کتێبی (غوایە الجهل)ە. یەکێکە لەو نووسەرانەی بەشدارە لە قسەکردن لەسەر بارودۆخی گشتی لیبیا. ئەندامی هیچ حیزب و کۆمەڵە و گروپێك نییە. ستوونێکی هەفتانەی لە ڕۆژنامەی (الاحوال اللیبیة) دا هەیە.**

*وەک ڕۆشنبیرێکی عەرەب کە ماوەیەکی زۆر لە هۆڵەندە ژیاویت، ئایا دەکرێ بیرۆکەیەکمان لەسەر بوونی ئیسلام لە وڵاتی ڤان کوخ بدەیتێ؟

-لەساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە، گەورەترین ڕەوەندی موسڵمان لە وڵاتی مەغریبەوە هاتوون، ئەمەش لەسەر بنەمای ئەو ڕێکەوتنەی لە نێوان هەردوو وڵاتی مەغریب و هۆڵەندە دا مۆرکرا. بەشی هەرە زۆری ئەو مەغریبیانە لە باکوری مەغریبەوە هاتوون. پاش مەغریب

ڕەوەندی تورکی دێت کە ئەوانیش کەمەکێک زوو هاتوون. دواتر لە نەوەدەکاندا و لەگەڵ سەرهەڵدانی قەیرانی گەورە لە ناوچەکەدا، وەک جەنگی کەنداو و ئەفغانستان، دانیشتوانی ئەو دوو وڵاتە، بە ژمارەی گەورە گەورە ڕوویان لە هۆڵەندە کرد. بێگومان بە حوکمی ئەو مێژووە هاوبەشەی لە نێوان هۆڵەندە و ئەندەنوسیادا هەیە، لە کۆنەوە ڕەوەندێکی ئەندەنوسی لە هۆڵەندە دا جێگیرە. لەمرۆدا سەرجەم ئەوانە لەگەڵ هەندێ ژمارەی دیکەی کەمتر، نزیکەی یەک میلۆن موسڵمانی هۆڵەندی پێکدەهێنن.

*هۆڵەندییەکان چۆن تەماشای ئەم بوونە ئیسلامییە دەکەن؟

-جۆرێک لە دڵەڕاوکێ لەبەرامبەر ئەم ئامادەبوونە ئیسلامییە لە هۆڵەندە دا هەیە، تەنانەت ئەم دڵەڕاوکەیە لای ئەو گروپ و دەستە و تاقمانەش هەیە کە وەک هاوڵاتی بەرگری لە مافی موسڵمان دەکەن، لەوانە چەپەکان و هەندێ لە ڕۆشنبیران. لە ڕاستیدا کۆی ئەم دڵەڕاوکێیە هەروا لە خۆڕاو لە بۆشاییەوە نەهاتووە، هەڵسوکەوت و ڕەفتاری زۆرێک لە موسڵمانەکان، هیچ دەرفەتێکی نەهێشتووەتەوە تەنها دڵەڕاوکی نەبێت. لێکتێنەگەشتن و تورەییەکی نادیار و نەبوونی متمانە لەنێوان هەردوولادا بوونی هەیە. بێگومان ئەم دڵەڕاوکێیە دوای ڕوداوە تیرۆرستیەکەی ١١ سێپتێمبەر بەشێوەیەکی گەورە زیادی کردووە، ڕەوەندی ئیسلامی شکستی هێنا لەوەی بتوانێ بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا خۆی لەو ڕوداوە جیا بکاتەوە و سەرکۆنەی بکات. ئەمە وایکرد هەندێ گروپی ڕاستڕەو، دەرفەتەکە بقۆزنەوە و کار لەسەر ئەو شکستە بکەن و زیاد لە قەبارەی خۆی گەورەی بکەن و موسڵمانەکان وەک بۆمبێکی تەوقیتکراو لە ناو جەستەی هۆڵەندیدا وێنا بکەن، لەم کارەشیاندا بۆ ماوەیەک سەرکەوتوو بوون.

*لە دیدی تۆوە ئایا موسڵمانەکان بارگرانییەک نین لەسەر شانی دەڵەتی هۆڵەندی، یان موسڵمانەکان شتێکی تازە بەم کۆمەڵگایە دەبەخشن؟

-بە ڕاشکاوانە بەڵێ بارگرانییەکن لەسەر شانی دەوڵەتی هۆڵەندی، بەداخەوە زیاد لە نیوەی هەندێ ڕەوەندی موسڵمان، لەسەر بیمەی کۆمەڵایەتی دەژین، بێ ئەوەی هەوڵ و کۆششێکی ڕاستەقینە بۆ گۆڕینی ئەو بارودۆخە، بخەنەگەڕ. ئەوەی زیاتر ئەو بارودۆخەی بەو شێوەیە هێشتوەتەوە، جگە لە نەبوونی هیچ شارەزایی و زانیارییەک دەربارەی ژیانی خۆرئاوا و کەلتووری ئەو کۆمەڵگایانەی ئەوێ، پیاوانی ئاینی-ن، بەتایبەتی مەلا و ئیمامەکان کە سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی کەلتووری خۆبەدوور گرتن و دووره پەرێزی و ڕێزنەگرتنی مافەکانی مرۆڤن، بەتایبەتی ڕێزنەگرتنی مافەکانی ئافرەت. ئەم مەسەلانە لە کۆمەڵگایەکی وەک کۆمەڵگای هۆڵەندیدا جیاوازییەکی زۆر گەورە

دەخاتەوە. حکومەتەکانی هۆڵەندەش، لێزانانە هەلی نەبوونی شارەزایی و نەکرانەوەی ڕەوەندی موسڵمانی قۆستەوە و کارێکی وای نەکرد ڕێنمایی ئەو ڕەوەندە موسڵمانە بکات و گەشەی پێ بدات و وای لێ بکات بەشی خۆی لە ژیان وەربگرێت.
لە هۆڵەندە دوو کەلتوری دژ بە یەک و پێچەوانەی یەک هەیە، کەلتوری دەشتەکی و لادێی و ئیمامی مزگەوتەکان، بە تایبەت ئیمامە لادێییەکانیان کە پێیان وایە ژیانی دوورە پەرێزی و گۆشەگیری باشترین ئامرازە بۆ پارێزگاریکردن لە شوناس. لەبەرامبەر ئەمەدا کەلتورێکی گرنگی ڕاستڕەو و کەرتی حوکومی هەیە، لە بەرژەوەندیاندایە ئەم ژیانە ئاست نزمەی ڕەوەندی موسڵمان بەردەوام بێت و دەرفەتی کارکردنیان تەنها لەو کاروبارە زەحمەت و قورسانەدا بێت کە هیچ هۆڵەندییەک حەز ناکات ئەنجامی بدات.
لە ئێستادا وێنەکە کەمەکێک باشتر بووە، وەلێ زۆر خاوە. ساڵانێک لەمەوبەر لە کۆی ژمارەی ڕەوەندی مەغریبی کە دەگاتە نزیکەی ٤٠٠ هەزار کەس، تەنها ٧ هەزار کەسیان خوێندکاری زانکۆ بوون، ئەمە شتێکی ناخۆش و غەمهێنە. لەو بڕوایەدام هەنووکە وێنەکە باشترە. لە ئێستادا و لە ڕێگەی وەرزش و هونەر و نووسینەوە، ڕەوەندی موسڵمان خەریکە شتێکی تازە پێشکەش بە کۆمەڵگای هۆڵەندی دەکات، کۆمەڵێ ناوی درەوشاوە لە بوارەکانی نووسین و وەرزش و هونەردا دەرکەوتوون کە بە ڕەچەڵەک موسڵمانن و سەرکەوتنی باشیان بەدەستهێناوە، ئەمەش وێنەکە دەگۆڕێت.

*ئایا موسڵمانەکان بەرەو ئەوە هەنگاو دەنێن تێکەڵ بە کۆمەڵگای هۆڵەندی ببن، یان تابێت گۆشەگیر و دوورە پەرێزتر دەبن؟

-گەر پێش چەند ساڵێکی کەم لەمەوبەر ئەم پرسیارەت لێ بکردمایە، دەمگوت گومانم هەیەوە لەوەی بیانەوێ تێکەڵ بە کۆمەڵگای هۆڵەندی ببن. بەڵام لە ئێستادا، وێنە گشتییەکە کەمەکێک باشتر بووە. کاریگەری مەلا لادێییەکان کەمتر بووەتەوە، چیتر وتارە ئاگرینیە وروژێنەرەکانیان بۆ لێدانی ئافرەتان و هاندان بۆ مانەوە بە گۆشەگیری و دوورە پەرێزی، ئەو گڕ و تین و کاریگەریە گەورەیەی جارانیان نەماوە. بێگومان جەنگ و شەڕ و شۆڕی ناوچەکە، وەک ئەوەی ئێستا لە سوریا ڕوودەدات، بۆ ئەو مەلا توندڕەوانە، وەرزێکی نموونەیی و لەبارە بۆ ڕاوکردن، بەڵام بە بەراورد کردن لەگەڵ ساڵانی ڕابردودا، ئێستا ئەو هێزەی جارانیان نەماوە. هەروەها ڕاستڕەوی هۆڵەندیش وەک جاران بەهێز نییە و لاواز بووە. ئەم ڕاستڕەوە لەسەر نەیارەکەی خۆی دەژی کە ئیسلامی توندڕەوەو، وەک جۆرێک لە مەترسی پیشانی دەدات و تەواوی ڕەوەندی موسڵمانی تێوە دەگلێنێ.

*هەندێک هەیە پێیان وایە بوونی ئەو ڕەوەندە زۆرەی موسڵمان لە هۆڵەندە و زۆرێک لە وڵاتانی ئەوروپی، وەک دیارییەک وایە لە

ئاسمانەوە بۆ ڕاستڕەوی توندڕەو هاتبێتە خوارەوە، لەوانەیە ئەو ڕاستڕەوانە لە چەند وڵاتێکی ئەورووپیدا، لەسەر پشتی ئەسپی موسڵمانەکان بگەنە دەسەڵات.
-چۆن دیارییەک... هێند بەنرخە لە خەیاڵی کەسدا نەبووە. لەم چەند ساڵەی دوایدا تێبینی ئەوەمان کردووە ڕاستڕەوی ئەورووپی، بە پاساوی هەڕەشەی ئیسلامی، توانیویانە گەشە بکەن و هەستنەوە. بەداخەوە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری زۆرێک لە موسڵمانەکان یارمەتی ئەو گەشەکردن و هەستانەوەیەی داوە. بەڵام خۆشبەختانە ئەم گەشەو هەستانەوەیە تەنها کۆمەڵێ دروشمی میدیایی بوو، کاری لەسەر ترس و تۆقاندن دەکرد، گوایە ئەوانە هەڕەشەیەکی گەورەن بۆ سەر بونیادی کۆمەڵگای مەسیحی خۆرئاوا. هەستانەوەی ڕاستڕەوی توندڕەو، هیچ بەرنامەیەکی سیاسی و ئابوری ڕاستەقینەی لەگەڵدا نەهات خزمەت بە کۆمەڵگا بکات. لەبەرئەوە کاروانی پاشەکشەی ئەم ڕاستڕەوە دەستی پێکردووە.
لە هۆڵەندە (خەیرەت فیلدرس) لە دواهەمین هەڵبژاردنەکاندا شکستێکی گەورەی بەدەستهێنا، چونکە پێیوابوو پاساوی ئیسلامی توندڕەو، بەسە بۆ ئەوەی بردنەوە بەدەست بێنێت. کەچی کۆمەڵگای هۆڵەندی سزایان دا، کاتێ بۆیان دەرکەوت بەرنامەی هەڵبژاردنەکەی بەرنامەیەکی منداڵانەیە و پشت بە قسە و قسەڵۆک دەبەستێت، لە کۆمەڵگایەکدا لە ڕووی فیکرییەوە زۆر پێگەیشتووە و پێی وایە ئابووری ئەو گۆڕەپانە سەرەکییەیە کە تێیدا هەڵبژاردەکان دەستنیشان دەکرێن. پێشتر هەمان شت لە نەمسا ڕویدا. لەمڕۆدا کۆمەڵێ گروپ لە سوید دەبینین، لە نێویاندا پیاوی لەچک بەسەر هەیە، وەک پشتگیرییەک بۆ ئەو ئافرەتە لەچک بەسەرەی دووچاری چەوساندنەوە هاتبوو.
جێگای خۆشحاڵییە ئەو بونیادە فیکری و سیاسییەی خۆرئاوا دەوڵەتە مەدەنییەکەی خۆی لەسەر دروست کردووە، ڕاستڕەوەکان ناتوانن بۆ ماوەیەکی درێژ دزە بکەنە ناویەوە. لەبەرئەوە دەبینین ڕاستڕەوی سیاسی لە پاشەکشە و لاواز بووندایە و تابێت پێگەی خۆی لەناو حکومەت و پەرلەمانەکاندا لەدەست دەدات. چونکە لەو شوێنانەدا سیاسەت بە وردبینی و بژارکردنێکی پوختەوە دروست دەکرێت، دوور لە وروژاندنی خەڵکی لە پشت میکرۆفۆن و مینبەرە میلییەکانەوە.

**سەرچاوە: الاوان**، ٢٠١٤/٤/١٩





# چاوپێکەوتن لەگەڵ
# یواخیم سارتۆریۆس

**سازدانی: ڕەجا مەلاح**

**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع**

یواخیم سارتۆریۆس (١٩٤٦) دیارترین شاعیری ئەڵمانیایە و بەڕێوەبەری فیستیڤاڵەکانی بەرلینە، هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە یاسادا، بەڵام ژیانی پیشەیی وەک دیبلۆماتکارێک دەستپێکرد، لەسەر هەمان ڕێچکەی باوکی. لە تونس و نیۆیۆرک و ئەستەنبوڵ و نیقۆسیا نیشتەجێ بووە، ماوەیەک بەڕێوەبەری پەیمانگای گۆتە بووە. چوار دیوانی شیعری بڵاوکردووەتەوە، هەروەها شیعری ئەمریکی و فەرەنسی وەرگێڕاوە، چەندین توێژینەوەی لەسەر شیعر کردووە، لەوانە (ئەتڵەسی شیعری تازە). ڕۆڵی لە بەیەکگەیاندنی پردی پەیوەندی نێوان هەردوو کەلتوری ئەڵمانی و عەرەبیدا هەبووە، چ وەک بەڕێوەبەری فیستیڤاڵەکانی بەرلین یان وەک بەشداریکردنی لە گۆڤاری

دیوان.
لە دیارترین کتێبەکانی سارتۆریۆس کتێبی (ئەسکەندەریە تراویلکەیە- الاسكندرية سراب) کە لەلایەن فارس یواکیم-وە کراوە بە عەرەبی. هەروەها هەڵبژاردەیەک لە شیعرەکانی بە ناونیشانی (ئەوە چییە مرۆڤ دەیبینێ کاتێ دەیبینێ)، ئەم کتێبەی لەلایەن دەزگای (تۆبقال) ی مەغریبییەوە بڵاوکراوەتەوە و مستەفا سلیمان وەریگێڕاوە بۆ عەرەبی. کتێبی (ئوتێلی لانەوازان) کە لەلایەن دەستەی پرۆژەی (وشە- الكلمة) بۆ وەرگێڕان لە ئەبو زەبی بڵاوکراوەتەوە و دیسانەوە مستەفا سلێمان کاری وەرگێڕانەکەی ئەنجامداوە.
لە میانەی پێشانگای ئەبو زەبی نێودەوڵەتی بۆ کتێب، چاومان کەوت بە شاعیر و نووسەر یواخیم سارتۆریۆس و کۆمەڵێ پرسیارمان لێکرد:

*ئاشکرایە تۆ یەکێکی لەوانەی بایەخ بە ئەدەبی جیهانی سێیەم دەدەیت، ژمارەیەک لە شاعیرانی ئەفریقات بانگهێشتی فیستیڤاڵی بەرلین کرد کە بۆ ماوەی چەندین ساڵە سەرپەرشتی دەکەیت، چۆن لەم ئەدەبە دەڕوانیت؟

-لە فیستیڤاڵی بەرلینی ساڵی ١٩٨٨، تەوەرێکی زیندووم خستەڕوو، تەوەرەکە تایبەت بوو بە ئەورووپا وەک ئەوەی نووسەرانی دەرەوە دەیبینن. بۆ ئەو مەبەستە ژمارەیەک لە شاعیرانی ئەفریقام بانگهێشت کرد، لەوانە "شینوا ئاشیبی" لە نێجیریا، "جان ماری ئەدیافی" لە ساحل عاج، "نیگۆگی واسیگۆ" لە غانا و چەندین شاعیر و نووسەری دیکە. ئەوانە لە شیعرەکانیاندا چەندین بابەتی گەرمیان خستەڕوو، قسەیان لەسەر کۆمەڵێک مەسەلە کرد کە تایبەت بوو بە: گەندەڵی، توندوتیژی، نەخۆشی ئایدز، وێرانکردنی سروشت، مێژووی ئەفریقا، زمانی کەلتوورەکانی ئەفریقا. ئەو شاعیرانە بە چەندین دیدگای جۆراوجۆرەوە، تیشکیان خستە سەر ئەو بابەتانە. ئەمە وایکرد ئێمەی ئەورووپییەکان کە بێ ئاگاین لەو جیهانە، زانین و مەعریفەتمان بەو جیهانە زۆرتر بێت. هەروەها ئەوان لای خۆیانەوە تێڕوانینە تایبەتەکانی خۆیان، بەرامبەر بە جیهانی ئێمەی ئەورووپی ئێمە، خستەڕوو. بەم شێوەیە جۆرێک لە ئاڵوگۆڕی کەلتووری و مەعریفی هاتەئاراوە، ئەوەش یەکێکە لە ئامانجەکانی فیستیڤاڵی بەرلین کە چەندین ساڵە هەوڵدەدا تێڕوانین و دیدگاکان لەیەکتر نزیک بکاتەوە.

*تۆ شاعیریت، بەڵام لەهەمان کاتیشدا وەرگێڕیت، بەو پێودانگەی لە هەردوو زمانی ئیتالی و ئینگلیزییەوە کاری وەرگێڕان دەکەیت، چۆن لە وەرگێڕان دەڕوانیت؟

-هەمو زمانێک پڕە لە ژمارەیەکی بێشومار لە ڕەمز و مانا، لەبەر ئەوە وەرگێڕان کارێکی سەختە. هەیە لافی ئەوە لێدەدات کە زمانێکی زۆر دەزانێت، وەک فەرەنسی و ئەڵمانی و ئیتاڵی و ئیسپانی، بەڵام ئەوە فریودانێکی گەورەیە. چونکە زمان بە تەنها شتێکی ڕووت و قووت

نییە، بەڵکو زمان هەڵگری چەندین ئەفسانە و حیکایەت و مەتەڵە و تەنها کەسێک ناتوانێت نهێنییەکانی و بەکارهێنانەکانی بکاتەوە کە لە ژماردن نایەن.
تیۆرگەلێکی زۆر دەربارەی وەرگێڕان هەیە، ڕەنگە باشترین کەسانێک بۆ وەرگێڕانی شیعر، شاعیرەکان بن. بەڵام زۆر زەحمەتە شیعری شاعیرە مردووەکان وەربگێڕدرێت، چونکە تۆ ناتوانیت پرسیاری مانا قورس و ئاڵۆز و تەمومژاوییەکانیان لێ بکەیت کە لە شیعرەکانیاندا هەیە. بەڵام دەتوانی ئەوە لەگەڵ شاعیرە زیندووەکاندا بکەیت. هەروەها لە پرۆسەی وەرگێڕاندا مۆسیقا تابڵێی پێویستە، دەبێ ئاگامان لە مۆسیقای زمانەکەی دیکە بێت، بێ ئەوە ناتوانرێت کاری وەرگێڕان ئەنجام بدرێت. وەرگێڕ بۆ ئەوەی کارێک وەربگێڕێت، پێویستە تەواوی ئامرازەکانی وەرگێڕانی لا دەست بکەوێت. واتە لەیەککاتدا پاڵنەری حسی و مەعریفی هەبێت. بۆ نموونە، هەندێ لە کارەکانی شاعیری ئیتالی "جیاکۆمۆ لیۆباردی کانتی"م وەرگێڕایە سەر زمانی ئەڵمانی، ئەم شاعیرە لە زمانی ئەڵمانیدا ناسراو نەبوو. من سەرسام بووم بەوەی ئەم شاعیرە لەسەر بەختەوەری مرۆڤ وتویەتی و پێیوایە بەختەوەری لە وەهمدا خۆی دەبینێتەوە. ئەم بیرۆکەیە سەرسامی کردم و هانیدام وەریبگێڕم. هۆکارێکی دیکە بۆ وەرگێڕانی ئەم شاعیرە، ئەوەیە لە هەمان سەردەمی شاعیری ئێمە "هۆڵدەرلین"دا ژیاوە.

*چۆن ئەو شاعیرانە هەڵدەبژێریت کە شیعرەکانیان وەردەگێڕیت؟

-وەرگێڕانم بۆ گەلێک شاعیر ئەنجامداوە، لەوانە: "جۆن ئازبری، وای ئای، کیمنگز، ولاس ستیفنز، ولیەم کارلۆس لیمز". هەموو شاعیرێک لای من پێگەیەکی لە دەروونمدا هەیە. وەک کەمەکێک لەمەوبەر وتم پێویستە هۆکارەکانی وەرگێڕانی ئەم شاعیر یان ئەوی دیکەیان، بدۆزیتەوە و لات ڕوون و ئاشکرا بێت، ئەو هۆکارانە تێکەڵ بە بارودۆخی بابەتی و زاتی بکرێت.

*چۆن لە مەسەلەی وەرگێڕانی شاعیرەکان بۆ شاعیرەکانی دیکە دەڕوانیت؟

-ئەم مەسەلەیە تابڵێی ئاڵۆزە. پێش هەموو شتێک، لەو بڕوایەدام وەرگێڕان بە ڕاستی کارێکی مەحاڵە. بەڵام کاتێ وشەکانی شاعیری فەرەنسی "میشال دیگی"م بیردەکەوێتەوە: (شیعر چەند زیاتر گوزارشت لە خۆی بکات، وەرگێڕانی مومکینە، بەدرێژایی چەندین ساڵ ئەگەری ئەوەی شیعر تەرجەمە ناکرێت، لای هەزاران وەرگێڕ ڕەتکراوەتەوە). لەبەرئەوە دەڵێم وەرگێڕانی سەرکەوتوو پێویستە پشت بەو ڕەهەندە گەردونییە ببەستێت کە لە هەموو قەسیدەیەکدا هەیە، ڕەهەندی گەردونی زاراوەکان و ئیقاعی شیعرەکە کە بریتییە لە وێنەیەکی ئەسڵی (تیشکی ئێکس) وەک ئەوەی شاعیری فەرەنسی میشاڵ دیگی دەیڵێت.
سەبارەت بە وەرگێڕانی شاعیرەکان بۆ

شاعیرەکانی دیکە، دەڵێم ئەوانە کارە وەرگێڕدراوەکان تێکەڵ بە هەستەکانی خۆیان دەکەن. من لە کتێبی (وشە بیانییەکان- الكلمات الاجنبیة)دا، بە دوور و درێژی قسەم لەسەر ئەو بابەتە کردووە و ئەو کێشانەم خستووەتە ڕوو کە بەو هۆیەوە دێنەئارا. لێرەدا دەتوانم باس لە وەرگێڕانەکانی "ئەنگیبۆرک باشمان" بۆ شیعری "مونتالی" بکەم، هەروەها وەرگێڕانەکانی "پۆل سیلان" بۆ شیعری "ئۆسیپ ماندلستام" بکەم. لە وەرگێڕانی ئەمەی دواییاندا دەرکەوت، وەرگێڕانەکە لە ٥٠٪ ڕۆحیەتی شیعری ماندلستام-ە و لە ٥٠٪ ڕۆحیەتی شیعری پۆل سیلان-ە. (واتە شاعیرە وەرگێڕەکە نیوەی هەستەکانی (ڕۆحیەتی) خۆی تێکەڵ بە شیعرە وەرگێڕدراوەکان کردووە. و-ک)

لەلایەکی دیکەوە "تید هیوز"ی شاعیر کە لە حەوت زمانەوە کاری وەرگێڕانی بڵاوکردووەتەوە دەڵێ: (مەسەلەی پێشکەش کردنی شتێک لە جانتای دەرمانی وەرگێڕدا، کارێکی نەکردەیە). من پێم سەیرە چۆن توانیویەتی خۆی لە کارێکی لەو شێوەیە دوورخاتەوە، واتە هیچی لە شیعرەکانی خۆی نەخستووەتە سەر شیعرە وەرگێڕدراوەکان! دەکرێ شاعیری ئەمریکی "والاس ستیڤنسن" وەک نموونەیەکی دیکە بێنمەوە کە قورسترین شاعیر بووە کاری وەرگێڕانم بۆ کردووە. چونکە چوار ئاست لە شیعرەکانیدا هەیە کە ئەمانەن، یەکەم: ئاستی فیکرەی شیعرەکە، واتە بیرکردنەوە و فەلسەفە. دووەم: مۆسیقا. سێیەم: ڕێکخستن و شێواز و زمان. چوارەم: ناوەرۆکی کەلتوری.

*تۆ لەوکاتەی بەڕێوەبەری پەیمانگای گۆتە بوویت لە شاری بەرلین، بایەخت بە پەیوەندییەکانی تورکی ئەڵمانی داوە، ئایا دەکرێ باس لە گرنگی ئەم پەیوەندییانە بۆ ئەڵمانیا بکەیت؟

-پێش هەمو شتێ من بەڕێوەبەری پەیمانگای گۆتە بووم، ئەم پەیمانگایە لە بنەڕەتدا کار بۆ بڵاوکردنەوەی زمان و کەلتوری ئەڵمانی دەکات لە هەموو جیهان، ئەمە لەلایەکەوە. لەلایەکی دیکەوە، من کارم لە بواری دیبلۆماسیدا کردووە، بەشێک لە کاری ئەو بوارە بایەخ بە پەیوەندییەکانی نێوان وڵاتان و کەلتورەکانیان دەدات. لێرەوە من لەو شوێنەدا بووم کە وایدەکرد بەم ئەرکە هەستم. هەروەها تورکیا توانی لەسەر ئاستی سیاسی، بە دیاریکراوی لەسەر ئاستی ئابوری، خۆی خۆی هەستێنێتەوە، بێ ئەوەی پێویستی بە ئەڵمانیا یان یەکێتی ئەوروپا هەبێت کە تا ئێستاش لە هەوڵی ئەوەدایە ببێت بە ئەندام تێیدا.

بەم جۆرە پەیوەندییە کەلتورییە ئاڵوگۆڕپێکراوەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتە، ڕەهەندێکی بەرفراوانتریان بە خۆیانەوە بینی. بێگومان ناکرێ وێنای ئەڵمانیا بکەین، ئەم وڵاتە پان و بەرفراوانە بە کەلتوورەکەی و قوڵاییەکەی، بێ لەبەرچاوگرتنی ڕەوەندی تورکی کۆچکردوو. ئەم ڕەوەندە لە توانایدا هەیە ئەوەی پێیدەڵێین تێکەڵبوون بە کەلتوری ئەڵمانی، بێنێتە دی. لێرەوە ئەرکی سەر شانی ئێمە بوو پاڵپشتی ئەو دامودەزگایانە بکەین کە

کار بۆ هاندانی فرەیی کەلتوری دەکەن. ڕەنگە سیاسەتی کەلتوری تورکیا بۆ دەستبەرداربوون لە نەریتی ئەتاتورک و کەوتنی چەمکی یەکێتی نەتەوەیی و پێ خستنە ناو عەلمانیەت، هۆکاربن لە پشت بوژانەوە سەردەمیانەکەی تورکیاوە. بەتایبەتی دوای ئەوەی ئەم وڵاتە بۆی دەرکەوت ڕەچەڵەکێکی ئەتنی فرە ڕەنگی هەیە و خاوەنی چەندین هونەرمەندی جۆراوجۆرە و ئەستەمبوڵ دەوڵەمەندە بە کەلتورە جیاواز جیاوازەکان.

پەیوەندییەکانی ئەڵمانی تورکی، سیاسەت تێدەپەڕێنێت و پانتاییەکی فراوانی هونەرمەندان و ژەنیاران و تەلارسازان و ئەکادیمییەکان و دەرهێنەرە سینەماییەکان و ئەوانی دیکە دەگرێتەوە. هەرچەند پەیوەندییە ئاڵوگۆڕپێکراوەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتە لە ئارادایە، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا ئەڵمانیا پێویستیەکی زۆری بەوەیە سیاسەتێکی کەلتوری بەرامبەر بە تورکیا دامەزرێنێت. ئەڵمانیا کەرەستە و ئامێری تەواوی بۆ ئەو مەبەستە هەیە.

*کەواتە ئێوە جەخت لەسەر پەیوەندییە کەلتورییەکانی نێوان هەردوو وڵات دەکەنەوە، گەرچی فرەییەکی گەورە لە نێوانیاندا هەیە؟

-بە پلەی یەکەم مەبەستمان ئەو فرەییەیە کە قسەی لەبارەوە دەکەیت، ئەوە بە شێوەیەک لە شێوەکان دەوڵەمەندکردنە. لای ئێمە هیچ شتێک لە کەلتور گرنگتر نییە بۆ جێگیرکردنی پەیوەندییە سۆزداری و مەعریفییەکانی نێوان گەلان. وەک چۆن کەناڵێکی تەلەفزیۆنی هاوبەشمان لەگەڵ فەرەنسا هەیە و بەرنامەکانی بە ناوی "ئارِ تی" پەخش دەکات. هیواخوازی ئەوەین لە ئایندەدا کەناڵێکی لەم چەشنە لەگەڵ تورکیا دامەزرێنین، ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە جیهاندا، بە پلەیەکی هێجگار گەورە گەشەی کردووە. نەوەیەکی نوێ پەیدابووە لە ڕێگەی



ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتیانەوە، قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن و زانست و مەعریفە لەگەڵ یەک دەگۆڕنەوە. ئێمە ناتوانین بە ڕووی ئامرازە تازەکانی پەیوەندی کردن بوەستینەوە کە نەوەی نوێ خۆی پێ چەکدار کردووە. ئەم ئامرازانە جیاوازە لەو ئامرازی پەیوەندیکردنانەی نەوەی کۆن بەکاریان دەهێنا.

*دەکرێ بڵێین تۆ شاعیرێکی کراوەیت بەسەر شارستانیەتەکانی جیهان و کەلتورە فرە ڕەنگییەکەی؟

-سروشتی شیعر ئەوەیە گەردونییە، گەر بە تەنها بەسەر خودی خۆماندا کزۆڵە بکەین، ئەوا گەردونی بوونی شیعر و هیومانیستییەکەی شیعر نایەتەدی.

*ئەو شارانە کامانەن کە سەرسامیان کردویت و کاریگەریان لەسەر نوسینەکانت هەبووە؟

-دیمەشق سەرسامی کردوم، ئەو یەکێکە لەو شارە کەمانەی جیهان کە هەڵگری بڕێکی هێجگار زۆری یادەوەرییەکانە، یادەوەرییەکانی پەیوەست بە شارستانییەتە جیاوازەکان و جۆراو جۆرەکان. لە دیمەشق دەتوانی بەسەر چینە جیاوازەکانی شارستانیەت و کەلتوورەکاندا بڕۆیت. هەروەها ئەسکەندەریە یەکێکە لەو شارە دەگمەنانەی تەواو وەک ئەو وێنەیە وابوو کە لە میانەی خوێندنەوەکانمدا لە خەیاڵم لەسەر ئەو شارە هەمبوو. نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە ئەسکەندەریە بە درێژایی سێ سەدە، ناوەندی جیهانی خۆرئاوا بوو. هەروەها شاری ئەدیبەکانە کە لە یادەوەری خۆیاندا بونیادیان نابوو، لەوانە "لۆرانس داریل، ئۆنگاریتی، کەفافی، فۆستەر، ئێدوارد خرات، ئەندرێ ئیسمان" و بلیمەتەکانی دیکە.
هێندە بەسە ئەم شارە، لەگەڵ پێشەنگانی شیعری تازەگەری جیهانی ژیاوە. ئەمە جگە لەوەی ئەفسانەی ئەم شارە بە پلەی یەکەم ئەفسانەیەکی ئەدەبییە، کتێبخانەکانی بریتییە لە بەهەشتێکی ونبوو. دەکرێ تا نا کۆتا قسەی لەبارەی ئەم شارەوە بکرێت. هێندە بەسە من کتێبێکم لەبارەیەوە نووسیوە: (الاسکندریە سراب)، ئەسکەندەریە شاری کرانەوەو کۆسمۆپۆلیتییە، کۆمەڵگای ئەسکەندەرەیە بەوە جیادەکرێتەوە کۆمەڵگایەکی فرە ڕەگەز و فرە کەلتورە. هەر ئەمەشە وای لێکردووە، لە ڕۆژی دروستبوونی شارەکەوە تا نیوەی سەدەی بیستەم، ببێتە ناوەندێکی ڕۆشنی شارستانیەتی درەوشاوە. ئەسکەندەرییە لەو جۆرە شارانەیە، ئەدیبەکان و نووسەران و شاعیران بە نەمری باسی لێوە دەکەن. ئەو بەردەوام لە خۆڵەمێشەکەی خۆیەوە لەدایک دەبێتەوە.
*چی دەربارەی شیعری عەرەبی دەڵێیت؟

-دەتوانم بڵێم ئێمە هەست و سۆزە مەزنەکان و گفتوگۆ لەگەڵ شارستانیەت و کەلتوورەکانی دیکە، لە شیعری عەرەبییەوە فێردەبین. گرنگی ڤیستیڤاڵەکانیش ئا لێرەدا دەردەکەوێت، لەوەدا دەردەکەوێت فیستیڤاڵەکان تەنها

بەوەوە ناوەستێت ئامادەبووان بێن و شیعر بخوێننەوە و پاشان بڕۆن. لە بەشداریکردنم لە فیستیڤاڵەکانی دیمەشق و دوبەی و ئەوانی دیکە، هەستێکی جوانم لا دروست بووە، چونکە ئەو یەکانگیرییە زیندووەی نێوانمان، وای لێکردین وێنەی ڕاستەقینەی ئەوی دیکە ببینین، نەک وێنە سواوە ناڕاستەکە کە لەوانی دیکەوە بۆمان مابووەوە.

*پرۆژە تازەکانت چین؟ تۆ هەم توێژینەوە دەنووسیت و هەم شیعر؟
-خۆم ئامادە دەکەم بۆ بڵاوکردنەوەی کتێبێک لەسەر سیاسەت و شیعر لە سەدەی بیستەمدا. کتێبەکە بریتییە لە توێژینەوەیەکی گەورە و پێش مانگێک لەمەوبەر تەواوم کرد، لە پایزی ئەم ساڵ ٢٠١٤ لە شاری کۆڵۆن بڵاودەکرێتەوە.

*ساڵی ٢٠٠٨ سەردانی دوبەی-ت کرد و بەشداری ئەو فیستیڤاڵەت کرد کە تەنها بۆ یەک جار سازکرا. تۆ ئێستا بە سەردان هاتویت بۆ پێشانگای ئەبو زەبی نێودەوڵەتی بۆ کتێب، هەروەها لە هەر یەک لە مەغریب و ئیمارات، بەرهەمێکی زۆرت کراون بە عەرەبی، تا چەند ئاگاداری ئەدەبی عەرەبی-ت؟

-لەبەرئەوەی من عەرەبی نازانم، بۆیە لە میانەی وەرگێڕانەکانەوە ئاگاداری ئەدەبی عەرەبیم، ئەوەش مەسەلەیەکی ناخۆشە، چونکە شیعری وەرگێڕدراو لە کاتی وەرگێڕانیدا، بڕێکی زۆر لە سیحر و لە جوانی لەدەست دەدا. ئەدۆنیس-م خوێندووەتەوە و لەسەرم نووسیوە، هەندێ لە ڕۆمانەکانی نەجیب مەحفوز و عەلا ئەسوانی و ئەدوارد خەرات و جەمال غیتانی و نجم والی و فازل عەزاوی-م خوێندووەتەوە. لە ئەسکەندەرییە هەفتەیەک لەگەڵ هاوڕێی نووسەر خالد الخميسي بووم، ئەو زمانێکی زۆر دەزانێ، ئەمە پرۆسەی قسەکردن و تێگەشتنی نێوانمانی زۆر ئاسان کرد. ئێمەی ئەڵمان، بۆ چەندین ساڵی دوور و درێژ ئاگاداری ئەدەبی ئەمریکای لاتین بووین، وادیارە ئێمە ئەدەبی عەرەبیمان پشتگوێ خستووە.

**سەرچاوە: الشرق الاوسط**، ١٩ / ٧/ ٢٠١٤



# بەردەوام خۆم پاك دەكەمەوە

# گفتوگۆ لەگەڵ جویس كارۆل ئۆتس

**لە فارسییەوە: جەبار سابیر**

یەکشەممە ٦ی نیسانی ساڵی ٢٠٠٨ جویس کارۆل ئۆتس لە دامێنی تەمەنی حەفتا ساڵیدا گفتوگۆیەک لەگەڵ جفری سمالدن ساز دەکات لە بڵاوکراوەی هەواڵیی کۆڵۆمبس دیسیچ.

جان ئاپدایک، جویس کارۆل ئۆتس بە دیارترین "نووسەری ژن"ی ئەمریکا ناو دەبات و مایکل دیردا ناوی ناوە "ژنی پێشڕەوی ئەم بوارە". یەکەمین کتێبی کۆمەڵە چیرۆکێکی کورت بوو کە لە

ساڵی (١٩٦٣) بڵاوبۆوە و لەوکاتەوە تا ئەمڕۆ ئۆتس پتر لە (٧٠٠) کورتە چیرۆک و (٣٥) ڕۆمان و یەک دنیا وتار و شیعر و شانۆنامەی نووسیوە. نوێترین کاری ئەو کۆمەڵە چیرۆکێکە بە ناونیشانی شەوە دڕندەکان (وەحشییەکان!) چیرۆکگەلێک لەبارەی دوایین ڕۆژانی پۆ، دیکینسۆن، تۆیین، جیمز و هەمینگوای. لە مانگی شوباتی ئەمساڵ (٢٠٠٨) ریمۆند سمیتی هاوسەری ئۆتس دوای چلوهەشت ساڵ ژیانی هاوبەش لەگەڵ ئۆتیسدا، مرد. بەم بیانوەوە نامەگۆڕینەوە ئەم گفتوگۆیەمان لەگەڵدا کرد.

* دوایین کۆمەڵە چیرۆکی تۆ بە وێنەیەکی خەیاڵی لە دوایین ڕۆژانی ژیانی نووسەرانی بەناوبانگ دەدوێت. چۆن گەیشتییە ئەم بابەتە؟

– ساڵانێک لەمەوبەر داوایان لە من کردبوو بە کورتی باسی هەمینگوای بکەم. بەڵام حەزێکی وام بۆ بیۆگرافی فەرمی و پێشکەشکردنی وردەکاری ژیان نەبوو، هەربۆیە چاوپۆشیم لە پڕۆژەکە کرد. بیرم لەمە دەکردەوە ئەگەر من بوومایە چۆن دەمنووسین، ئەمە بوو کە ڕێک بە چیرۆکی "پاپا لە کچام، ١٩٦١" کارەکەم دەستپێکرد، واتا دوا دیمەنی ژیانی هەمینگوای. بابەتێک بوو کە بە قووڵی دەرگیری بووم، بەهێز و ڕاکێشەر بوو. دەمزانی کە هەمیشە حەزم دەکرد ڕۆژێک لە بارەی هەمینگوایەوە بنووسم... هەروا بێتەوە ساڵانێک نووسین، باقی تێکستێک کە لە پەڕە کاغەزێکدا بە ناونیشانی "فانۆسی دەریایی" لە پەنا کاغەزەکانی ئالان پۆ دوای مردنی دۆزرایەوە، بووبووە کەڵکەڵەم. هەمیشەیش حەزم دەکرد لە بارەی سام کلیمنس و یارییەکەی لەگەڵ کچە منداڵکارەکان بنووسم... بیرم کردەوە گەر لە سەر دوایین ساڵان و ڕۆژانی ژیانی ئەمانە چڕبمەوە، واتا سەردەمێک کە هیچ شتێکی ڕوون و دیاریکراو نییە و دەستمایەی دراماتیکی باشیشی هەیە، هەموو ئەم بابەتە سەرنج ڕاکێشەرانە، باش لە پەنایەکەوە دەوەستن.

* ناونیشانی کۆمەڵە چیرۆکەکەی تۆ لە بەشی یەکەمی شیعرێکی دیکینسۆن "شەوە دڕندەکان! شەوە دڕندەکان" وەرگیراوە کە بەشێوەی ئاسایی بە شیعرێکی دەزانن لەبارەی تامەزرۆییەوە. چ شتێکی ئەم شیعرە بۆ تۆ سەرنج ڕاکێشە و چۆن ئەوە بە مەبەستی خۆت لە کۆتایی چیرۆکەکان پەیوەست دەکەیت؟

– هەموو ئەم چیرۆکانە لە بارەی شەوە دڕندەکانەوەن- شەوق و ئارەزوویەکی ناتەواو. ئارەزووی ئەزموونی شتێکی پێناسەنەکراو و ڕەنگە دەست پێڕانەگەیشتوو کە بە بۆچوونی من لە تانوپۆی ئەم ململانێ داهێنەرەدا شاراوەتەوە. لەم ڕووەوەیە کە نوسەران و شاعیران بەشێوەیەکی ئاسایی پاش تەواوکردنی کارەکەیان تووشی ماخۆلیا دەبن. شیعری دیکینسۆن جوانە و هەڵقوڵاوی ناخی خودی کەسێتی ئەوە.

* یەکێک لە ڕەخنەگران "بۆک لیست" شەوە وەحشییەکان بە کۆمەڵە چیرۆکێکی ئەزانێت کە بە شێوەیەکی ئازایانە وێرانکەرە و قووڵ

ڕۆچۆتە وێرانکردنی کەسێتییە گونجاوەکانەوە، چۆن وەڵامی ئەم ڕەخنەیە دەدەیتەوە.
– من پێموایە ئەو وێنانەی کە دروستم کرد نەک تەنها ڕووخساری گونجاوی ئەم کەسێتیانە هەڵناکۆڵێ، بەڵکو فراوانی و قووڵیشی پێداون. هەستەکەم وێنەی هینری جیمس وەک پیاوێکی گەرموگوڕ، دڵسۆز و بەخشندە و پڕ جورئەت دەکێشێ کە کەمتر کەسێک لەودا بینیوێتی، یان لە کارە خۆبەخشەکانیدا لەنەخۆشخانەکانی لەندەن لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا ئاگادار بووە. بەڵام بە ئەنقەست دەمویست کەسێتییەکانی سام کلمنس و هەمینگوای تراژیدی بن.

* چیرۆکەکەت لەبارەی ژن و مێردێک کە مۆدێلێکی زیندووی ئەمیلی دیکینسۆن دەکڕن و لەماڵەوە وەک ئاژەڵێکی ماڵی دەیخەنەڕێ پێکەنیناوی و خەماوییە. دەتویست بەم چیرۆکە بگەیتە چی؟
– کارەکانی ئەمیلی دیکینسۆن زۆر بەرزن و ژیاننامەکەی به شێوەیەکی سەیر لەگەڵ دەستکەوتە ئەدەبییەکانیدا دێتەوە، نووسەرانی دی بە خاوەنی توانایەکی خۆیی دەزانن. ئیقتباسێکی نماییشی لەم چیرۆکە دروستکراوە کە لایەنە پێکەنیناوی و سوریالییەکەی تۆخ دەکات و ئەو دەلاقە گەورەیەی کە لەنێوان بلیمەتی شاعیر و خانەخوێکانیدا لە گۆلدزگرین هەیە نمایش دەکات.

* مەبەستمە بزانم لەساڵی (٢٠٠٨) بۆ پیلاندانانی یاداشتی تایبەتی ڕۆژانەتان چ بەرنامەیەکت هەیە. لە کۆتایی یاداشتی رۆژانەی دوورودرێژ و کاریگەری خۆت لە بارەی باوک و دایکتانەوە کە هەر دووکیان مردوون، نووسیوتە "قەت ناتوانم جارێکی دی ئەمانە بخوێنمەوە، ئەسڵەن بۆچی دەیاننووسم؟" ئێستا کە بیست و پێنج ساڵ لەو پرسیارە تێپەڕیوە چ وەڵامێک بە ئەمە دەدەیتەوە؟
– ئارەزوو بۆ نووسین لە دەفتەری یادەوەریی ڕۆژانەدا وەک ئارەزوو بۆ دوعا، ڕەگوریشەی لە ناخی مرۆڤدا هەیە. ئێمە یاداشت دەنوسینەوە تا ئەوەی کە هەیە ڕوونتر ببینین، تەنانەت ئەگەر ئەوەی نووسیومانە ئیدی نەیخوێنینەوە، یا نەمانەوێ ئەو هەستانە جارێکی دی لە ئێمەدا بوروژێن. باوانی ئێمە بەشێوەگەلی سروشتیتر دوعایان دەکرد، لە کەنیسە، یادەوەرییەکانیان دەنووسی. لە کاتێکدا ئێمە لە چەرخێکی بەلەزدا بە خێرایی بەرەو پێش دەچین، بێئەوەی ئاوڕ بدەینەوە؟ یاداشتی رۆژانە ژیان پێش دەخات. تاک ناچار دەکات تا لە نزیکەوە سەیری بکات و پتر درکی بکات. لەم ساتەی ژیانمدا من مەودام لە ئەرشیفکردنی یاداشتەکانی ڕۆژانەم گرتووە و لەبری ئەوە ئیمێلەکانم هەڵدەگرم، نامەگەلی دوورودرێژ و زۆربەیجار سەرنجکێش کە لەگەڵ ئەوانیدی ئاڵوگۆڕی دەکەم. ئەم گۆڕینەوەی ئیمێلانە وردە ژانرێکی نوێی ئەدەبییە، بەزمە!

* لە ڕۆژانەی نووسینتاندا خۆتان بە "تەمەڵ" و "هەمیشە سست و مەست" ناوبردووە و بەهەرحاڵ تۆ چەندین دەیەیە بە شێوەیەکی سەرسووڕەێن پڕ کاریت. ئایا هێشتایش ئەم

دژیاتیانە لە تۆدا هەیە؟
-لە کاتی مردنی ناچاوەڕوانکراوی مێردەکەمەوە بەڕاستی هێزێکی ئەوتۆم نییە. تاڕادەیەک هەمیشە ماندووم و شەوان بێخەوییەکی ترسناک بەسەر دەبەم. کەواتە لەوەیە کاتی وزەی ناتەواوی من تەواو بووبێت... ئێستا بە تەنیا دەژیم، چما ناوەندێکی قورساییم نییە یا ئۆکسیژن کەم دەهێنم... ئازادی تەنیا بوون شتێکی خەماوییە.
هاوسەرەکەم ئەسڵەن گیرۆدەی ژیانی ئەدەبی من نەبوو، زۆربەی نووسینەکانمی نەدەخوێندەوە، تەنها بە ڕێکەوتی هەلومەرجەکە هەندێک ڕەخنەکانی دەخوێندنەوە. ڕێ، لە پلەی پێداچۆرەوەدا چاوانێکی تیژی هەبوو. ئێمە زۆربەی کاتەکان لەم ماڵەدا پێکەوە بووین، لە ژووری کاری جیای خۆمان. کاتی نانخواردن و پیادەڕەوی عەسرانە و پایسکل سواری و کۆبوونەوە گشتییەکان یەکتریمان دەبینی. ڕێ هیچ کاتێکدەستی وەرنەدایە ژیانی پیشەیی منەوە، بۆچوونی دەرنەدەبڕی و بایەخێکی بە زۆرینەی ئەو ڕەخنە و کۆڵین و وتارانە نەدەدا کە لەبارەی منەوە بوون. ئێمە باشترین هاوڕێ و مەحرەمی ڕازی یەکتری بووین، هەڵبەتە من هەوڵم دەدا تا ئەو کاتەی ناچار نەبم بە هەواڵی خراپ و ناخۆش ئازاری ڕێ نەدەم.

* لە یەکێک لە وتارەکانتدا پرۆسەی نووسینی خۆت ناوناوە هەوڵدان بۆ گەیشتن بە جۆرێک هەستی "داگیربون". دەکرێ پتر ڕوونی بکەیتەوە؟

– نازانم دەمەوێ بگەمە داگیر بوون یا نا، من تەنها هەستئەکەم داگیرکراوم و نووسینەکانم ئەنجامی ئەم هەستەیە، ڕەنگە جۆرێک ڕەوشی پاکردنەوەی دەرون بێت. پێموانییە نووسین یا هەر جۆرە هونەرێک ئەگەر تا سنوورێک "داگیر" کراو نەبوبێت، بتوانێ هێزی حسی پێویست بە دەست بهێنێ.

* من شەیدای شێوەی خاڵبەندی تایبەتی تۆم: دوو خاڵ، سێ خاڵ، نیشانەی پرسیار، ئەو هێڵی مەودایانەی کە وێرگولیان لە دواوە دادەنێیت و هاوشێوەی ئەوانە. ئایا شێوەیەکی تایبەتت لە خاڵبەندی هەیە کە دەبێت فێرخوازەکانتان پەیڕەوی لێبکەن؟
– نا. من فێرخوازەکانم بۆ شێوەیەکی تایبەت لە خاڵبەندی هان نادەم. بەم شێوەیە زیادەڕەویانەی شێواز ئەگەر لە ئارادا بێت، دواتر دەچێتە پیشەی نوسەرەوە. من تێکستی چیرۆک و ڕۆمان دەنووسم کە لە فلتەری "دەنگی"ی کەسێتی تێپەڕیون. کاتێک دەڵێیت خاڵبەندی من شێوەیەکی تایبەتی هەیە، مەبەستتان ئەمەیە کە هەندێک لە کەسێتییەکانی من خۆیان بەشێوەگەلی زۆر تایبەت بەیان دەکەن، وەک کەسێتی شانۆیی. ئەمە نووسینی من نییە، دەنگی من هەمان ئەوەیە کە ئێستا لە تویێ ئەم گفتوگۆیەدا دەیبینی. بەڵام بۆ نموونە کاتێک خەریکی کەسێتییەکی وەک ئیدگار ئالان پۆ بانگ دەکەیت پێویست بە ڕەچاوکردنی نەریتێکی زمانی تایبەت نییە.

* تۆ ساڵانێک مامۆستای ئەدەبیات و نووسەری بوویت، بە درێژی ساڵانی نووسەریتان واتا شتێکی وەک پەنجا ساڵ. جۆناسان زفرن فۆری فێرخوازی پێشووتان لە پرنستۆن و نووسەری گەنج و دیاری ئەمرۆ بە کتێبی"هەموو شتێک ڕوونە" تۆ بە یەکەمین کەسێک دەزانێ کە هانتداوە بە جدی شوێن نووسەری بکەوێت. پێمخۆشە بزانم چ تایبەتمەندیگەلێکت لەودا بینیبوو.

– جۆناسان زفرن فۆر یەکەمین و تاقە فێرخوازی من بوو کە بەتایبەت نامەم بۆ دایکوباوکی نووسی و وتم چ داهاتوویەکی درەوشاوە و ئومێدەوارکەر چاوەڕوانیەتی. بە وردی نازانم هۆکارەکەی چی بوو. من بە درێژایی ئەم ساڵانە فێرخوازی بە توانای تریشم هەبوو. بەڵام هەموو کەسێک دەیتوانی توانا تایبەتییەکانی جۆناسان ببینێ.

* چ بابەتگەلێک یان سەرقاڵییەک بۆتە هۆی ئەوەی تا لە کارەکانی خۆتدا ڕووبکەیتە نمایشی جۆرەها توندوتیژی؟

–من باوەڕم بەم بنەڕەتە هەیە کە ژیان خەماوییە، مێژوو خەماوییە، ئەشێ لە کۆمەڵگەیەکی بەنرخ و پڕ مانادا بژین یا لە خێزانەکەی خۆماندا بە خۆشی بیگوزەرێنین، بەڵام زیادەڕەوی نییە گەر بڵێین مێژووی جیهان شەلاڵی خوێنە و شەڕ لە نێوان مرۆڤەکاندا کۆتایی نییە... لە ڕاستیدا لە نووسینەکانمدا توندوتیژی تاڕادەیەک کەم هەیە و هەرچی هەیە سەرنجدانە لە کۆتایی توندوتیژی و ئەمەی کە چۆن خەڵک، بەتایبەت ژنان و منداڵان هەوڵ دەدەن زیندوو بمێنن و بەهێزتر بن.

* ئایا خوێنەران دەتوانن خودی ڕاستەقینەی تۆ لە توێی چیرۆک و ڕۆمانەکانتدا بدۆزنەوە؟

– هینری جیمس لە ڕستەیەکی ناسراودا وتوێتی تەنها جێگەی دۆزینەوەی خودی نووسەر لە کارەکانیدایە، شتێک کە نووسەر دەکاتە نووسەر کارەکەیەتی، ئەمەیش پرسێکی تەواو زمانییە. چیرۆک و ڕۆمانەکانی من زۆر جۆراوجۆرن، کەسێتییەکانم کۆمەڵێکی بەربلاو لە خەڵک دەگرێتە خۆ، سەختە بتوانی بڵێی من یەکێکم لەوان.

* لە ڕۆمانە نوێکەتاندا بەناوینشانی "خوشکەکەم، ئەوینم: چیرۆکی مەحرەمانەی سکایلەر رمپایک" چاوەڕێی چ شتێک بین؟

– چیرۆکەکە لەبارەی ئەو ئەمریکیانەوەیە کە لە جێگەیەک دەژین کە من ناوی دەنێم "عەسارەی دۆزەخ"، بەتایبەت کچان و کوڕانی خەڵکانی بەدناو.

* یەکەمین کتێبت چلوپێنج ساڵ لەمەوبەر بڵاوبۆوە و تا دوو مانگی دی دەبێتە حەفتا ساڵ. داهاتوو بۆ خۆت چۆن دەبینی؟

– لە ئێستادا لە مردنی مێردەکەم داهێزراوم و ڕۆحیەتم دۆڕاندووە. لە داهاتوودا هیچ نابینم بۆ خۆم، لانیکەم داهاتوویەک کە بتوانێ بەختەوەریم بۆ بهێنێ. زەماوەندی من، عەشقی

من بۆ مێردەکەم، سەرەتا ئەو هاتە ژیانمەوە و پاشان نووسەریم. لە ئێستاشدا نووسەری لەگەڵ مردنی مێردەکەم ڕاکێشەرییەکی نییە بۆم.



http://www.farzanehdoosti.com/translates.
٣١٣=php?lang=fa&id

# ئیسلامی بەجیهانیکراو



## وتوێژ لەگەڵ ئۆلیڤەر ڕوا

**لەئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف**

لە ساڵی ٢٠٠٢ دوای چەندین ساڵ کارکردن لە بواری ئیسلامی سیاسیدا، ئۆلیڤەر ڕوا لێکۆڵەری گەورەی فەرەنسی کتێبێکی نایابی بەناونیشانی ئیسلامی بەجیهانیکراو Globalised Islam بڵاوکردەوە، کە تێڕوانینێکی تەواو جیاوازە لە بواری ئیسلامی سیاسیدا.

بەگوێرەی تەفسیری ئۆلیڤەر ڕوا پرۆژەکانی ئیسلامی هەنووکەیی بەشێوەیەکی بەرچاو دابڕاوە لە هەرێمێکی دیاریکراو و بەشێکە لە دەرئەنجامی شکستی بنیادنانی دەوڵەتی ئیسلامی. ئەمە بەو مانایە دێت کە ئارەزوویەک هەیە بۆ زیاتر و زیاتر هەنگاونان بەرەو بەئیسلامردنی تاکەکان لە سیاقێکی گلۆباڵ و ئوممەیەکی لەکەلتورخراو. بەتێڕوانینی ئۆلیڤەر ڕۆا ئەو بزوتنەوانە لە فۆرمی ڕادیکاڵ و سیاسیدا خۆیان دەردەخەن. ئیسلام لەو ستایەڵانە نییە وەک ئەوەی لە ئاینەکانی

تردا بوونی هەیە خۆی لەبەردەم بەتاکگەرایدا ببینێتەوە. ئیسلام هەمیشە پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ کەلتورێکی دیاریکراودا نەبووە، بەڵگەش بۆ ئەوە گەشەکردن و بوونی ژمارەیەکی زۆری موسوڵمانە لە خۆرئاوا کە پێناسەی خۆیان وەک ئیسلام دەکەن، بەڵام هەرگیزیش پێناسەی خۆیان وەک موسوڵمانی وڵاتەکەی خۆیان ناکەن، نمونە نمونەی ئیسلامبوونی دایک و باوانیان.
ئۆلیڤەر ڕوا لەم چاوپێکەوتنەدا تیشک دەخاتە سەر ئەمانە و هەوڵ دەدات لە تەفسیرەکانی خۆی ئاگادارمان بکاتەوە.

- لە کتێبەکەتاندا "ئیسلامی بەجیهانیکراو" تۆ دەڵێیت سێکولاریزم لە کاتێکدا بوونی هەیە و گەشە دەکات کە هاوشانی ئایین خۆی نوێ دەکاتەوە. دەتوانی بۆمانی ڕوون بکەیتەوە کە ئەم دوو ستایلە جیاوازە چۆن دەتوانن هاوشانی یەکتر کۆ ببنەوە و لەگەڵ یەکتریدا هەڵبکەن؟

* فۆرمی نوێی ئاینداری بەشێوەیەکی فراوان جیاوازە لە کۆمەڵگە و کەلتورە تەقلیدیەکان بەجۆرێک کە جیاوازە لە کۆمەڵگە موسوڵمانەکان و بەتەواوی شێوازێکی نوێیە لە ئاینداری و جیاواز لەو وڵاتە موسوڵمانانەی کە لەسەر بنەمای زاراوەگەلی " ئێوە و ئێمە" دابەشکراون. ئەوان وا خۆیان دەبینن کە دووبارە لەدایکبوونەتەوە و دەیانەوێت هێڵێکی ڕوون لەنێوان کارەکتەری خۆرئاوا و ئەوانەی لە پشتی ئەوانەوەن بکێشن، بەو مانایەی کە باوەڕدارە ڕاستەقینەکان وەک کەمینەیەک خۆیان لەو کۆمەڵگانەدا دەبیننەوە کە بەعەلمانیکراون. کاتێک ئەو کۆمەڵگانە دەیانەوێت بەتەنها ئۆرگانیزەی خۆیان بکەن لە بواری ئاییندا، ئەوا بەشێوەیەکی فراوان دادەبڕێن لە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان و تەنانەت مەسەلە سیاسییەکانیش: ئەوە کۆمەکمان دەکات بۆئەوەی ببینین کە هەردوو سەلەفیزمی سەردەم لە ئیسلامدا و زۆرێک لەو بزوتنەوانەی هەڵگری ئینجیلن لە کریستیاندا هەرگیز گرنگی بە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان نادەن (بەجیاواز لە بزوتنەوە ئیسلامیەکانی وەک ئیخوان لە ساڵی ١٩٤٠ بۆ ١٩٥٠ و حیزبولا لە لوبنان یان بزوتنەوە مەسیحیە "سیۆلۆجیە لیبراڵەکان" لە ساڵی ١٩٦٠ەکاندا). کاتێک ئەوان سەرگەرمی سیاسەت دەبن، ئەوا گرنگی بە مەسەلە یاساییەکان دەدەن( لەباربردن، هاوسەرگیریکردن، شەریعە و زیناکردن... هتد). ئیسلامیستەکان کار لەسەر دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامی دەکەن و فەندامێنتالیزمە نوێیەکانیش کار لەسەر پاککردنەوەی ڕۆحی موسوڵمانەکان دەکەن و وەک تاک مامەڵە دەکەن، ئەمەش بە مەسەلەگەلێکی سیاسی بەشێوەیەکی جیهانی. ئەوان دەیانەوێت بەشێوەیەکی نێونەتەوەیی سیاسەت بکەن، یان تەنانەت بەشێوەی بنەڕەتی لەڕێی ئینتەرنێتەوە هەوڵی دروستکردنی ئوممە دەدەن.

- ئیسلام لە ئێستادا لە فەزای ئاینی وڵاتانی

خۆرئاوادا بوونێکی جێگیری هەیە. تۆ لەوبڕوایەدای کە ئیسلامێکی بەعەلمانێکی کراو کۆمەکی سەرهەڵدانی ئیسلامی ئەمریکی، ئیسلامی ئەوروپی یان هەر جۆرێکی تر دەدات؟

* من لەو بڕوایەدا نیم کە شتێک هەبێت بەناوی ئیسلامی ئەمریکی یان ئەوروپییەوە، بەڵکو ئیسلامێکی جیهانی هەیە کە لە هەر وڵاتێک یان کەلتورێکی دیاریکراودا دەگونجێت بوونی هەبێت، لەبەرئەوەی ئەو ئیسلامە ئایین بنیاد دەنێتەوە نەک لە کەلتوردا، بەڵکو بە زاراوەگەلێک کە دەتوانن لە ژینگە جیاوازەکاندا خۆیان بگونجێنن: بۆنمونە زاراوەی حەلال، کە لە خواردندا بنەمایەکی دیاریکراوی نییە، بەڵکو دەتوانرێت بەتەندروستی بکرێت، لەوانە خواردنی خێرا.
ئیسلامی جیهانی، ئیسلامێکی لەکەلتورخراوە. لە هەندێک پایەدا دەتوانرێت بە ئیسلامی خۆرئاوایی ناوزەد بکرێت، نەک لە ڕوئیایەکدا کە ببێت بە زیاد لە لیبراڵ، بەڵکو بەشێوەیەکی فراوان ئەوان پشت بە تاکەکان دەبەستن کە بەشێوەیەکی خۆبەخش پەیوەندی بە باوەڕدارەکانی کۆمەڵگەوە دەکەن. زاراوەی زیاد لەپێویست religiosity لە پاڵ زاراوەگەلی (دوبارە لەدایکبوون، جەغتکردنەوە لە ڕزگاربوون، باوەڕی کۆمەڵگە، بەها ئەخلاقییەکان، دژە ڕۆشنگەری، واقیعی تاکەکەسی) زاراوەگەلی تەواو مۆدێرنن و لە زۆرێک لە زاراوە کریستیانەکان دەچن لە بزوتنەوەی هەستی ئاینیداrevivalism ، بەڵام گرنگی بە ڕیفۆرمکردنی سۆسیۆلۆجی نادەن. بۆ نمونە سەرکەوتنی سەلەفیزم لەنێو نەوەی دووەمی موسوڵمانان لە خۆرئاوا، لەبەرئەوەی بەها دەبەخشێ بە لەکەلتورخستن و لەڕیشە هەڵکێشان بە ڕەتکردنەوەی ناسنامەی ئیسلام بە کەلتوری پوختی دایکان و باوانیان، ئەمەش ڕێگەیان دەدات کە بەخۆرئاوایی بکرێن، تەنانەت گەر بەهۆی ڕەتکردنەوەشەوە بێت.

– لە پلەیەکی تایبەتدا، ئەو دەرئەنجامە پراکتیکیانە کامانەن کە حکومەتە خۆرئاواییەکان بەشێوەیەکی گونجاو دەبێت بیگرنەبەر بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئیسلام؟

* حکومەتەکانی خۆرئاوا پێویستە پشتیوانی لەم پرۆسەی بەخۆرئاوایکردن بکەن، بێئەوەی پێویست بکات هەوڵی ئیسلامیەکی لیبراڵ، مۆدێرن، یان سیڤیڵ بدەن. ئەوان پێویستە خۆ لە هەر هەوڵێک بۆ بنیادنانەوەی ئاین بپارێزن، بەڵکو دەبێت هەوڵی تێکەڵکردنی ئاینی ئیسلام بدەن بە دروستکردنی ژورێک بۆ ئیسلام و لەگەڵ ئاینەکانی تردا بەشێوەیەکی یەکسان مامەڵەی لەگەڵ بکرێت. لەڕاستیدا ڕێکخستنەوەی ئیسلام پێویست ناکات بلکێندرێت بە مەسەلەی کۆچپێکردن و فرە کەلتورگەراییەوە. ئیسلام پێویستە تەنها وەک ئاینێک مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، نەک وەک ئەو دەربڕینەی کە ئیسلام وەک گروپگەلێکی کەمینەی ڕەگەزی دەبینێت.

– لە کتێبەکەتدا زیاد لەجارێک باس لە ڕۆڵی

ئینتەرنێت کراوە، لەو چاپتەرەی کە سەرباسی کتێبەکەیە. ئینتەرنێت بەڕوونی وا دەبینرێت کە یارمەتیدەرە بۆ ئەو گەشەکردنانەی کە تۆ ڕاڤەیان دەکەیت.

* ئینتەرنێت ئامێرێکی پێرفێکتە بۆ خولقاندنی فەزایەک بۆ نزیککردنەوەی باوەڕدارانی کۆمەڵگە و دژ بە دەرگا داخستنی کەلتور یان دەوڵەتێکی دیاریکراو. سایتەکان جا عەرەبی بن یاخود ئینگلیزی، لینکەکانی دەربڕینی بیریارانی سەردەم لەخۆ دەگرێت (زۆرێک لەوان سەلەفیەکانن)، بەڵام هەرکەسێک ئازادە لەوەی چی دەخوێنێتەوە یاخود ئارەزووی کۆتەیشنی کێ دەکات یان بەمانایەکی تر دواکەوتەی چ بیروباوەڕێک دەبێت.

زیاد لەوەش، ئینتەرنێت ڕێگە بە تاک دەدات بەیەکسانی قسە لەگەڵ ئەویتردا بکات. لە ئینتەرنێتدا مەعریفەیەکی یەکبەدوایەکی هەڕەمی بوونی نییە. هەروەها ئینتەرنێت ڕێگەخۆشکەرە بۆ کردنەوەی پەنجەرەیەک بۆ دامەزراوەکان: بۆ نمونە، هەندێک لە وێبسایتەکان فەتوا ئامادە دەکەن بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێت، بەڵام لە پێناسەکەیدا ئەگەری جێبەجێنەکردنی فەتواکەش لەئارادایە، لە ئینتەرنێتدا مارکێتێکی خۆڕایی ئاین هەیە، کە تێیدا کەسێک توانای مارکێتی هەیە بۆ چەندین بەرهەمی جیاواز، لە فەتواوە بۆ بەرنامەی خواردن دروستکردن یان ئامۆژگاری هاوسەرگیری، ئەمەش لە ڕوومی تەنها کەسێکدا.

– دەقە ئەسڵیەکەی کتێبەکەت بە زمانی فەرەنسی دوو ساڵ پێش ئیستا بڵاوکرایەوە. هێشتا کتێبەکەت بە ئینگلیزی وەرنەگێڕدرابوو، چەندین ڕاپۆرتی لەسەر نووسرا، لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا چ گۆڕانێکت هەست پێکرد؟ ئایا گەشەکردنەکان بۆچوونەکانی سەرەتای تۆیان نەگۆڕی، یاخود هەندێ لە بۆچوونەکانت هەست ناکەیت پێویستی بە تەفسیری زیاترە؟

– چالاکیە تیرۆرستیەکانی ئەم دواییە سەلماندی کە من چیم وت لەبارەی لەهەرێمخستن و بەخۆرئاواییکردنی ئیسلامیە ڕادیکاڵەکان، بەڵام من ڕونکردنەوەی زیاترم خستە سەر کتێبەکەم، ئەمەش لەپێناوی وروژاندنی باسگەلی تر.
هەروەها من سەبارەت بە ئیسلام لە ئەمریکاش قسەی خۆم هەیە، کە لەوێ موسوڵمانان لەگەڵ موسوڵمانانی ئەوروپا هەمان باکگراوندی کۆمەڵایەتیان نیە، بەراوردێکم کردووە لەنێوان فەندامێنتالیزمی ئیسلامی و فۆرمە جیاوازەکانی فەندامێنتالیزمی مەسیحی. بێگومان فاکتەری نوێ ئەوەیە کە چونی ئەمریکا بۆ عێراق ئەوەی نیشاندا کە شکستی پەیوەندی نێوان قەیرانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و بەجیهانیبوونی ئیسلام لەلایەن فاکتەرەکانی سیاسەتی خۆرئاواوە پشتیوانی نەکرا، ئێستاش وا دەردەکەوێت کە ڕەگ و ڕیشەی ئیسلامیە ڕادیکاڵەکان سەرچاوەکەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بێت. بەڵام ئەی لە عێراق چی دەگوزەرێت کە وا ڕادەگەیەنرێت ئیسلام فاکتەرێکی سەرەکی نییە لە سیاسەت لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا:

ئیسلامیست و سێکولاریستەکان شەڕی یەکتر ناکەن بەڵکو پەیوەندیکردنی هێزەکان لە هاوپەیمانیەکدا دەبینرێت کە مەبەستی سەرەکی ئارەزوویەکی ناسیۆنالستیانە هەیە، ئەمەش لە کەرتی غەزەوە بۆ فەلوجە لە عێراق. لەلایەکی ترەوە، ئەلقاعیدە، بزوتنەوەیەکی سوپەرناشناڵە supra-national کە یەکەم ئامانجیان ئەمریکایە، نەک ڕژێمە موسوڵمانە لۆکاڵییەکان. وە هەروەها من بەراوردێکی گشتگیرم کردووە لەنێوان فۆرمە جیاوازەکانی بزوتنەوەی هەستی ئاینی.

**سەرچاوە گۆڤاری**
Religioscope
٨ Nov ٢٠٠٤



# سەمیح قاسم...
# مەرگی دواهەمین تارژەنی شیعری فەلەستینی

**ئامادەکردنی: سەردەم**

دواجار مەرگ هات و گیانی ئەم شاعیرە فەلەستینییە بوێرەی بردەوە، مەرگ هات و پیاوێکی لەگەڵ خۆی برد کە پڕ بوو لە شیعر و هەڵوێست و بەرگری، پیاوێک هەم شیعر و هەم فەلەستین، دوو خەسڵەتی هەرە سەرەکی ژیانی بوون. ئاخۆ ئەم شاعیرە لە شیعرەکانیدا چەند جار باسی لە مەرگ کردبێت و باسی لە نزیکی مەرگ لە خۆی و لە خاکەکەی و لە کەسوکارەکەی کردبێت؟ ئەی دەبێ چەند جار باسی لە مەرگی ئازیزێکی کردبێت، ئازیزێک کە پێش چەند خولەکێکی کەم پێکەوەبوون و پاش جیابوونەوەیان، ئازیزەکەی بەر تەقینەوەیەک یان کارێکی تیرۆرستی کەوتبێت.

ڕەنگە ئەم شاعیرە، زۆرجار خەیاڵی بۆ ئەوە چوبێت کە کۆتایی ژیانی لەژێر داروپەردوی تەقینەوەیەکدا دەبێت، وەک ژیانی سەرلەبەری نیشتیمانەکەی کە ڕۆژانە بەشێکی وێران دەکرێت و گەڕەک و کۆڵان و شەقام و باڵەخانەیەکی خاپور دەکرێت و کەسیش تەرمەکەی ناناسێتەوە، چونکە ئەوەی لێی بەجێدەمێنێت، چەند کوتە گۆشتێکی خوێناوییە کە بەو ناوەدا بڵاوبووەتەوە. ئەم شاعیرە دەیزانی، تانک و زرێپۆشەکانی دوژمن، حەزیان لە جەستەی شیعر و شاعیرەکانە، دەیزانی ئەفسەر و سەربازە ئیسرائیلییەکان، لەبەردەم دەروازەی شار و شارۆچکە و خێوەتگاکاندا، پێش ئەوەی بە دوای چەک و چۆڵ و پێناسی شارستانیدا بگەڕێن، بە دوای شیعر و دیوانە شیعرەکاندا دەگەڕان، تا دەستیان بەسەردا بگرن و لەناویان بەرن. بە مردنی سەمیح قاسم، کۆتایی بە قۆناغێکی شیعری دێت کە لە مێژووی ئەدەبی عەرەبیدا، بە یەکێک لە گرنگترین قۆناغەکانی شیعری عەرەبی دادەنرێت. سەمیح قاسم یەکێکە لەو شاعیرە عەرەب و فەلەستینییە هاوچەرخانەی، ناوی پەیوەستە بە شیعری شۆڕش و بەرگری، لە ناوەوەی خاکی فەلەستین، لە ساڵی 1948 تا ساتەوەختی مردنی.

ئەم سمبولی بەرگرییە، ساڵی 1939، واتە نۆ ساڵ پێش ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئیسرائیل، لە خێزانێکی دروزی فەلەستینی لە شاری (زەرقا) ی ئەردەنی لەدایک دەبێت. لە قوتابخانەی گوندەکانی "الرامە و الناصرە" خوێندویەتی، پاشان لە یەکێک لە قوتابخانەکان کاری کردووە، دواتر دەست دەکات بە چالاکی کاری سیاسی و پەیوەندی بە حیزبی شوعییەوە دەکات، پاش ماوەیەک واز لە حیزب دێنێت و خۆی بۆ کاری ئەدەبی تەرخان دەکات. باوکی لە هێزی سەر سنوری ڕۆژهەڵاتی ئەردەن، ئەفسەر دەبێت بە پلەی (کاپتن)، لەو سەردەمەدا ئەفسەرەکان لەگەڵ خێزانەکانیان لەوێدا نیشتەجێ بوون. سەروەختێک لە گەرمەی جەنگی دووەمی جیهانیدا، ئەم خێزانە بە شەمەندەفەر، لە ڕێگای گەڕانەوەدا دەبن لە ئەردەنەوە بۆ فەلەستین، سەمیح قاسم کە هێشتا منداڵێکی ساوایە، لە ناو فارگۆنی شەمەندەفەرەکەدا، دەداتە پرمەی گریان، سەرنشینانی شەمەندەفەرەکە ترس دایاندەگرێت، لەوە دەترسن فڕۆکەکانی ئەڵمان پێیان بزانن و بۆردومانیان بکەن. ئەوان هێند ترسابوون کار دەگاتە ئەوەی هەڕەشەی کوشتن لەو منداڵە دەکەن کە دەگری و ژێر نابێتەوە. ئەم هەڕەشەیە باوکی سەمیح ناچار دەکات شمشێرەکەی لە کێلان بێنێتە دەرەوە و بە ڕویاندا ڕایکێشێت، تا بەرەنگاریان ببێتەوە. دواتر کاتێ ئەم بەسەرهاتە بۆ سەمیح قاسم دەگێڕنەوە، کاریگەرییەکی قووڵ لەسەر دەرونی جێدەهێڵێت و دەڵێ: (باشە، هەر لە منداڵییەوە هەوڵیان داوە بێدەنگم بکەن، پیشانیان دەدەم، کەی بمەوێ و لە چ کاتێکدا حەز بکەم، بە دەنگی بەرز قسە دەکەم و هیچ کەسێکیش ناتوانێ بێ دەنگم بکات). سەمیح قاسم بەهۆی چالاکییە شیعری و سیاسییەکانیی و بەهۆی هەڵوێستە نیشتیمانی و نەتەوەییەکانییەوە،

زیاد لە جارێک زیندانی کراوە و لە ماڵەکەی خۆیدا دەست بەسەر بووە و چەند جارێک لەسەر کارەکەی دەرکراوە و زیاد لە جارێک چ لە ناوەوەی وڵاتەکەی و چ لە دەرەوەیدا، ڕووبەڕووی هەڕەشەی کوشتن بووەتەوە. کاری مامۆستایەتی و کرێکاری لە کەنداوی حەیفا و ڕۆژنامەنووسی کردووە. تەمەنی تەنها سی ساڵ بوو، شەش دیوانی شیعری بڵاوکردوەتەوە. جگە لە شیعر ژمارەیەک ڕۆمانیشی نووسیوە. یەکێک لە بایەخدانە گرنگەکانی دروستکردنی شانۆیەکی فەلەستینی بوو، شانۆیەک هەڵگری پەیامێکی هونەری و کەلتوری بەرز بێت، لە هەمان کاتدا هەڵگری پەیامێکی سیاسی بێت و پەیوەست بە کێشەی فەلەستینەوە، بتوانێ کاریگەری لەسەر ڕای گشتی جیهانیی هەبێت.

بەشداربووە لە دەرکردنی چەندین گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوە، لەوانە (الغد)، (الاتحاد)، پاشان ساڵی 1966 دەبێتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (هذا العام)، دواتر دەبێتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (الجدید). جگە لەوانە دامەزرێنەری ڕۆژنامەی (کل العرب) بووە و پاشان دەبێتە سەرۆکی فەخری ئەو ڕۆژنامەیە. لە ساتەوەختی دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی عەرەب و یەکێتی نووسەرانی فەلەستینی لە فەلەستین، سەرۆکی هەردوو یەکێتییەکە بووە. سەمیح قاسم لە بوارەکانی شیعر و چیرۆک و ڕۆمان و شانۆنامە و وتار و وەرگێڕان، خاوەنی نزیکەی 80 کتێبە. بەشێکی زۆری شیعرەکانی وەرگێڕراونەتە سەر زۆربەی هەرە زۆری زمانە زیندووەکانی جیهان، لەوانە زمانەکانی



ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەمریکی و تورکی و ڕووسی و ئەڵمانی و یابانی و ئیسپانی و یۆنانی و ئیتالی و چیکی و ڤیێتنامی و فارسی و عیبری و زمانەکانی دیکە. کۆی بەرهەمەکانی لە حەوت بەرگی گەورەدا کۆکراونەتەوە و چاپکراون. ئەم شاعیرە ئازا و بوێرە، لەلایەن ڕەخنەگران و نووسەرانی عەرەبەوە، گەلێک نازناوی پێ بەخشراوە کە هەر هەموویان گوزارشت لە ئازایەتی و چاونەترسی ئەم شاعیرە دەکەن. لەوانە نازناوی (شاعیری بەرگری فەلەستینی، شاعیری نەتەوەیی عەرەب، شاعیری عیملاق، شاعیری تورەبوونی شۆڕشگێڕانە، شاعیری هەڵوێستە دراماییەکان، شاعیری ململانێکان، تارژەنی فەلەستین، موتەنەبی فەلەستین، شاعیری گەورەی عەرەب، شاعیری عروبە بێ ڕکابەر و بێ مشتومڕ و چەندوچوون، شاعیری پیرۆز، شاعیری داهێنەر کە هەمیشە تازە دەبێتەوە و بەردەوام لەگەشەکردندایە، ئەو پیاوەی خەیاڵدانێکی بەهێزی هەیە و زەحمەتە خەیاڵدانی لەو شێوەیە لای شاعیرەکانی دیکە بدۆزینەوە، سترانبێژی ڕەبابە و شاعیری خۆر). یەکێک لە پرۆژە ئەدەبییە جوان و گرنگەکانی دیکەی ئەم شاعیرە، بریتییە لە ئاڵوگۆڕکردنی ژمارەیەی زۆر نامە، لەگەڵ هاوڕێی شاعیر و ڕێگای خەبات و ژیانی "مەحمود دەرویش" کە چەند ساڵێک لەمەوبەر کۆچی دوایی کرد. ئەو نامانە بە یەکێک لە جوانترین پرۆژە ئەدەبییەکانی نێوان ئەو دوو شاعیرە دادەنرێت. سەمیح قاسم لە کاروانی ئەدەبی خۆیدا، گەلێک خەڵات و بڕوانامەی ڕێزلێنانی بەدەستهێناوە و زۆرجار بووەتە ئەندامی شەرەف لە زۆرێک لە سەنتەرە ئەدەبی و ئینستوتەکان. لە ئیسپانیا خەڵاتی (غار الشعر)ی وەرگرتووە، لە فەرەنسا دوو خەڵاتی لەسەر بڕێک لەو شیعرانەی کە کرابوون بە فەرەنسی وەرگرتووە. دووجار خەڵاتی (مەدالیای قودس بۆ کەلتوور) لە سەرۆکی کۆچکردوی فەلەستین "یاسر عەرەفات" وەرگرتووە. لە میسر خەڵاتی "نەجیب مەحفوز"ی وەرگرتووە. لە جیهانی عەرەبی و جیهانی دەرەوەشدا، گەلێک کتێب و توێژینەوەی ڕەخنەگرانە، لەسەر بەرهەمەکانی سەمیح قاسم بڵاوکراونەتەوە و تێیدا ئاماژەیان بە دیوانە شیعرییەکانی و بەسەرهاتی ژیانی و داهێنانە تایبەت و جیاوازەکانی، لە شێواز و ناوەرۆکدا، کردووە. هەر ئەمەش وایکردووە کۆمەڵێ نازناوی جۆراوجۆر بەدەست بێنێت کە لەسەرەوە ئاماژەمان بە هەندێکیان داوە و هیچ نووسەرێکی دیکە بەدەستی نەهێناوە.

سەمیح قاسم دوای ململانێیەکی زۆر لەگەڵ نەخۆشی شێرپەنجەی جگەر کە نزیکەی سێ ساڵ بوو بە دەستییەوە دەیناڵاند، لە تەمەنی سەرو 75 ساڵی و لە نەخۆشخانەی (صفد) لە باکوری ئیسرائیل کۆچی دوایی کرد. بە مەرگی پەردە لە ڕووی دواهەمین شاعیری بەرگری دادەدرێتەوە و فەلەستین و دونیای زوڵم لێکراوەکان، لە چاوەڕوانی هاتنی شاعیرێکی دیکەی وەک ئەمدا، بە هەتیوی دەمێننەوە.

# جیهادییەکانی ئەمڕۆ
# لە جیهادییەکانی دوێنێ دەچن...
# خەونەکانیان مۆتەکەیە.

مستەفا کرکوتی
**لە عەرەبییەوە: سەردەم**

ئەوەی چییە وا دەکات پیاوێک لە بەریتانیا هاتووەتە دونیاوە و تێیدا گەورە بووە، لە پەنجاکانی تەمەنیدایە و باوکی سێ منداڵە و لە دایک و باوکێکی پاکستانییە کە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە کۆچیان کردووە بۆ بەریتانیا، شاحینەیەکی بۆمبڕێژکراو لێخوڕێت و لە کارێکی تیرۆرستیدا و لەبەردەم دەرگای زیندانێکی سەرەکی سوریا خۆی بتەقێنێتەوە؟ ئەمە ئەو کارە بوو کە "عەبدالوحید مجید" پێیهەستا، ئەم پیاوە "10"هەمین بەریتانییە کە تا ئێستا لە کێڵگەکانی کوشتنی سوریادا دەکوژرێت، ئەو لە بەرواری 6 شوباتی ڕابردوو، لەبەردەم دەرگای سەرەکی زیندانی حەلەبدا خۆی دەتەقێنێتەوە، مەجید کە ناوە جیهادییەکەی "ئەبو سلێمانی بەریتانی"بوو، پێش ئەم مەرگە تراژیدییەی، کەسێکی تا بڵێی خاکی و سادە و ساکار بووە، لە وەکالەتی قیرکردنی ڕێگاوبانەکان ئەندازیار بووە و لە گەڕەکێکی هێمنی دەوروبەری (کراولی) کە دەکەوێتە خۆرئاوای ناوچەی (ساسیکس)وە ژیاوە و گەڕەکەکە ناوی (شەقامی شەهیدان) بووە، ئەم ناوچەیە بە باخچە

دەوڵەمەندەکانی و درەختە پڕ سێبەرەکانی و ژینگە بێوەی و سەلامەتەکەی ناسراوە. ئەبو سلێمان کاتێ لە ڕێگەی کارێکی خێرخوازی و بۆ بەهاناچوونی ئاوارە سورییەکان دەگاتە باکوری سوریا، پەیوەندی بە ڕێخراوی (بەرەی نوسرە)وە دەکات.
ئەم حاڵەتە لەیەککاتدا، چەندین پرسیاری سەرسوڕهێنەر دەخاتە بەردەمی حکومەت و کۆمەڵگای بەریتانی و ئەوانی دیکەش. کوشتنی مجید ئەو ترس و دڵەڕاوکەیەی زیاتر کرد کە ڕۆژانە لەبەرامبەر ئەم کێشەیەدا، تابێت کەڵەکەدەبێت و زیاتر دەبێت. نەک بە تەنها لە بەریتانیا، بەڵکو لە کۆمەڵگاکانی دیکەی ئەوروپاشدا. نزیکەی نیو سەدەیە، بۆ یەکەمجارە ئەوروپا بەشێوەیەکی سەرەکی ڕووبەڕووی کۆمەڵێ هەڕەشەی تیرۆرستی ئاڵۆز دەبێتەوە. کاتێ مرۆڤ گوێبیستی ئەوە دەبێت کە لە فرۆکەخانەی (هێسرۆ) دوو گەنجی مێرد منداڵی تەمەن حەڤدە ساڵ، دەستگیر دەکرێن و بڕێکی زۆر پارەیان پێیە و بەنیاز بوون ئەو برە پارە زۆرە لە ڕێگەی تورکیاوە، بگەیەننە دەست جیهادییەکانی سوریا، ئەوا لەسەر ئەو حاڵەتە هەڵوەستەیەک دەکات کە لە کۆمەڵگا ئەوروپییەکاندا ترس و دڵەڕاوکێیەکی بێ سنوری بڵاوکردووەتەوە.
لێرەوە ناوەندەکانی توێژینەوە لە لەندەن و پاریس و برۆکسل و پایتەختەکانی دیکەی ئەوروپا، ئەو ناوەندانەی تایبەتمەندن بە کاروباری تیرۆر، بە قووڵی دەستیان کردووە بە توێژینەوە و گرنگییەکی زۆر بە وردەکاری چالاکییە تیرۆرستییەکانی ئەوروپا دەدەن، ئەو چالاکییە با زۆر بچوک و کەم بایەخیش بێت، وەک ئەو ڕووداوەی فرۆکەخانەی هێسرۆ. ئەو توێژینەوانە پێیان وایە ئەو ڕووداوە، تەنها داوێکی بچوکە لە تۆڕێکی گەورەی پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی نێو کیشوەرەکان. لە نیوەی دووەمی ساڵی 2013وە، ژمارەی جیهادییەکان لە سوریا زۆر زیادی کردووە، ئەمەش لە ئەنجامی پەیوەندیکردنی جیهادییە ئەوروپییەکانەوەیە بە کێڵگەی کوشتن لە سوریا.
لە ئێستادا قسە لەسەر ئەوە دەکرێ نزیکەی 8000 جیهادی لە سوریا هەیە، نزیکەی 2000 هەزاریان لە خۆرئاوای ئەوروپاوە هاتوون، بە تایبەتی فەرەنسا و بەریتانیا و ئەڵمانیا و بەلجیکا و هۆڵەندە. ژمارەیەکی دیکە لە دانیمارک و نەرویجەوە هاتوون، بەڵام بە ڕێژەیەکی کەمتر. بەرپرسانی لەندەن، لەو بڕوایەدان 200 لە هاوڵاتییەکانیان لە نێو جیهادییەکاندان. ئەمە لە کاتێکدایە سەرۆکی فەرەنسا "فرانسوا هۆلاند" پێیوایە جیهادییەکانی وڵاتەکەی لە سوریا، دەگەنە نزیکەی 700 کەس. بەشی هەرە زۆری جیهادییەکانی ئەوروپا، لە هەرزەکارەکانن و مەرج نییە زۆرینەیان ڕەچەڵەکێکی ئیسلامی پاکستانی یان باکوری ئەفریقایان هەبێت. بگرە لە نێویاندا خەڵکانێک هەیە هاتوونەتە سەر ئاینی ئیسلام. لەگەڵ ئەوەشدا هەموان لە ڕێگایاندا بەرەو سوریا، یەک ئامانجی ترسناک کۆیان دەکاتەوە، ئەویش بریتییە لە (شەهیدبوون- الشهادە).
ترسی گەورەی ئەوروپا لە بەرزبوونەوە

و زیادبوونی ژمارەی ئەو گەنجە جیهادییە ئەروپپیانەدا نییە کە دەڕۆن بۆ سوریا، بەڵکو ترسیان لەوانەیە کە دوای تێپەڕینی چەندین مانگ لە کێڵگەکانی کوشتندا، لە سوریاوە دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانیان و کۆمەڵگاکانیان و نێو خێزانەکانیان. ئەگەری بەشداریکردنی ئەوانە لە کارە تیرۆرستییەکاندا، نە بە دوور دەگیرێت و لە کاتی ڕوودانیشیدا سەیر نابێت. ئەمەش مانای ئەوەیە هەموو ئەوانەی لە ئەوروپا، پێیان وایە وڵاتەکەیان دوورە لە کاریگەری قەیرانی سوریاوە، پێویستە لەسەریان بە زوترین کات بەو مەسەلەیەدا بچنەوە. بەم دواییانە ئەو فیلمەی لەسەر تۆڕی کۆمەڵایەتی (یو-توب)، پیشاندرا، تێیدا هەرزەکارێکی بەلجیکی کە پێش چەند مانگێک بووە بە ئیسلام و ناوی "براین دی مولدر"ە، لە یەکێک لە چادرگە جیهادییە تیرۆرستییەکانی سوریادا دەردەکەوێت و باس لەو (دەستکەوتانە) دەکات کە لە ژیانە تازەکەیدا بەدەستیهێناوە و باس لە چۆنیەتی گواستنەوەی ئەم ئەزمونە دەکات بۆ وڵاتەکەی.

هاتنی ئەو گەنجانە لە ئەوروپاوە بۆ نێو کێڵگەکانی کوشتن و تیرۆر لە سوریا، ئەوە بە بیر هەندێکماندا دێنێتەوە کە لە زەمەنێکی دیکەدا، جۆرێکی دیکەی لە هاتن بینیوە کە زۆر نامۆ نییە بەم هاتنەی ئێستا، ئەویش بریتییە لە هاتنی ئەوروپییەکان بەرەو ناوچەکەمان، لە کۆتایی ساڵانی شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا. لەو سەردەمەدا، هاتنی ئەو ئەوروپیانە بەرەو ئەردەن یان لوبنان یان سوریە و بە پلەیەکی کەمتر بەرەو عێراق بوو. هاتنی ئەوروپی و خۆرئاوایی لە ئیتاڵیا و فەرەنسا و یابان و ئەڵمانیای خۆرئاوا (ئەڵمانیای خۆرئاوا ناولێنانی سەردەمی شەڕی ساردە)، بەرەو ناوچە قەیراناوییەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، لە ڕووی بەهاوە، کەمەکێک جیاوازتر بوو، بەڵام لە ڕووی ئامانجی جیهادییەکانی ئەم سەردەمە و خەون و ئاواتەکانیان، هیچ جیاوازییەکی ئەو تۆیان نییە. بەشی هەرە زۆری ئەوانەی ئەو سەردەمە، لەو کەسانە بوون کە لە ڕێخراوە کۆمۆنیستی و چەپەکان-یان، یاخی ببوون. ئەوانیش لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانیان، ناوەڕۆکی شێوازی توندڕەوی جیهادی-یان بەکاردەهێنا. ئەوان سەر بەو ڕێخراوە نهێنییانە بوون کە سەرچاوەی دروستبوون و گەشەکردنیان نادیار و ئاڵۆز بوو. بەڵام ڕێخراوگەلێکی تێکدەربوون، لە نموونەی (کەتیبە سورەکان)ی ئیتاڵیا، (سوپای سور) لە یابان، (مقاوەمەی چەکداریی شۆڕشی پرۆلیتاریا) لە ئەڵمانیای خۆرئاوا کە بە ناوی دامەزرێنەری ڕێخراوەکەوە (بادر- ماینهوف)ەوە بەناوبانگ بوو.

هەر هەموو ئەوانە، لە چوارچێوەی ئەوەی پێیدەوترا (هاریکاری شۆڕشگێڕانە دژ بە ئیمپریالیزمی جیهانی) و لە خێوەتگەی مەشق و ڕاهێنانی سەر بە ئەندامانی ڕێخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی، ببون بە میوان. لە نێویاندا هەردوو ڕێخراوی (بەرەی گەل و دیموکراسی بۆ ڕزگارکردنی فەلەستین و بزوتنەوەی فەتح). یان "بادر- ماینهۆف و ئەندریاس بادر" کە ساڵی 1970 بۆ خۆیان

ڕێخستنێکیان بە ناوی (بزوتنەوەی کۆمۆنیستی دژ بە ئیمپریالیزم بۆ ئەنجامدانی جەنگی دەستەویەخە لە شارەکان) ڕاگەیاند، ئەم بزوتنەوەیە چەندین کاری تیرۆرستی و دزی و هەڵکوتانە سەر بانک-یان ئەنجامدا، ئەمە پێش ئەوەی دەستگیر بکرێن و فرمانی زیندانی کردنیان بۆ دەربکرێت. ئەو دوانە، ساڵی 1977 لە زیندان خۆیان کوشت.
جگە لەوانە، "فۆساکۆ شیگۆنوبۆ"ی یابانی هەیە کە لە سەرەتای ساڵی 1971 و بە هاوکاری ڕاستەوخۆی ڕێخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی، سوپای سور-ی یابانی دامەزراند، ئەو ڕێخراوە توانی لە ناوچەکەو لە یابان، کۆمەڵێ کاری تیرۆرستی ئەنجام بدات. لە بەناوبانگترین ئەو کارە تیرۆرستیانەی ئەنجامیان دا، هێرشەکەی ساڵی 1972 ی سەر فڕۆکەخانەی ئەللد بوو کە ئێستا پێیدەوترێت فڕۆکەخانەی (گۆریۆن). جگە لەوانە (کەتیبەی سور)ی ئیتاڵی هەبوو کە لە میانەی کارە تیرۆرستییە بوێرەکانییەوە، ناوێکی گەورەی بۆ خۆی پەیدا کرد، دواهەمین کاریان بریتی بوو لە فڕاندنی سەرۆک وەزیرانی پێشوی ئیتاڵیا "ئەلدۆ مۆرۆ"، ئەوان ئەم سەرۆک وەزیرانەیان بۆ ماوەیەکی زۆر لە پشتەوەی ئۆتۆمۆبێلێکدا دانابوو، تا دواتر لە ساڵی 1978 کوشتیان. ئەم ڕێخراوە لە مێژووە دوور و درێژە خوێناوییەکەیدا، نزیکەی 1400 کاری توندوتیژی بە قەبارەی جیاواز جیاواز ئەنجامداوە، لە نێویاندا دزی و هەڵکوتانە سەر بانکەکان. تیرۆریستانی (جەنگی سارد) لە سەدەی بیستەمدا، جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ تیرۆرستانی ئەم سەردەمەدا نییە: خەونەکانیان مۆتەکەن.

---

**سەرچاوە: موقع الاوان. ٣ نیسان. ٢٠١٤**

# نەتەوەیەک ناخوێنێتەوە

صلاح بو یوسف
**لە عەرەبییەوە: باوکی پایان**

(وای لەو نەتەوەیەی، نەتەوەکانی دیکە بە دواکەوتنەکەی پێدەکەنن. موتەنەبی)
(ئەوە بەس نییە بە خەڵکی بڵێی بخۆن، تا بخۆن و خۆیان لە مەترسی برسییەتی ڕزگار بکەن. ئەوە بەس نییە بە خەڵکی بڵێی بخوێنن، تا بخوێنن و خۆیان لە مەترسی دواکەوتویی ڕزگار بکەن. بەڵکو پێویستە بە قەد ژمارەی برسییەکان خۆراک و بە قەد ژمارەی نەخوێندەوارەکان زانست، ئامادە بکرێت. گەر وامان نەکرد، ئەوا بانگەشەمان بۆ خواردن و بۆ خوێندن، وەک مەسەلەکەی "جوحا"ی لێدێت، کاتێ ویستی نۆزدە مراوی بە یەکسانی بەسەر بیست پیاودا دابەش بکات. تەها حسێن).
ڕەنگە یەکێک لەو قەیرانە هەرە گەورانەی ڕووی تێکردوین و بووینەتە نێچیری و چەندین دەرئەنجامی

مەترسیداری لێدەکەوێتەوە، ئەوەیە ئێمە نەتەوەیەکین ناخوێنینەوە. ئەوەی ئەم قەیرانەی لەسەر ئێمە، قورستر و سەختتر کردووە، ئەوەیە ئێمە تەنانەت بەدەم قورئان-یشەوە نەچووین کە لەمڕۆدا بووەتە مەهانە بەدەست زۆر کەسەوە بۆ پاساوی کوشتن و نەزانین و پاشەکشەکردن. هەموو ئەوانەی بڕوایان بە پەیامی (بخوێنە)، هێناوە، نەیانتوانیوە وەک پێویست سودی لێوەربگرن. کردەی خوێندنەوە، تەنها بۆ خوێندنەوەی قورئان کورت نابێتەوە، یان تەنها خوێندنەوەی کتێبەکانی پەرستن یان ئەو کتێبانەی پەیوەندییان بە کاروباری ئاینییەوە هەیە، بەس نییە. ئەم مەسەلانە دەچنە نێو سیاقی پەیوەندی بە یەزدانەوە، یان لە جەوهەردا دەچێتە نێو سیاقی پەیوەندی نێوان مرۆڤ بە مرۆڤەوە یان پەیوەندی نێوان مرۆڤ بە گەردوونەوە یان بە وجودەوە.

تێگەشتن لە قورئان و لەو نهێنییانەی لەخۆیدەگرێت، بەلای ئەوانەی بڕوایان پێیهێناوە و قەناعەتیان پێکردووە، بەسە بۆ ئەوەی لە مانای پەیامەکەی تێبگەن، بەسە بۆ ئەوەی لە ناوەرۆکی قورئان تێبگەن بێ ئەوەی زیادەڕۆیی لە شیکردنەوە و لێکدانەوەکاندا بکەن. یان بێ ئەوەی بوون لەبەرامبەر عەدەمدا بترسێنن، بە ڕادەیەک بوون بترسێنن کە تێیدا (ژیانی سەر زەوی) خراپەیەکە یان گۆڕێکە هیچ مانایەکی بۆ ژیان تێدا نییە. بوونی مرۆڤ لە ژیاندا، بوونێکی بێ بەها و بێ سودە.

گەر بخوێنینەوە، مانای وایە بەسەر هەموو زانست و مەعریفەکاندا بکرێینەوە و وا بکەین عەقڵ ببێتە (ڕابەر) وەک ئەوەی (معەری) وتویەتی. ئەوە کارێکی هەروا بێ هودە نەبووە کە موسڵمانەکان، لەسەردەمانی ڕابردودا، بایەخیان بە زانست داوە، قوتابخانە و زانکۆیان دروست کردووە، کتێبخانەیان دامەزراندووە، لەسەردەمی (هارونە ڕەشید) دا کاغەزیان هێناوە و لە بەغداد دروستیان کردووە، گرنیگیان بە کۆکردنەوەی کتێب و دەستنووسەکان داوە، بایەخیان بە وەرگێڕانی فیکری فەیلەسوفە گەورەکانی یۆنان داوە، کتێبەکانی لۆژیک و گەردونناسی و ماتماتیک و ئاودان و کشتوکاڵیان وەرگێڕاوە، بایەخیان بە هەموو ئەو لایەنانە داوە کە پەیوەستە بە چاککردنی زەوییە کشتوکاڵییەکان و لێدان و هەڵکەندنی جۆگەی ئاو، بۆ ئاودانی زەوییەکان، هەوڵیان داوە مەعریفەیان سەبارەت بە زەوی و ئاسمان هەبێت.

ئەمەوییەکان لەم جووڵە ڕۆشنبیری و مەعریفییەدا ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕاوە، عەباسییەکان ئەو ڕۆڵەیان زیاتر و زیاتر کرد، بەتایبەتی لە سەردەمی خەلیفە (مەئمون) دا کە هەستا بە دامەزراندنی (بيت الحكمە)، ئەم خەلیفەیە پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە پێویستە وەبەرهێنانی مەعریفی و زانستی، لە هەستانەوە و دروستکردنی دەوڵەتی زاناکان و بیرمەندەکان و فوقەهاکان و ئەوانەی لە دیدگا و بیرکردنەوەکانیاندا پەنا دەبن بۆ عەقڵ و بۆ فیکری ڕۆشنگەر کە دوورە لە توندڕەوی و پەرگیری، ڕەچاوبکرێت. فیکرێک دوور لەهەر جۆرە لەکارخستنێکی فیکری مرۆڤ کە وای

لێ بکات ببێتە مرۆڤێکی بێ سەر، یان ببێتە مرۆڤێکی خاوەن (سەر) کە پڕە لە کا یان پووش. لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوەش بدەین کە خودی خەلیفە مەئمون، سەبارەت بەو مەسەلەیەی پێیدەوترێت: (نەهامەتی ئیبن حەنبەل)، قسەی زۆر لەسەرە. چونکە لێنەگەڕان ئیبن حەنبەل مافی خۆی لە دەربڕینی بیروڕای جیاوازی خۆیدا وەربگرێت و کار گەشتە ڕادەی کوشتن و سوکایەتی پێکردن و زیندانیکردنی.
خوێندنەوە ئەوە نییە لە باخچەیەکدا یان لە شوێنێکی گشتیدا، کتێبێک بکەینەوە و بیخوێنینەوە. ئەوە مەسەلەیەکی تاکە کەسییە، پەیوەستە بە سروشتی ئەو پەروەردەکردنەوە کە بەشێوەیەکی گشتی لە پەیوەندیمان بە کتێب و بە خوێندنەوەوە، وەریدەگرین. پێناچێت ئەو چرکەساتانەی خوێندنەوە لەو شوێنانەدا، سودێکی ئەوتۆی هەبێت. هەروەها خوێندنەوە بریتی نییە لەوەی لەبەردەم مینبەرەکاندا دانیشین و وتارێک دەربارەی خوێندنەوە پێشکەش بکەین و خەڵکی هان بدەین بۆ خوێندنەوە یاخود بۆ خوێندنەوە بانگهێشتیان بکەین. قەیرانی خوێندنەوە زۆر لەوە گەورەترە و زۆر لەوەش گەورەترە خوێندنەوە کورت بکەینەوە بۆ (تۆڕەکانی خوێندنەوە شبکات للقراءة)، وەک ئەوەی ئێمە بەنیازی ئەوە بین قرژاڵ و ماسی یان دۆلفین ڕاو بکەین.
قەیرانی خوێندنەوە، کێشەیەکی گەورەی کۆمەڵگایە بە پلەی یەکەم، تێیدا دەوڵەت پشکی شێری بەردەکەوێت، بەو پێیەی دەوڵەت توانایەکی بێشوماری لەبەردەستدایە و خاوەنی چەندین دامودەزگایە، ئەو دامودەزگایانە لە دەستێک دەچن کە بۆ بەشێکی زۆری هاوڵاتیان درێژکراوە، بەتایبەتی قوتابیان و خوێندکاران. بگرە وەزارەتی پەروەردەی نیشتیمانی و پێگەیاندنی پیشەیی، وەزارەتی خوێندنی باڵا، وەزارەتی ڕۆشنبیری، وەزارەتی وەرزش و لاوان و وەزارەتی ڕاگەیاندن، لەو وەزارەتانەن کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە بابەتی خوێندنەوەوە هەیە. گەر لەمڕۆدا قوتابخانە و زانکۆکان، تەنها کاریان خوێندنی پرۆگرامەکانی خوێندن بێت، پرۆگرامێک هیچ چێژ و سودێکی نییە و خاڵییە لە مەعریفە و هەوڵدان، خاڵییە لەوەی هانی قوتابیان و خوێندکاران بدات بەشوێن مەعریفەدا بگەڕێن، ئەوا دووچاری نەهامەتییەکی مەعریفی ڕاستەقینە بووینەتەوە. پرۆگرامەکان لە سیاقی هەنووکەیی دوورکەوتوونەتەوە، لەوەی پێیدەوترێت (کۆمەڵگای عیلم و مەعریفەت).
ئەو قوتابخانەیەی فیکری فەلسەفی تیرۆر بکات، گومان و پرسیار تیرۆر بکات، ڕێگربێت لەبەردەم فزوڵی مەعریفی، ئەو تێکست و کتێبانە هەڵبژێرێت کە خزمەت بە بیرۆکە و ئاراستە ئایدۆلۆژییەکەی بکات، فیکری نوێخوازی و ڕۆشنگەری بخاتە لاوە، یان ئەوەیان هەڵبژێرێت کە پێیوایە سودی لێ وەردەگرێت یان لە خزمەتی بەرژەوەندییەکەیدایە، بەوەی مرۆڤێکی گوێڕایەڵ، ملکەچ، بێ پرسیار، ڕازی بەو وەڵامانەی دەیبیسێت، دروست بکات، ئەوا ئەوە قوتابخانەیەکە کار بۆ پەککستنی خوێندنەوە دەکات، لێرەشەوە کار بۆ پەککستنی

مەعریفە و دامرکانەوەی دەکات، هەر لێرەوە کار بۆ جڵەوکردنی جووڵەی کۆمەڵگا دەکات و دەیگۆڕێت بۆ کۆمەڵگایەکی تەماشاکەر و بەرخۆر.

بیرمە، لەساڵانی حەفتاکان تا نیوەی دووەمی هەشتاکان، کتێبخانە گشتییەکان، هەرچەندە کەم بوون، کتێبخانەی سەنتەرەکانی لاوان، چۆن بوون، وەک نەمامگەیەک وابوون بۆ خوێندنەوە. چاوەڕوانی کتێبێک کە بە دەستی خوێنەرێکەوە بوو، سەرقاڵی خوێندنەوەی بوو، یان پێش ئێمە خواستبووی، سەبرێکی زۆری دەویست تا دەستمان دەکەوت، کاتێکی زۆریشی دەویست تا دەمانخوێندەوە و تێبینییەکانمان و کورتەیەکی کتێبەکەمان لە دەفتەرەکانماندا دەنووسییەوە. دواتر دەگەڕاینەوە سەر ئەوەی لە دەفتەرەکانماندا نووسیبومانەوە، تا بیرمان بکەوێتەوە چیمان خوێندووەتەوە و چ تێبینی و پرسیارێکمان تۆمار کردووە.

لەو سەردەمەدا، قوتابخانە بە مامۆستاکانییەوە، کە دواتر بەشێکی زۆریان پەیوەندیان کرد بە زانکۆکانەوە، یان ئەرک و پیشەی دیکەیان هەڵبژارد و زۆربەیان لەمڕۆدا خانەنشین کراوون، پانتاییەک بوو بۆ قسەوباس و گفتوگۆی ئازاد، دەربارەی ئەدەب و فیکرو فەلسەفە و زانست. ئێمە، ئەو کتێبانەی لە کتێبخانەکانەوە وەرماندەگرت، پەرۆشی ئەوە بووین پێش تەواوبوونی وادەی وەرگرتنەکەی، بیخوێنینەوە و بیگەڕێنینەوە، ئەمەش یەکێک بوو لەو هۆکارانەی وای دەکرد ئێمە پەرۆشی ئەوە بین کتێبەکە کورتبکەینەوە و ئەوەی دەیخوێنینەوە تۆماری بکەین. ئێمە وەک چۆن شیعرمان دەخوێندەوە، بەو شێوەیەش شانۆنامە و ڕۆمان و ڕەخنە و چیرۆک و فەلسەفە و سیاسەت و مێژوو و ئەوەی لە زانست و مەعریفە و کتێب بکەوتایەتە بەردەستمان دەمانخوێندەوە.

ئێمە سەر بەو خێزانانە نەبووین کە پارەمان بۆ کڕینی ئەو کتێبانە، بخاتە بەردەست، ئێمە سەر بە خێزانی نەدار و هەژار بووین، هەر بۆیە ئەو کتێبخانانە ببوونە ئەو شوێنەی تێیدا حەزی خوێندنەوە و گەڕانی بۆ قەرەبوو دەکردینەوە. یانەکانی خوێندنەوە کە لە سەنتەرەکانی لاواندا هەبوون و



مامۆستایانی تێکۆشەر بە مانای ڕاستەقینەی وشەکە، بەڕێوەیان دەبرد، ڕۆڵێکی کاریگەریان لە دروستکردنمان و کردنەوەی ئاسۆی مەعریفە بەڕووماندا هەبوو. ئەمە بێ ئەوەی قسە لە ڕۆڵی یانەکانی سینەما و هۆڵەکانی شانۆ و کۆمەڵە پەروەردەییەکان بکەم، ئەم کۆمەڵە پەروەردەییانە بایەخیان بە دیدەوانی هاوینە و کردنەوەی خولی بەهێزکردنی وانەکانی بیرکاری و هەردوو زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی و فەلسەفە و فیکری ئیسلامی بەخۆڕایی دەدا.

ئا لەم کەشوهەوا شۆڕشگێڕانەیەدا، فێری خوێندنەوەی ڕۆژنامەکان بووین و سیاسەت بووە بەشێک لە پێکهاتەی ڕۆشنبیریمان. پاشکۆ ئەدەبییەکان، دەرفەتێک بوو بۆ ئێمە تا ئاگاداری سیمینار و کۆڕە شیعرییەکان ببین و ئاگامان لە دواهەمین بڵاوکراوەکان ببێت. بژاردە فیکرییەکانمان یان سیاسییەکانمان، ئا لەم جۆرە خۆ پێگەیاندنەوە سەرچاوەی دەگرت، ئێمە بە تەنها پشتمان بە قوتابخانە و بە پرۆگرامەکانی خوێندن نەدەبەست، پێمان وابوو ئەوانە تەنها ئامرازێکن و ئامانج نین، هەرچەندە هەم قوتابخانە و هەم پرۆگرامەکانی، گرنگ و بایەخداریش بوو، ئەو کاریگەرییەی لەسەر ئێمە بەجێیهێشت نابێ لەبیر بکرێت. ڕاستە دەوڵەت بایەخی بە خوێندنەوە نەدەدا و ئەو جموجووڵە یان دینامیکییەتەشی بەدڵ نەبوو کە تێیدا قوتابخانە ڕۆڵێکی گەورەی دەبینی، ڕۆڵی گەورەی قوتابخانە لە پرۆگرامەکانی و ئامانجەکانییەوە سەرچاوەی نەدەرگت، بەڵکو لە مامۆستاکانییەوە سەرچاوەی دەگرت کە بەشی هەرە زۆریان سەر بە چەپی مەغریبی بوون، یان ئەوانە بوون لەگەڵ چەپ هاوسۆز بوون، ئەوانەشی دواتر گیران و سوکایەتی زۆریان پێکرا، چونکە پەیوەندییان بەم کارە شۆڕشگێڕانە/تێکۆشەرانەیەوە کردبوو. ئەم کردە شۆڕشگێڕانەیە هەرچەندە نەیتوانی (ڕژێم) بگۆڕێت، وەک ئەوەی چەپەکان یان هەندێ لە چەپەکان دەیانویست. بەڵام توانی بیرکردنەوە و فیکری نەوەیەک یان دوو نەوە بە تەواوی بگۆڕێت و لەسەر ڕێگای مەعریفە دایاننێت. ئەمە پێش ئەوەی دەوڵەت بە پلانێکی کۆنەپارێزی مەبەستدارەوە، بێت و دەستوەربداتە قوتابخانەکان و قوتابخانەکان لە ناوەڕۆکەکانی خاڵی بکاتەوە و زانکۆکان بکات بە مۆڵگەی جاسوسەکان و داخستنی پۆلەکانی فەلسەفە و گۆڕینی بۆ پۆلەکانی لێکۆڵینەوەی ئاینی کە دواتر بووە سەرچاوەی بەرهەمهێنانی بیرکردنەوەی ڕابردوخوازی، هەر ئەم بیرکردنەوەیەش بوو وایکرد مەغریب چەندین تەقینەوە بەخۆیەوە ببینێ کە پێشتر شتی لەو شێوەیەی بەخۆیەوە نەبینی بوو.

گەر ئەوە دەوڵەت بوو کاری بۆ تێکدان و وێرانکردنی قوتابخانە و زانکۆکان دەکرد، کاری بۆ پەکخستنی کۆمەڵگای عیلم و مەعریفەت دەکرد و لەم ڕووەوە سیاسەتێکی ڕوون و ئاشکرای نەبوو، مەبەستم سیاسەتێکی ڕۆشنبیری سەرتاپاگیر کە خوێندنەوە بەشێکە لەو سیاسەتە، ئەوا لەمڕۆدا دەوڵەت بە هەموو ئەو دامودەزگایانەی کە پەیوەندییان بە

بابەتەکەوە هەیە، لەسەریەتی ئەوەی پێشتر خراپی کردووە، ئێستا چاکی بکاتەوە. ئەمەش لە ڕێگەی دانانی بەرنامەیەکی سەرتاپاگیرەوە کە تەواوی هێز و لایەنەکان بەشداربن تێیدا، تا ئەوەی ڕزگار دەکرێت ڕزگار بکرێت. ئەو نەزانین و ڕوکەشگەرایەی یەخەی گرتووین، دەرکەوتنی دیارە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕیزی گەنجاندا، لەوانە توندوتیژی و توندڕەوی، لە ئەنجامی پەکخستنی وەزیفەی قوتابخانە و میدیا و پەکخستنی کاری ڕۆشنبیریی و مەعریفییەوەیە، لەگەڵ ئەوانەشدا پەککستنی کاری حیزب و سەندیکاکان و ڕێخراوە جیاوازەکانی کۆمەڵگای مەدەنی. ئەم ڕێخراوانە لەمڕۆدا سەرقاڵی ئەو پرۆژانەن کە پێیاندەوترێت: (بوژانەوەی مرۆیی)، بەڵام تەنها لە ڕوکەشدا ئەو کارە دەکەن و مرۆڤ لە دەرەوەی ئەم گرنگیپێدانەیە، ئەمە لە کاتێکدا مرۆڤ پێش هەموو شتەکانی دیکەیە.

دەستپێشخەری بۆ بانگهێشتکردنی خوێندنەوە، گرنگە و دەکرێ هەندێ کاریگەری لاوەکی هەبێت. بەڵام گەر دەوڵەت تەنها سەرقاڵی ئەوە بێت پارە ببەخشێت، بەبێ ئەوەی دامودەزگاکانی بخاتەگەڕ و بەبێ ئەوەی میدیا بەڕووی مەعریفە و پرۆگرامە ڕۆشنبیرییەکاندا بکاتەوە، پرۆگرامی ڕیکلامکردن بۆ کتێب و ناساندنی نووسەران و بوارەکانی سەرقاڵبوونیان و بڵاوکراوە تازەکان، ئەوا وەک ئەو کەسە وایە ئاو بە لمدا بکات، یان فوو لە سۆندەیەکی کوناوی بکات.

ژمارەی ئەو قوتابخانانە چەندە کە کتێبخانەیان هەیە، کتێبخانەیەک کتێب و کۆمپیوتەر و هۆیەکانی گوێگرتن لە مۆسیقای تێدابێت؟ هۆڵ و گرووپی شانۆ و مۆسیقا و سەما و وێنەکێشانی تێدابێت؟ خۆ ئەگەر هەندێ لە قوتابخانەکان کتێبخانەیان هەبێت، ئایا کتێبەکانی ناوی چین؟ دەخوێنرێنەوە؟ ئایا ئەو کتێبانە بوونەتە بەشێک لە پرۆگرامی فێرکردن، یان وەک پەندەکە دەڵێت: تەنها سەوزەی سەر خواردنە. لەلایەکی دیکەوە ئایا ڕۆڵی گەنجان تەنها لە ڕۆشتنیانە بۆ کتێبخانەکان؟ بە چ مانایەک و لەسەر بنچینەی چ پرۆگرام و ئاسۆیەک؟ پاشان ئایا ڕۆڵ و پشکی کتێبخانەکان چییە لە هەموو بوارە جیاوازەکان و بە زمانە جیاوازەکان؟ ئەمە ئەگەر کتێبخانە هەبێت.

لەو بڕوایەدام ئەو پارەیەی بۆ هەندێ مەسەلەی لابەلا خەرج دەکرێت کە هیچ سودێکی نییە، پێویستە بۆ مەسەلەی کتێب و بوونی کتێب و کۆمەککردن بە بازاڕی چاپکردن و بڵاوکردنەوەی کتێب خەرج بکرێت، بۆ تازەکردنەوەی ناوەڕۆکی کتێبخانەی قوتابخانەکان و زیندووکردنەوەی ئەم کتێبخانانە، لە میانەی خولەکانی خوێندنەوەوە، خەرج بکرێت. پێویستە نووسەران و داهێنەران و بیرمەندان و هونەرمەندان بانگهێشت بکرێن و لەگەڵ قوتابییەکان دانیشن و لەسەر کار و بەرهەم و چالاکییەکانیان قسە بۆ قوتابییەکان بکەن. لەبارەی گرنگی زانست و مەعریفەوە قسەیان بۆ بکەن، ئەمەش بۆ ئەوەی قوتابخانە و زانکۆکان، ببێتە شوێنێک لە دەرەوەی ئەو دیوارەی بەدەوری خۆیاندا کێشاویانە و بوونەتە

زیندان یان بوونەتە شوێنێکی دوورە پەرێز کە هیچ پەیوەندییەکیان بە کۆمەڵگاوە نییە. ئەمە یەکێکە لە قەیرانەکانی ئەمڕۆی زانکۆکانمان.

با لەسەر بایەخدان بە مرۆڤ بەردەوام بین، لەسەر پەروەردەکردنی و فێرکردنی، نا بۆ ئەو بانگەشەیەی کە دەڵێت نابێت مامۆستاکان قوتابییەکان لە ئامێز بگرن و ببنە هاوڕێیان. ئەمە جەهلێکی دیکەیە ئەوانە دووچاریان کردین کە لە ئاسمانەوە بۆمان هاتوونەتە خوارەوە. مرۆڤ کاکڵەی هەموو گۆڕانکارییەکان و هەموو ڕۆشنکردنەوەیەکە. هەر ئەمەشە خودی قورئان باسی لێوە دەکات کاتێ دەڵێ: (وكرمنا بني ادم... وفضلناهم على كثير من خلقنا تفصيلا. الاسراء 70).

هیچ کۆمەڵگایەک بە بێ مرۆڤ مانای نییە، هیچ مرۆڤێکیش بەبێ مەعریفە مانای نییە، هیچ مەعریفەیەکیش بەبێ کتێب مانای نییە. لێرەوە پێویستە دەوڵەت بەرپرسیارەتی تەواو لەئەستۆ بگرێت و لەم پەلەقاژێیەی کە لە هەموو شتێکدا تێی کەوتووین دەرمانبێنێت، وەک ئەوەی ئێمە لە لێشاوی ئاوێکی زۆر قورسدا بین ڕێگەی جووڵەی لێ گرتبین، یان ڕێگە نادات بە ئازادانە مەلە بکەین. ئەمەش خنکانێکی ڕاستەقینەی بە دواوەیە و گەر بارودۆخەکە وەک ئەوەی ئێستا کە هەیە، ئەوا دەربازبوون لێی مەحاڵە.

**سەرچاوە: الاوان. ٢٠١٤/٥/٣٠**

# ڕاستییە ترسناکەکان

فازل ئەلسوڵتانی
**لە عەرەبییەوە: سەردەم**

پێش ماوەیەک لەمەوبەر، وەزیری پەروەردەی بەریتانیا، ناڕەزایی خۆی لەسەر نزمبوونەوەی ڕێژەی خوێندنەوە لای منداڵان و گەنجانی بەریتانی دەربڕی. هۆکارەکانی ئەو نزمبوونەوەیە ئاشکرا و زانراوە: سەرقاڵبوونی ئەوان بە جیهانی ئەنتەرنێت و زۆربوونی ئامرازەکانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و یارییە ڤیدیۆییەکان، دواجار هاتنی ئامێری زیرەک کە ئامێرێکە هێندەی لەپی دەست دەبێت و تەواوی جیهانی کورتکردووەتەوە و هەڵیگێڕاوەتەوە و زۆر بەخێرایی بووەتە ئامرازێک تەنانەت بەدەست گەورەکانیشەوە. هەندێ ئاماری تازە لە بەریتانیا ئەوە دەخەنە ڕوو کە زیاد لە 60% ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان 18 بۆ 30 ساڵە، حەز دەکەن تەماشای تەلەفزیۆن یان (دی ڤی دی) بکەن تا کتێب خوێندنەوە.
ئەم ڕێژەیە، کە لە وڵاتە ئەوروپییە پیشەسازییەکاندا کەمترە، هەڕەشەیەکی گەورەیە بۆ سەر

بازاڕی قەبەی کتێب لە بەریتانیا کە داهاتی ساڵانەی بە 3 ملیار پاوەن دادەنرێت. ئەم هەڕەشەیە فشاری خستووەتە سەر حکومەتی بەریتانی بۆ ئەوەی شتێک بکات، بە تایبەتی دوای ئەوەی حکومەتی کۆنزەرڤاتیڤەکان بڕێکی زۆر لەو داهاتەیان کەمکردەوە کە بۆ کتێبخانە گشتییەکانی شارەوانییەکان تەرخان کرابوو، ئەمە بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆری ئەو کتێبخانانە دابخرێن.

بێگومان (سەرمایە- الراسمال) کە هەمیشە خۆی ڕزگار دەکات، ترسی لەسەر نییە و هەمیشە لەوەدا زیرەکە ڕێڕەوی تازەی ڕزگاربوون دەدۆزێتەوە. لە ئێستاوە خاوەن دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوە گەورەکان، بیر لەوە دەکەنەوە پیشەسازی مۆسیقا بەسەر پیشەسازی کتێبدا پیادە بکەن. بەو مانایەی نووسەران وەک گۆرانیبێژە بەناوبانگەکان لێ بکەن و گەلێک ئاهەنگ و بۆنەیان بۆ ئامادە بکەن. وایان لێ بکەن زیاتر ئاوڕ لە ئامرازەکانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بدەنەوە تا پەیوەندی بەردەوامیان لەگەڵ موعجیبەکانیان هەبێت، ئەمە جگە لە ڕیکلام و کتێبی ئەلیکترۆنی. بەڵام مەترسییە گەورەکە، کە کەسایەتی و دەزگا و ناوەندە ڕۆشنبیرییەکان، ترسیان لێی هەیە و دەیخەنە ڕوو، ئەوەیە وڵاتی شەکسپیر، لە ئایندەیەکی نزیکدا، کەلتوری نەخوێندنەوە یەخەی بگرێت. بە پێی ئەو ئامارەی لە ساڵی 2011 ئەنجامدراوە و ڕۆژنامەی (فایناشیاڵ تایمز) لە 19 ئازاری ڕابردودا ئاماژەی پێداوە، سێ یەکی ئەو منداڵانەی ڕاپرسیان لەگەڵ کراوە، هیچ کتێبێکی تایبەت بە خۆیان نەبووە. 19% گەنجەکان لە ژێر ئاستی خوێندنەوەوە بوون.

ڕەنگە ئەو ژمارانە بۆ ئێمە، هیچ بایەخێکی نەبێت، ڕەنگە تەنانەت بۆ ئێمە (پۆزەتیڤ) بێت، بەڵام بۆ وڵاتێکی وەک بەریتانیا، ژمارەیەکی هێجگار مەترسیدارە. لەوێ دەزانرێت خوێندنەوە باشترین ڕێگایە بۆ دەوڵەمەندکردنی عەقڵ و خەیاڵ و ئەو کۆڵەکە سەرەکییەیە بۆ هەر پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتی و ئابوری. لەوەش گرنگتر، ئەوەیە ئەم وڵاتە لەبەرامبەر ئەم ڕاستییەدا چی دەکات. یەکێک لە سیفەتەکانی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان، کە لە هەمان کاتدا هۆکارێکی سەرەکییە لە پشت پێشکەوتنەکانییەوە، ئەوەیە کەموکورتی و ناتەواوییەکانی خۆی ناشارێتەوە، بەڵکو خۆی هەڵەکانی خۆی ئاشکرا دەکات و دەیخاتە بەردەم گفتوگۆیەکی ئاشکراوە تا چارەسەری ڕاستەقینەی بۆ بدۆزرێتەوە، نەک پینەوپەڕۆی بکات، پینەوپەڕۆیەک زۆر بەخێرایی لەبەردەم واقیدا خۆی پێناگیرێت و ڕایدەماڵێت.

لێرەوە، لە ئێستادا پەرلەمانی بەریتانی و لە ڕێگەی لیژنە تایبەتەکانییەوە، گفتوگۆ لەسەر گرتنەبەری ئەو ڕێوڕەسمانە دەکات کە بۆ نەهێشتنی ئەو مەترسییە دەبێت بگیرێتەبەر. گفتوگۆکان لەسەر ئەو بنەمایەیە کە دەڵێت: (هەر لە منداڵییەوە فێری خوێندنەوەیان بکەن)، چونکە تۆ گەر ویستت خوێنەرێکت بە درێژایی ژیان هەبێت، ئەوا پێویستە پێش ئەوەی گەورە ببێت، ئاشنای بکەیت بە جیهانی خوێندنەوە. لەوەش گرنگتر ئەوەیە، ناوەندە ڕۆشنبیرییە

ئەهلییە زۆرەکانی بەریتانیا، چاوەڕوانی بیرۆکراتیەتی حکومەت نەبوون، بەڵکو لای خۆیانەوە چەندین دەستپێشخەری خێرایان بۆ هاندانی خوێندنەوە دەستپێکرد، بە تایبەت لە گەڕەکە هەژار و پشتگوێخراوەکانی پایتەختی بەریتانیا. لەم بارەیەوە چەندین کتێب و گۆڤاری ئاست جیاوازیان دابەشکرد، لەگەڵ ڕێخستن و ئەنجامدانی ئەڵقەی خوێندنەوە بۆ منالان و گەوران.

ئێستا پرسیارەکە ئەمەیە: بۆچی لە وڵاتانی ئێمە، ژمارەی لەوە هەزارانجار مەترسیدارتر نامانترسێنێت؟ ساڵانە ئەو ژمارانە دووبارە دەبنەوە و وەزارەتەکانی پەروەردە و خوێندن ناترسێنێت تا چاوێک بە پرۆگرامەکانیاندا بخشێننەوە. وەزارەتەکانی ڕۆشنبیریش ناچار ناکات لە نووسینگە قەشەنگەکانیانەوە بێنە دەرەوە بۆ سەر شەقامەکان و حکومەتەکانیش ناچار ناکەن حاڵەتی نائاسایی ڕاگەیەنن، هەروەها دەزگا فەرمی و نا فەرمییەکانیش ناچار ناکەن بەیداخی مەترسیەکە بەرز بکەنەوە بۆ ئەوەی لانی کەم شتێک لەو مەترسییە تێبگەن، زۆر بە داخەوە لە مێژە ئەو زەرەرە کەوتووەتەوە.

ئەوە کۆمەڵێک ژمارەیە، مرۆ لەبەردەم ترسناکییەکەیاندا تەنها ئەوەندەی پێ دەکرێت، باوەڕ نەکات و لەرز دایبگرێت. ئەمە لەکاتێکدایە ئەو ژمارانە زانراون و شاراوە نین و لە هەموو ڕاپۆرتەکانی بوژانەوەی کەلتووری و ئەو ڕاپۆرتانەش کە نەتەوە یەکگرتووەکان دەیانخاتەڕوو، دووبارە دەبنەوە. بەڵام خراپ نییە بیهێنینەوە بیری ئەوانەی بە خێرایی شتەکان لەبەیر دەکەن: عەرەب لە ساڵێکدا تەنها شەش خولەک دەخوێنێتەوە! کێ لە ئێمە لەبەردەم ئەم ڕاستییە مەترسیدارەدا ڕاناچڵەکێت؟ لەوەش گرنگتر ئەوەیە کێ شتێک دەکات؟

**سەرچاوە: الشرق الاوسط، ٢٠١٤/٤/٥**



ئاگاداری هاوکارانی گۆڤاری سەردەم ئەکەین کە فایلی ژمارەی ئایندە لەسەر

# (رۆشنگەری و فەیلەسوفانی رۆشنگەری)ە

govarysardam@yahoo.com




# بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

**ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند**

لای هەموان ئاشکرایە لە سەرەتای ئەم ساڵەوە، قەیرانێکی ئابوری ڕووی لە هەرێمی کوردستان کردووە، ئەم قەیرانە ئابورییە تا ڕادەیەک کاریگەری هەبووە لەسەر مەسەلەی چاپکردنی کتێب لە دەزگای سەردەم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، دەزگا توانیویەتی لەو ماوەیەدا کۆمەڵێ کتێبی دانسقە و گرنگ چاپ و بڵاو بکاتەوە و توانیویەتی بەردەوام بێت لەسەر دەوڵەمەندکردنی زیاتری کتێبخانەی کوردی. لێرەدا ڕانان بۆ هەندێ لەو کتێبانە دەکەین کە لە ماوەی ئەم قەیرانە ئابورییەدا، بڵاوکراونەتەوە و کەوتوونەتە بەر دەستی خوێنەر.

**ڕۆمانی شەیتانەکان**

ڕۆمانی شەیتانەکان-ی نووسەری گەورەی ڕووسی "دۆستۆیڤسکی 1821-1881"، بە یەکێک لە شاکارە گەورە و مەزنەکانی ئەدەبی ڕووسی و جیهانی دادەنرێت. بەشی زۆری ئەوانەی گرنگی بە ئەدەبی ڕووسی و بە تایبەتی بە ئەدەبی دۆستۆیڤسکی دەدەن، پێیان وایە دۆستۆیڤسکی لەم ڕۆمانەدا تا سنورێکی زۆر لە مەسەلەی سیاسەت نزیک بووەتەوە و ڕۆمانەکە هەڵگری شەحنەیەکی سیاسییە، بگرە هەندێ لە ڕەخنەگرانی ئەدەب پێیان وایە ئەم




ڕۆمانە، کتێبێکی سیاسییە لە بەرگی ڕۆماندا، ئەو ڕەخنەگرانە پێیان وایە دۆستۆیڤسکی هەوڵیداوە لەم ڕۆمانەدا باس لەو بارودۆخە سیاسییە بکات کە لەو سەردەمەدا و لە وڵاتەکەیدا باو بووە (ئەم ڕۆمانە بۆ یەکەمجار لە ساڵی 1872 بڵاوکراوەتەوە).

لێرەوە ڕەخنەگران وا تەماشای پاڵەوانەکانی نێو ئەم ڕۆمانە دەکەن وەک ئەوەی پاڵەوانی ڕەمزی بن، واتە هەر یەکێک لەو پاڵەوانانە ڕەمزێکە بۆ توێژێک یان چینێکی دیاریکراو یاخود ئاستێکی ڕۆشنبیری تایبەت. وەلێ ڕەخنەگران و توێژەران پێیان وایە، ئەم ڕۆمانە هەرچەندە باس لە کۆمەڵێ گفتوگۆ و مشتومڕی سیاسی دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نووسەری ڕۆمانەکە زۆر سەرکەوتوانە توانیویەتی ڕۆبچێتە نێو ناخی پاڵەوانەکان و سیمایەکی ئەدەبی جوان بدات بە ڕۆمانەکە. ئا لێرەوەیە ئەم ڕۆمانە بە یەکێک لە ڕۆمانە سەرەکییەکانی دۆستۆیڤسکی لەقەڵەم دەدرێت. مەبەست لە ڕۆمانی سەرەکی، ڕۆمانی برایانی کارامازۆف و تاوان و سزایە.

دۆستۆیڤسکی لە سەرەتای ڕۆمانەکەوە ئەوە دەخاتە ڕوو کە شتێک لە نێو فیکری ڕووسیدا کەوتووەتە جووڵە، ئەم فیکرە چیتر وەک پێشتر نامێنێتەوە و لەو چەق بەستنەی دێتەدەرەوە و جووڵەیەکی تێ کەوتووە، بەڵام بۆ زانینی شێوە و ماهیەتی ئەو جووڵەیە، پێویستە لاپەڕە بە لاپەڕە بکەویتە خوێندنەوەی ڕۆمانەکە. چونکە

دۆستۆیڤسکی یەکێکە لەو ڕۆماننوسانەی بە ئاسانی جڵەوی پاڵەوانەکانی ناخاتەڕوو، بە ئاسانی هەموو شتەکان ناخاتە بەردەستی خوێنەر، بەڵکو تەواوی ڕووداوەکان وردە وردە دێنە پێشەوە و بە یەکجار هەموویان دەرناکەن. ئەم ڕۆمانە پڕە لە کاراکتەری جۆراو جۆر، هەیانە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری ڕۆژانەی زیاتر لەکاری شەیتان و خراپەکارییەوە نزیکە، بەڵام هەشیانە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری دەچێتە خانەی کاری پیاوچاکان و ئەوانەی سۆزێکی قووڵیان بۆ مرۆڤایەتی هەیە و خەڵکانی سەلامەت و بێوەین و دوور لە هەر کارێکەوە کە ئازار بە مرۆڤی بەرامبەر بگەیەنێت. لەم ڕۆمانەدا بە ڕوونی ئەو دوو جۆرە کاراکتەرە دەبینین و بە هەردوکیان ئەوە شتە پێکدەهێنن کە ناوی ژیانە، ژیان بە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانییەوە، ژیان وەک ئەوەی هەیە و تێیدا گوزەردەکەین. ژیان وەک واقیعێک ڕۆژانە مامەڵەی دەکەین و بەناویدا تێدەپەڕین. ئەم شاکارە ئەدەبییە، بە شێوازێکی ئەدەبی جوان، قووڵایی ناخی مرۆڤەکانمان بۆ دەردەخات، مرۆڤگەلێک دەیانەوێ جێگا دەستیان لەسەر ژیان و ڕۆژگاری خۆیان دیاربێت.

خۆشبەختانە ئەم ڕۆمانە، لەلایەن چیرۆکنوس و وەرگێڕ مامۆستا "ڕەووف بێگەرد"ەوە بە زمانێکی کوردی پوخت و جوان، لە فارسییەوە کراوە بە کوردی، زمانێک خوێنەر ماندوو ناکات و دوورە لە گرێ و گۆڵ. ڕۆمانی شەیتانەکان دوو بەرگە، کۆی ژمارەی لاپەڕەکانی هەر دوو بەرگەکە، 1151 لاپەڕەی مام ناوەندییە و نرخی هەر بەرگەی دە هەزار دینارە و تیراژی دوو هەزار دانەیە.

## مەسەلەی کورد لە عێراقدا

ئەم کتێبە گەرچی بە قەبارە بچوکە و یەکێکە لە کتێبەکانی زنجیرەی کتێبی گیرفان، بەڵام بایەخێکی تایبەتی هەیە، ئەویش ئەوەیە نووسەرەکەی دۆستێکی نزیکی کوردە و بە ئەمانەتەوە باس لە کێشەی کورد دەکات لە عێراقدا. لۆژیکی سەرەکی بیرکردنەوەی ئەم نووسەرە عەرەبە، ئەوەیە کورد نەتەوەیەکی زیندووە و حەقی ئەوەی هەیە مافی چارەی



خۆنووسین بەدەست بێنێت. هەرچەندە کتێبەکە لە دیدێکی مارکسی لینینییەوە دەڕوانێتە کێشەی کورد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نووسەرەکەی باوەڕی بەوەیە کورد مافی خۆیەتی ببێتە خاوەنی کیانێکی سەربەخۆ و لەسەر زێدی خۆی، فەرمانڕەوایی خۆی بکات.

وەرگێڕی کتێبەکە بەڕێز حەمەکەریم عارف، لە تێبینییەکدا ئاوا باس لە هۆکاری وەرگێڕانی ئەم کتێبە دەکات: (ئەم بەرهەمە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردودا لەلایەن عەزیز شەریف-ی دۆستی کوردەوە نووسراوە و، بەندە لە هەشتاکاندا، لە چیا و بەدەم پێشمەرگایەتییەوە کردم بە کوردی و لە یەکێک لە ژمارەکانی گۆڤاری کەلتووردا، کە بەداخەوە بە نوسخەی زۆر کەم چاپ دەبوو، بڵاوم کردەوە. بۆیە لەبەر بایەخی مێژوویی بەرهەمەکە و وەکو ئەمەکدارییەک بۆ دۆستایەتی نووسەرەکەی و بۆ ئاگاداری نەوە تازەکانمان لەو بۆچوونە واقیعیانەی کە شەریف دەرهەق بە دۆزی کورد هەیبووە و بە مەبەستی سووربوونتر لەسەر داوای فیدراڵیەت بۆ کوردستان کە لەم قۆناغەدا کەمە، زۆر نییە، بە پێویستم زانی دووبارە و وەکو خۆی بڵاوی بکەمەوە).

ئەم کتێبە کە ژمارە 131 کتێبی گیرفانی وەرگرتووە، لە ئێستادا و بۆ ئەم ساتەوەختەی ئەمڕۆمان کە کێشەی کورد چەندین قۆناغی گرنگی بڕیوە و چەندین ڕەهەندی نێودەوڵەتی وەرگرتووە و لە دروستکردنی دەوڵەتی کوردی نزیکبووەتەوە، سودبەخشە و خوێندنەوەی زیاتر ئاشنامان دەکات بە کێشە و بەربەستەکانی بەردەم دۆزی کورد.

بەڕێز حەمەکەریم عارف بە کوردییەکی جوان و ڕەوان، کتێبەکەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و لە کۆتایی کتێبەکەشدا فەرهەنگۆکەیەکی بۆ ژمارەیەکی زۆر وشە کردووەتەوە، ئەم فەرهەنگۆکەیە وایکردووە کتێبەکە ئاسانتر خۆی بدات بەدەستەوە و بایەخی کتێبەکەی زیاتر کردووە. ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبە 159 لاپەڕەی بچوکە، تیراژەکەی 500 دانەیە و نرخی هەر دانەیەک تەنها هەزار دینارە.

**پیراندێللۆ... چیرۆکنووس و شانۆنووسی ئیتاڵی**

ئەمە یەکەم کتێبی پرۆژەی زنجیرەی بنیاتنەرانی کەلتوورە کە یەکێکە لە پرۆژەکانی دەزگای سەردەم، کتێبەکە تایبەتە بە نووسەرێکی گەورە و ناوداری ئیتاڵی و جیهانی، ئەویش "لویجی پیراندێللۆ"یە. ئەم نووسەرە گەرچی لای ئێمەی کورد، نەناسراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەکێکە لەو نووسەرە مەزنانەی جێگا پەنجەی بەسەر ئەدەبی ئیتاڵی و جیهانی سەدەی بیستەمەوە دیارە. تەنانەت هەندێ لە ڕەخنەگران لەو بڕوایەدان کاریگەری ئەم نووسەرە بەسەر نووسەرانی وەک جان جینییە و سامۆئێل بێکت و یۆجین یۆنسکۆ و ئەدوارد ئەلبی و چەندانی دیکەوە، دیارە.

جێ دەستی ئەم کەڵە نووسەرە، لەسەر هەردوو ژانری چیرۆک و شانۆ، بە ڕوون و ئاشکرایی دیارە و لەو دوو ژانرەدا خاوەنی بەرهەمگەلێکی هێجار زۆرە. زۆری بەرهەم




و بەهای بەرهەمەکانی، وایانکرد لە ساڵی 1934 خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئەدەب وەربگرێت.
ڕەخنەگران پێیان وایە، پیراندێللۆ لە بواری نووسینی چیرۆکدا، تایبەتمەندی خۆی هەیە و لە چیرۆکنوسانی بەر لە خۆی ناچێت، ڕەنگە خاڵی جیاکەرەوەی ئەم چیرۆکنووسە لەگەڵ ئەوانی پێش خۆی، بە تایبەتی چیرۆکنووسە ئیتاڵییەکان، بریتی بێ لە تێکەڵکردنی خەیاڵ و واقیع، ئەفسانە و حەقیقەت لەگەڵ یەک.
بە پێی هەندێ توێژینەوە بێت کە لەسەر شانۆنامەکانی کراون، کێشەی حەقیقەت یەکێکە لەو تەوەرە سەرەکییانەی کە هونەری پیراندێللۆ لەسەری ڕاوەستاوە و قسەی لەبارەوە کردووە، ئەم نووسەرە لە زۆرێک لە شانۆنامەکانیدا، باسی لە کێشەی حەقیقەت کردووە و لە چەندین دیدگاوە چارەسەری کردووە و پەیوەستی کردووە بە ژیان و بە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکەوە، بەو پێیەی حەقیقەت بابەتێکی فەلسەفیە.
هەندێ لە توێژەرانی ئەم نووسەرە، پێیان وایە، وەک چۆن سوقرات فەلسەفەی لە ئاسمانەوە هێنایە خوارەوە بۆ سەر زەوی، بە هەمان شێوە پیراندێللۆ دەستی فەلسەفەی گرت و بردییە سەر تەختەی شانۆ و داهێنانی هونەری و فەلسەفەی تێکەڵ بەیەک کرد.
ئەم کتێبە گەرچی باس لە ژیان و بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە دەکات و چیرۆکێک و شانۆگەرییەکی پیراندێللۆی لەخۆ گرتووە. لەگەڵ ئەوەشدا بە وردی و بە درێژی باس لە چیرۆکنوسانی ئەو سەردەمەی ئیتاڵیا دەکات و باس لەو جیاوازیانە دەکات کە ئەم چیرۆکنووسە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا هەیبووە. کتێبەکە دەوڵەمەندە بە کۆمەڵێ زانیاری گرنگ لەسەر ژینگەی ڕۆشنبیری ئیتاڵیا لە ساڵانی سەدەی بیستەم.
بەڕێز ئەردەڵان عەبدوڵڵا، سەرکەوتوانەوە و بە زمانێکی کوردی پوخت، کاری وەرگێڕانی بۆ ئەم کتێبە جوانە ئەنجامداوە. ژمارەی لاپەڕەکانی کتێبەکە 187 لاپەڕەی بچوکە، تیراژەکەی 750 دانەیە و نرخی 3000 هەزار دینارە.

## کۆشکی بۆق

کۆشکی بۆق یەکێکە لە ڕۆمانە جوان و سەرنجڕاکێشەکانی نووسەری نەرویجی "یۆستاین گاردەر" کە لە ساڵی 1952 لە دایک بووە و ئێستا مامۆستای فەلسەفە و مێژووی فیکرە و لەیەککاتدا سەرقاڵی ئەدەب و وانە وتنەوەیە. ئەم نووسەرە بەوە ناوبانگی دەرکردووە کە کارەکانی زیاتر بۆ منداڵانە و بە زمانی ئەوان، باس لە کێشە قووڵ و فەلسەفییەکانی وەک بوون و ژیان و مێژووی فەلسەفە دەکات. زمانێک تا ئاستێکی زۆر ڕەوان و سادەیە و خوێنەر بە باشی لێی تێدەگات.




لە ڕاستیدا ئەوە خاڵێکی گرنگی کارکردنی ئەم نووسەرەیە، واتە گاردەر لە بەشی هەرە زۆری ڕۆمانەکانیدا، کێشە فەلسەفییە قورس و زەحمەتەکان، بە زمانێک دەنووسێتەوە کە تێگەشتن لێی ناڕەحەت نییە.

خۆشبەختانە ئەم نووسەرە زیندووەی جیهانی ڕۆمان، لای ئێمەی کوردیش ناسراوە و بەرهەمەکانی کراون بە کوردی. یەکێک لە ڕۆمانە ناوازەکانی (جیهانی سۆفیا)یە، ئەم ڕۆمانە بۆ زیاد لە 53 زمان وەرگێڕدراوە، لە ناویاندا زمانی کوردی، بگرە لێرە لای ئێمە تا ئێستا چەند جارێک چاپکراوەتەوە. بەو مانایەی ئەم ڕۆمانە خوێنەرێکی باشی هەیە. بە پێی هەندێ ئامار، لە تەواوی جیهاندا زیاد لە سی ملیۆن دانە لە ڕۆمانی جیهانی سۆفیا فرۆشراوە.

ڕۆمانی کۆشکی بۆق، وەک بەشێک لە کار و لە شێوازی ئیشکردنی گاردەر، دیسانەوە لەسەر زاری مێرد منداڵێک و بە جۆرێک لە ئەفسانەسازی نووسراوە، ڕۆمانەکە باس لە دڵتەنگی منداڵێک دەکات کە بە هۆی مەرگی باپیرییەوە، جۆرێک لە بێزاری و ناڕەحەتی دایگرتووە. نووسەر بۆ ئەوەی ئەم منداڵە لەو بێزارییە دەربێنێت و جیهانێکی پڕ سەیر و سەمەرەی پیشان بدات، تا مەرگی باپیری لە یاد بکات، لە ڕێگەی کورتە باڵایەکەوە، دەڕواتە نێو کۆشکێکی ئەفسانەیی خەیاڵاوی، بە گەیشتنی کریستۆڤەری پاڵەوانی ڕۆمانەکە بۆ ناو کۆشکە سەیر و سەمەرەکە، گەشتی ئەم پاڵەوانە بچکۆلەیە دەست پێدەکات کە پڕە لە ڕوداو و بوونەوەری سەرسوڕهێنەر.

ئەم ڕۆمانە لەلایەن کاک سیروان مەحمود لە ئینگلیزییەوە بە کوردییەکی پوخت کاری وەرگێڕانی بۆ کردووە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی ڕۆمانەکە چەندین نیگار یان وێنەی لەخۆگرتووە کە گوزارشت لە سیاقی بەرەو پێشچوونی ڕۆمانەکە دەکەن و تێگەشتن لە ڕۆمانەکە ئاسانتر دەکەن، وێنەکان وەک لە لاپەڕە (2) ی کتێبەکەدا ئاماژەی پێدراوە لەلایەن "فلیپ هۆپمان"ەوە کێشراون. ژمارەی لاپەڕەکانی 149 لاپەڕەی قەبارە بچوکە، تیراژی 1200 دانەیە و نرخی 2500 دینارە.

## جەنەڕاڵی سوپایەکی مردوو

ڕۆمانی جەنەڕاڵی سوپای مردوو، یەکێکە لە ڕۆمانە ناوازەکانی نووسەری ئەلبانی ئیسماعیل کاداریێ، نووسەری ئەم ڕۆمانە ساڵانێکە ناوی دەچێتە لیستی ئەو ناوانەی بۆ خەڵاتی نۆبڵ ئامادە دەکرێت، بەڵام وا دیارە هێشتا بەرپرسان و ئەوانەی دەستنیشانی ئەوە ئەکەن خەڵاتەکە بدرێ بە کێ و نە درێ بە کێ، وەک پێویست ئاوڕیان لەم نووسەرە پڕ بەرهەمە نەداوەتەوە کە یەکێکە لە ڕۆمانووسە ناودارەکانی ئەم سەردەمە. یەکێکە لەو دەنگە ئەدەبییانەی مێژووی ستەمی ئەلبانیا دەگێڕێتەوە و تێکەڵ بە مێژووی تەواوی مرۆڤایەتی دەکات. باس لەو قەهر و ئازار و ئەشکەنجانە دەکات، لەسەردەمی سەرۆکی پێشوی ئەلبانیا "ئەنوەر خواجا" لە وڵاتەکەیدا بەرقەرا بووە.

کاداریێ ساڵی 1936 لە هەمان ئەو شارە لە دایک دەبێت کە ئەنوەر خواجای دیکتاتۆری ئەلبانیا تێیدا لە دایک دەبێت. لە تەمەنی 27 ساڵیدا یەکەم ڕۆمانی خۆی بە ناونیشانی جەنەڕاڵی سوپایەکی مردوو دەنووسێت، ئەم کارە دەرگای جیهانی ڕۆمانی بە ڕوودا دەکاتەوە و دەبێتە یەکێک لە ڕۆماننوسە گرنگەکانی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی.

هەرچەندە باس لەوە دەکرێت کە ئەم نووسەرە هیومانستییە، پەیوەندییەکی توند و تۆڵی لەگەڵ دیکتاتۆرەکەی ئەلبانیا هەبووە و توانیویەتی لە ژێر سایەی ئەو دیکتاتۆرەدا لە ئەلبانیا بمێنێتەوە و ژیان بەسەر ببات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دواجار لە ساڵی 1990 بە چەند مانگێک پێش ڕوخانی ڕژێمی ئەنورە خواجا،



ئەلبانیا بەجێ دەهێڵێت و ڕوو دەکاتە فەرەنسا و داوای پەنابەری سیاسی دەکات.
بیرۆکەی ڕۆمانی جەنەڕاڵی سوپایەکی مردوو، بریتییە لە ڕۆشتنی جەنەڕاڵێکی سوپای ئیتالیا بۆ ئەلبانیا، تا لەوێ ئیسک و پروسکی ئەو سەربازانە بێنێتەوە کە لە جەنگی دووەمی جیهانی لەو سەرزەمینە دوورەدا کوژراون. ئەم گەشتەی ئەو جەنەڕاڵە بۆ ئەو سەر زەمینەی پڕە لە گۆڕستان و قەبری گومناو، گەشتێکی دڵتەزێنە و لێوان لێوە لەو نەهامەتیانەی کە جەنگەکان لە دوای خۆیانەوە بەجێیدەهێڵن.
لەم ڕۆمانەدا هەرچەندە جەنگ کۆتایی هاتووە و مەیدانەکانی پێکدادان و گۆڕەپانی شەڕەکان، بێدەنگ و کش و ماتن، بەڵام تراژیدیای جەنگ و دەرئەنجامەکانی، دوای ئەو هەموو ساڵە لە کۆتایی جەنگەکە، هەر بەردەوامە و هێشتا برینەکانی سارێژ نەبوون، هێشتا گۆڕی کوژراوەکان نادیارن و کەسوکاریان لە چاوەڕوانی هاتنەوەی ئیس و پروسکیانن.
کاک محەمەد کەریم ئەم ڕۆمانەی لە زمانی فارسیەوە بە بە شێوەیەکی جوان کردووە بە کوردی. لاپەرەکانی 282 لاپەڕەی مام ناوەندییە، تیراژی 750 دانەیە و نرخی 6000 هەزار دینارە.

## دیموکراسی

کتێبی (دیموکراسی) یەکێکە لە کتێبە پڕ بایەخەکانی ئەم ماوەیەی پێشوو کە دەزگای سەردەم بە چاپی گەیاندووە. کتێبەکە لە نووسینی "چارلز تیلی"یە و باس لە مێژووی




سەرهەڵدان و گەشەکردنی دیموکراسی دەکات لە کۆنی کۆنەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان. لە سەردەمی ململانێی نێوان ئیسپارتە و ئەسینەکان لەسەر چۆنیەتی حوکمڕانی، بۆ دروستبوونی دەوڵەتە دیموکراسییەکانی ئەم سەردەمە. لەم گەشتە دوور و درێژەدا بە وردی ئاگاداری برێکی زۆری ئەو کێشە و بەربەست و گرفتانە دەبین کە لە ڕەوتی پێشکەوتنی دیموکراسیدا، هاتوونەتە بەردەم دیموکراسی.
کتێبەکە کراوە بە هەشت بەشەوە و هەر بەشەی باس لە ئەزمون و کێشە و ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی دیموکراسی دەکات. ئەم بەشانە بە جۆرێکە کە دەکرێ بە تەنها و بە جۆرێکی

سەربەخۆ لە بەشەکەی پێشتر یان دواتر بخوێنرێتەوە. ئەمەش وا دەکات خوێندنەوەی کتێبەکە ئاسانتر بێت و خوێنەر زیاد لە بژاردەیەکی لەبەردەمدایە بۆ خوێندنەوە. بەشی یەکەم تایبەتە بە پێناسەکردنی دیموکراسی و ئەم ناونیشانەی لەخۆگرتووە: دیموکراسی چییە. لەم بەشەدا بە درێژی باس لە چەمکی دیموکراسی دەکرێت و هەردوو وڵاتی کازاخستان و جامایکا بە نموونە دەهێنرێنەوە. هەر لەم بەشەدا باس لە گەلێک ڕەگەزی دیکەی دیموکراسی دەکرێت، لەوانە پێناسەکانی دیموکراسی.

بەشی دووەم ئەم ناونیشانەی هەیە: دیموکراسی لە مێژوودا، لەم بەشەدا بە درێژی باس لە چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئەم سیستمە سیاسییە دەکات و باس لەو گۆڕانکاریانە دەکات کە بەسەر ئەم چەمکەدا هاتووە و بەشێکی تا بڵێی دەوڵەمەندی کتێبەکەیە.

بەشی سێیەم ئەم ناونیشانە سەرنجڕاکێشەی هەیە: بەرپاکردن و لەناوبردنی دیموکراسی. نووسەری کتێبەکە لەم بەشەدا بە وردەکارییەکی زۆرەوە باس لە ئەزمونی دیموکراسی وڵاتی هندستان دەکات و دەیان زانیاری گرنگ و پڕ بایەخ لەسەر مەسەلەی دیموکراسی لەو وڵاتەدا دەخاتەڕوو کە دانیشتوانەکەی زیاد لە ملیارێک مرۆڤە.

بەشی چوارەم بریتییە لە: متمانە و بێمتمانەیی و بەشی پینجەم ئەم ناونیشانەی لەخۆگرتووە: یەکسانی و نایەکسانی. لەم بەشەدا باس لە پرسی دیموکراسی لە ئەفریقای باشوور دەکرێت و باس لەوە دەکرێت چۆن جادوو و جادووگەران لە ئەفریقای باشوور بوونەتە بەربەست لەبەردەم سەرهەڵدان و بەرپاکردنی دیموکراسی لەو کیشوەرەدا. بەشی شەشەم باس لە توانایی و سیاسەتی گشتی دەوڵەت دەکات. دانەری کتێبەکە لەم بەشەدا باس لە ئەزمونی دیموکراسی لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران، بە تایبەتی سەردەمی گۆرباچۆف و ڕووسیای ئێستادا دەکات.

بەشی حەوتەم ئەم ناونیشانەی هەیە: شێوازە ئەڵتەرناتیڤەکان و بەشی هەشتەم باس لە ڕابردووی دیموکراسی و ئایندەی دیموکراسی دەکات. بەشێوەیەکی گشتی کۆی بەشەکانی ئەم کتێبە، لە چەمکێکی گرنگ و بایەخداری جیهانی ئەمرۆی دەسەڵاتدارییی دەدوێت کە بریتییە لە چەمکی دیموکراسی. لەمرۆدا کەم دەسەڵات و هێز و فەرمانڕەوایەک هەیە، بە ئاشکرا دژایەتی خۆیان بۆ دیموکراسی ڕاگەیەنن. بەشی هەرە زۆری دەسەڵاتدارانی دونیای سیاسەتی ئەم سەردەمە، سەری زمان و بنی زمانیان بریتییە لە قسەکردن لەسەر دیموکراسی، بەڵام ئەو دەسەڵاتدارانە لە جەوهەردا بە دەیان فرسەخ لە دیموکراسییەوە دوورن و هەڵسوکەوت و بڕیار و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی وڵاتیان کردووە بە پردێک بۆ بەرژەوەندی خۆیان و بنەماڵە و کەسە نزیکەکانیان و دیموکراسیش تەنها وەک دروشمێکی بریقەداری بێ ناوەرۆک ماوەتەوە. لەم کتێبەوە تێدەگەین دیموکراسی قسە نییە و دەربڕینی سەر شاشەی کەناڵە ئاسمانییەکان نییە، بەڵکو دیموکراسی پێش ئەوەی قسە بێت،

هەڵسوکەوت و کاری پراکتیکییە و پێویستە لەسەر ئاستی کۆمەڵگا و پیادەکردنی دەسەلاتدا ڕەنگبداتەوە.

کتێبی دیموکراسی لەلایەن کاک "حەمە ڕشید"ەوە کراوە بە کوردی و کتێبێکی قەبارە گەورەیە، ژمارەی لاپەڕەکانی 454 لاپەڕەی مام ناوەندییە و تیراژی 500 دانەیە و نرخی 7000 دینارە.

### دوورگەی سەخالین

ئەم کتێبە بریتییە لە یاداشتەکانی چیرۆکنووسی ناوداری ڕووسی "ئەنتۆن چیخۆف". چیخۆف لە گەشتێکیدا بۆ ئەم دورگەیە، بۆ ماوەی سێ مانگ تێیدا دەمێنێتەوە، لەماوەی ئەم مانەوەیەیدا تەواوی ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانە تۆمار دەکات کە لەو گەشتەیدا و لەو دورگەیەدا، هەم بەسەر خۆیدا هاتووە و هەم بەسەر خەڵکانی دیکەی دورگەکەدا هاتووە و بە چاوی خۆی بینیویەتی. دورگەی سەخالین درێژییەکەی نزیکەی 970 کیلۆمەترە، پانییەکەی لە نێوان 26 بۆ 160 کیلۆمەترە و ڕووبەرەکەی دەگاتە نزیکەی 73 هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە. ئەم دورگەیە بە درەختی سنۆبەر بەناوبانگە، کەشوهەوایەکی ناڕێکوپێکی هەیە، خاکەکەی بۆ کشتوکاڵ دەست نادات، بەشی هەرە زۆری دانیشتوانەکەی بە کاری ڕاوەماسییەوە خەریکن و خواردنی ماسی گرنگترین خۆراکی



ئەم دورگەیەیە. سەرەڕای ماسی، ژمارەیەکی زۆری ئاژەڵ و گیانەوەری دیکەی هەمەجۆر لەم دورگەیەدا دەژین، ئا لێرەوەیە بەشێک لە دانیشتوانی ئەم دورگەیە، سەرقاڵی بازرگانیکردنن بە فەروی گیانەوەرانەوە. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە ڕووس و ژاپۆنیەکان، بۆ چەندین ساڵی دوور و درێژ ململانێیان بوو لەسەر ئەوەی کێیان خاوەنی ئەم دورگەیەیە. بەڵام ژاپۆنیەکان ساڵی 1875 دانی نا بەوەدا کە موڵکداری ئەم دورگەیە بۆ ڕووسەکان دەگەڕێتەوە. بەڵام ململانێکە تا ساڵی 1905 هەر بەردەوام بوو، لەو ساڵەدا ڕووسیا و ژاپۆن ڕازیبوون لەسەر ئەوەی دورگەکە دابەش بکەن، ڕووسەکان بەشی باکوری دورگەکەیان وەرگرت و ژاپۆنیەکانیش بەشی باشوری دورگەکەیان بەرکەوت.

چیخۆف لەم یاداشتانەدا بەسەرهاتێکی زۆری ئەو ڕۆژگارەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەمانباتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و ئاشنامان دەکات بە شێوە ژیانی دانیشتوانی ئەو دورگەیە. ئەم کتێبە لەلایەن "هێمن تاهیر"ەوە لە ڕووسییەوە کراوە بە کوردی. لە 383 لاپەڕەی قەبارە بچوک پێکهاتووە و تیراژی 600 دانەیە و نرخی 6 000 شەش هەزار دینارە.